# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە
ئەمیندارێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان
بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

ژمارە 15 ساڵی دووەم 1983




سەرنووسەر
محمد امین محمد احمد

جێگری سەرنووسەر
حسین عارف

دەستەی نووسەران
حسین رەشوانی
دکتور شکریە رسول
زبیر بلال اسماعیل
جلال مدحت خۆشناو
ناصر یوسف
فیصل مصطفى

سکرتێری نووسین
سەردار حمید میران

دەرهێنانی هونەری
محمد زادە

سەرپەرشتی چاپ
جعفر بەرزنجی


لەم ژمارەیەدا




ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان ـ گۆڤاری ، کاروان ، ـ ت : 20882

# تکای کارگێڕانی بۆ نووسەرانی

**برای نووسەری بەڕێزمان :**

بێگومان تۆ لە لای خۆتەوە گەلێکت بە لاوە مەبەستە کە ئەو بەرهەمەی دەینێریت بۆ «کاروان» و بڕیاری بڵاوکردنەوەی دەدرێ ، بە بێ هەڵەی چاپ و کەم و کووڕی و بە جوانی و ڕێك و پێکی بکەوێتە بەرچاوی خوێنەران . بەڵام ئێمەش لە لای خۆمانەوە ـ کە بە تەنگەوە هاتنمان لەم ڕووەوە ئەگەر لە تۆ زیاتر نەبێ هیچی کەمتر نی یە ـ دەمانەوێ بۆتی ئاشکرا بکەین کە نیوەی ڕاستی ئەو ئەرکە دەکەوێتەوە ئەستۆی شێوەی نووسینی بەرهەمەکەی خۆت لە ڕووی خەت خۆشی و ڕەوان نووسین و جوان و ئاشکرا نیشاندانی وشەکانی ، واتە بە باشی ڕەچاوکردنی ئەو داخوازی و ئامۆژگاری یانەی کە لە خوارەوە دەیانخەینە بەرچاوت . ئێمە نالێین لە ئاستی خەتی ناخۆش و نارەواندا هیچمان پێ نەکراوە و پێ ناکرێ .. نەخێر .. تا ئێستا زۆرمان تەقەلا لەم بارەیەوە داوە و گەلێکیش بە دەستی یەوە ماندوو بووین و بۆ زاڵ بوون بەسەریدا و بۆ لە چاپدانی ئەو بابەتە بەرهەمانە بە بێ هەڵە و کەم و کووڕی ، کۆششێکی بێ ئەندازەمان کردوە ، بەڵام قسەی خۆمان بێ هەرچەندمان کردو کۆشا ، نەمانتوانی بیگەیەنینە ڕادەی زاڵ بوونی سەد دەر سەد بەسەر ئەو گرفتەدا . سا هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەوەتا هاوار بۆ خۆتان دێنین و بە پەرۆشەوە و بە تکایەکی زۆرەوە داواتان لێدەکەین کە لەم بارەیەوە یاریدەمان بدەن ، تا بە هەردوولامان ـ ئێمەی کارگێڕانی گۆڤارەکە و ئێوەی نوسەرانی ـ کارێکی وەها بکەین بە بێ هەڵە و کەم و کووڕی لە ڕووی لە چاپدانی یەوە دەربچێ و ئێمەش و ئێوەش ئەو کەسەرەمان لە دڵدا نەمێنێ !.

**پێشەکی چەند ڕاستی یەك :**

با پێشەکی ئەم چەند ڕاستی یە بخەینە پێش چاوان :

1 — بەر لە هەموو شت لەوە بە ئاگا بە کە برای لە چاپدەر (منضد) عەرەبە و زمانە کوردی یەکە نازانێت و ئەو تەنیا نەقش دەکا . واتە لە شێوەی نووسینەکەتدا حیساب بۆ ئێمە مەکە کە چەندە خەتەکەشت ناخۆش بێ ، هەر دەتوانین بیخوێنینەوە ، بەڵکوو بۆ ئەوی بکە .

2 — خەت ناخۆشی شتێکی عەیبە نی یە و هیچیش لە بایەخی ناوەرۆکی نووسینی چاك کەم ناکاتەوە . بۆیە سپاردنی ئەو ناوەرۆکە چاکەی دووتوێی ئەو خەتە ناخۆشە بە برادەرێك یا دۆست و ناسیاوێکی خەت خۆش بۆ نووسینەوەی بە خەتە خۆشەکەی خۆی ، هەروەها هیچ عەیبەی تێدا نی یە .

3 — هەر بە هەمان دەستوور ، ئەوەیش هیچ عەیبەی تێدا نی یە کە نووسینی نووسەرێك بە ناوەرۆك چاك بێت و بەڵام بە

# «کاروان»

# بەرێز بۆ «کاروان»

زمان ( بەتایبەتی بە رێنووس ) کەمو کووڕی‌ی تێدا هەبێتو بیدا بە برادەرو دۆستو ناسیاوێك بۆ دەسکاری کردنی پێش ناردنی بۆ لای ئێمە .

4 — هەندێ نووسینی بە ناوەرۆك چاکمان بۆ دێ ، بەلام بمانبەخشن کە دەربارەیان دەڵێین : نەك عەزاب بە ناخۆشی‌ی خەتەکانیانەوە دەچێژین ، بەڵکوو وەك لەناو قوتابیاندا باوە .. ( شەرە پشیلەیەکە بۆخۆی ! ) . واتە دەسنووسی یەکەمن‌و بەبێ ڕوونووس کردنەوە بۆمانی دەنێرن . لەکاتێکدا لە پالیاندا نووسینی وەها جوان‌و پوختیشمان بۆ دێ کە حەز دەکەیت تەنانەت بەبێ خوێندنەوەش رایبفرێنیت بۆ چاپخانە .

5 — دواجار چاپخانەکەمان لەبن دەستمانەوە نی‌یە تا بتوانین مەسەلەی هەڵەی چاپ ، کە زۆربەی لە خەت‌ناخۆشی‌و نارەوانی‌یەوە دێت ، بە ئاسانی چارەسەر بکەین . بەینی ئێمەو چاپخانە نزیکەی (400) کیلۆمەتر رێگایەو . ئەوەش بۆ خۆی بۆتە تەگەرەیەکی گەورە لە بەردەمماندا .

### داخوازی‌و ئامۆژگاری‌یەکان :

تکایە .. تکایە .. تکایە :

1 — لەکاتی نووسیندا (ڕوونووسەکەت) دێر بپەڕێنە . بۆ ئەم مەبەستەش دیارە چاکتر وایە کاغەزی خەتداری قەبارەی فولسکاب بەکار بهێنیت .

2 — شاش بنووسەو وشەکان لە یەکتری جودا بکەرەوە ، واتە ماوەیەك بخەرە نێوانیانەوە .

3 — لەسەر یەك دیوی کاغەزەکە بنووسە .

4 — بەقەڵەمی پاندان (مەرەکەب) بنووسە نەك (جاف) .

5 — ناوی خۆت‌و باوك‌و باپیرت‌و ئەدرەسی تەواوت بنووسە . خۆ ئەگەر ویستت نووسینەکەت تەنیا بە نازناوێکەوە بڵاوبێتەوەو ناوەکەت ئاشکرا نەکرێ ، ئەوا هەقی خۆتەو لەم ڕووەوە تێبینی‌یەکمان بۆ بنووسە .

6 — تکایە لەوە ئاگاداربە کە نووسینەکەت بڵاوبکرێتەوە یا بڵاونەکرێتەوە ، تۆ هەقی داواکردنەوەی دەسنووسەکەبیت بەسەرمانەوە نی‌یە . ئەمە دەستوورێکەو هەموو گۆڤارو ڕۆژنامەکان لە سەرانسەری جیهاندا لەسەری دەڕۆن . هۆیەکەیشی ئەوەیە کە بەجێ‌هێنانی ئەو هەموو داوایانە دەبێتە ئەرکێکی لەتوانا بەدەر . لەبەر ئەوە هیچ نووسینێك مەنێرە تا وێنەیەکی لەلای خۆت گل نەدەیتەوە ..

7 — ئەو نووسینەی بۆ ئێمەی دەنێریت ، بۆ هیچ لایەکی تری مەنێرە تا ئەنجامەکەبیت لەلا ئاشکرا دەبێ . بەپێچەوانەشەوە ، ئەو نووسینەی بۆ لایەکی تری دەنێریت ، بۆ ئێمەی مەنێرە تا ئەنجامەکەبیت لەلا ئاشکرا دەبێ .

8 — لەبەر نەبوونی ئەرشیفێك هەتا ئێستا لەبەر دەستی کارگەرانی گۆڤارەکەدا کە بتوانن هانای بەرنە بەر لە حاڵەتی پێویستیدا ، گەلێك مەمنوونتان دەبین کە هەرچی‌یە

کتان لەوێنەو بەڵگەنامەو نەخشەو تابلۆی پەیوەندی‌دار بە نووسینەکانتانەوە بەردەست دەکەوێ‌و بۆتان پەیدا دەکرێ ، لەگەڵیاندا بۆمانی بنێرن . دیارە ئێمەش لەلای خۆمانەوە لەم رووە دریغی ناکەین‌و نەمان کردوە .

9 — ئەگەر بە ژمارەکانی پێشووی «کاروان» دا بچنەوە ، بە ئاشکرا بۆتان دەردەکەوێ کە بایەخێکی تایبەتیمان بە وەرگێران داوە . بەڵام تکامان وایە کە ئەو برادەرانەی روویان لە وەرگێران کردوە لەوە ئاگاداربن کە یەکەم : چاکتر وایە دەقە ئەسڵی‌یەکەمان لەگەڵ وەرگێرانەکەدا بۆ بنێرن‌و دووەم : ئەگەر ئەوەشیان بۆ نەکرا ، لەوە غافڵ نەبن کە بەروونی ئیشارەت بەسەر چاوەکەی بدەن‌و پشت‌گوێی نەخەن . چونکە پشت‌گوێ خستنی ناچارمان دەکا نووسینە وەرگێردراوەکەی پشت‌گوێ بخەین .

10 — سەرنجمان‌دا هەندێ لەو برادەرانەی شیعرو چیرۆك‌و نووسینمان بۆ دەنێرن ( بەتایبەتی لەنووسەرە لاوەکانمان ) ، پەنا دەبەنە بەر ئوسلووبی چاوە شەکردنمان . وەك سێ ـ چوار بابەتە نووسینمان بەیەك دەسخەت‌و بە سێ ـ چوار ناوەوە بۆدەنێرێ . ئێمە ناچارین بەو برادەرانە بڵێین : کاکی برا .. هیچ پێویستت بەو ئوسلووبە نی‌یە . ئازایانە چاکی لێ‌بکە بەلادا رووبەروو وەرە بەر مەیدان‌و ئەگەر بەتواناو بەهرەدار بیت هێز نی‌یە بتوانێ بەرت لێ‌بگرێ .

لێرەدا ناچارین ئەو عەیبەیەش ئاشکرا بکەین کە ( کوڕەو بە ناوی کچەوە بەرهەم دەنێرێ !! ) .

11 — لەو نووسینانەدا کە بۆمان دێن ئەم کەم‌و کووڕی‌یانە تیایاندا زۆر ماندوومان دەکەن‌و تکامان وایە نووسەرانمان ئەرکی چارەسەرکردنیانمان لەکۆڵ بکەنەوە .

أ ـ دانەنانی نوقتە لە شوێنی خۆیاندا لە سەرو ژێری پیتەکاندا . بۆ نموونە وشەی (بخۆ) لای ئێمەی کارگێران ئەگەرچی نوقتەکان لە شوێنی خۆشیاندا دانەنرابن ، بەڵام خوێندنەوەی لە لامان ئاسانە . لە کاتێکدا بۆ برای لەچاپدەری عەرەب‌زمان ئەگەر نوقتەکان راست لەشوێنی خۆیاندا نەبن ، وەها پەنجەی پێدا دەنێ : (نجو) . ئینجا لەوەش بەلاوە ... کە ئیشارەتی ٧ ەکەش نەخرابێتە سەر (واو) ەکەو وشەکە دەبێتە (نجو) .

ب ـ ئیشارەتی (٧) بۆ نووسینی کوردی بە پیتی عەرەبی بۆتە بنەمایەك‌و پشت‌گوێ خستنی لەلایەن هەر نووسەرێکەوە لە ئێستاداو بەتایبەتی لە بواری رۆژنامەگەری‌ی کوردیدا ، دەبێتە کەم‌و کووڕی‌یەك‌و دەبێ نووسەرانمان لێ‌ی بە ئاگابن . ئێمەی کارگەرانی «کاروان» وامان لێهاتوە کە دەبێ بەم دەست‌و بەو دەست ئیشارەتی (٧) بە دەم خوێندنەوەی نووسینەکانەوە ، بخەینە سەرو ژێری پیتەکانەوە . ئەمە گرفتێك‌و خراپ بەدەستی‌یەوە دەناڵێنین . بۆیە تکا لەنووسەرانمان دەکەین ، ئەرکی جیاکردنەوەی مانای چەندین وشەکە بە دانان‌و دانەنانی ئەو ئیشارەتە دەگۆڕدرێ ، نەخەنە ئەستۆی ئێمەو لەو عەزابەش رزگارمان بکەن ، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەدا کە تووشی سەراسیمەیی دەبین‌و ناتوانین سەری لێ‌دەربکەین کە ئاخۆ کام مانایان مەبەستە ! .

ج ـ گەلێ لە نووسەرانمان وەك تەنیا بۆ ئێمە بنووسن‌و بێ‌خەبەر بن لەوەی کە لەچاپدەرێکی عەرەب‌زمان لەنێوانماندایە ، کاتێ دەگەنە کۆتایی دێرو سەیر دەکەن وشەکە جێگەی نابێتەوە ، دێن نیوەی لەو کۆتایی دێرەدا دەنووسن‌و ئینجا داشێك ( ـ ) دادەنێن‌و نیوەکەی تری دەبەنە سەری دێرەکەی دوایی . بۆ نموونە وشەی (خوێندن) .. (خو) لە کۆتایی دێری سەرەوەداو ئینجا داش ( ـ ) و ئینجا لەسەرەتای دێری خوارتردا (ێندن) . بێگومان برای لەچاپدەری عەرەب‌زمان بەم جۆرەی لەچاپدەدا : (خو ـ ێندن) . خۆ ئێمە دەتوانین‌و ئەرکی سەرشانمانە نەیەڵین ئەمە رووبدا وەك کردوومانە ، بەڵام ئایا چاکتروانی‌یە برای نووسەر ئەم ئەرکە زیادە لەسکەمان نەخاتە سەرشان تا ئەو کۆششەی لەوەدا سەرفی دەکەین ئاراستەی لایەنێکی تری گۆڤارەکەی بکەین ؟! .

د ـ ئەوەی سەبارەت بە دانانی ئەو داشە وتمان ، بۆ جۆری نووسینی (واو) ی بەستنەوەی دوو رستەش بەیەکەوە ،ەمان بەزمەو بەڵام ئەمیان لەو حاڵەتەدا کە کاتێ (واو) ەکە ئەبری ئەوهی لە دوا وشەی دێرەکەدا دابنرێ ، لێ‌ی دابڕ دەکرێ‌و بەتەنیا فرێ دەدرێتە سەرەتای دێری دوایی ترەوە . لای برای لەچاپدەر دەستوور وەهایە کە ئەو (واو) ە دەچێتە

پاڵ وشەکەی پێشی یەوە نەك ئەوەی بە دوایدا دێ . بۆ نموونە : ئەگەر ڕستەی (منو تۆ) مان هەبوو ، دێرەکەش بە وشەی (من) کۆتایی هات ، دەبێ هەرچۆنێك بێ جێگەی (و) ەکەی لەگەڵدا بکەیتەوە ، چونکە ئەگەر بیبەیتە دێری خوارەوە ، وشەی (تۆ) دەبێ بە (وتۆ) . ئەمە تەنیا بۆ نموونە کە ڕەنگە خوێندنەوەی بەباری ئاسایی خۆیدا زەحمەت نەبێ ، بەلام لەزۆر حاڵەتدا مانا تەواو دەگۆڕێ .

هـ ـ ئـەرکێکی تـری زیـادە لەسـك کـە لەخـۆڕایی دەیکێشینو ماندوومان دەکاو دەبێتە هۆی ڕوودانی گەلێ هەڵەی چاپ ، لەشێوەی نـووسینی هەنـدێ لەپیتەکـاندایـە لەلایەن نووسەرانمانەوە کە خوێندنەوەیان بۆ ئێمە بە باری ڕاستیاندا وەك ئـاوخـواردنـەوە وایـەو بـەلام بـۆ بـرای لەچـاپـدەر بەپێچەوانەوە . لەوانە بۆ نموونە : ( پ ، چ ، ژ ، ڤ ، ق ، کا ، ن ) . چوار پیتی یەکەمیان لەبەر نەنووسینی سێ نوقتەیی یەکە بەڕوونیو جیانەکردنەوە لە ( ب ، ج ، ز ، ف ) . (ق ، ن) لەبەر نووساندنی چوکڵەیـەك بە کـوتایی پیتـەکەوە لەبـری نوقتـە کەلەلای ئەو دەبنە (قە ، نە) . (کا) لەبەر نووسینی لەشێوەی ( لا .. لام ئەلف لا ) دا لەلایەن هەندێ لە برادەرانەوە کە پێی ڕاهاتوون .

سەیر ئەوەیە زۆر جاریش ئەو چوکڵەیەی (ق ، ن) ەکە ، برای لەچاپدەرمان ناچاری دەیەها هەڵەیتر دەکـا ، ئەویش کاتێ کە دەبینێ پیتی (ە) ی لەبری (فتحە) ی عەرەبی ، لەگەڵ پیتەکانی تردا هەر لەو نـووسینەو یـا لە نووسینێکی تـردا ، بەهەمان دەستووری چوکڵەیی نووسراوە !! .

و ـ گـرفتێکی گەورەی تـرمان دیـاردەیەکی سـەیـرو سەرسوڕهێنەرە کە ئـەویش پەڕانـدنی تیپە یـا ناتـەواوی لە نووسینیدا لەلایەن گەلێ لە برا نووسەرەکانمانەوە . بەواتایەکی تر وەك چۆن ئێوە ( ئێمەش لەگـەڵتانـدا ) ، دادو بێدادتـانە لەدەست هەڵەی چاپ ، ئێمەش لەلای خۆمانەوە دادو بێدادمانە لەدەست هەڵەی (چاپی ! ) دەستو قەڵەمی ئێوە . بۆ نموونە بەسەدان وشـەمان بـەرچاو دەکـەوێ کە نـووسەرەکـانیان نووسیویانە : (کۆڕ) و مەبەست (گۆڕ) بووە . یا (کۆ) و مەبەست (کۆڕ) بووە . یا (کۆڕ) و مەبەست (کـوڕ) بووە . یـا (کوڕ) و مەبەست (کووڕ) بووە . یا (گووڕ) و مەبەست (گوڕ) بووە . یا (گور) و مەبەست (گوڕ) بووە .. هتد ! . ئەمە تەنیا لە سنووری ئەو سێ ـ چوار پیتەدا . ئینجا وەرە بدە بەدەمی یەوە بۆ هەموو پیتەکانو بزانە چ عەزابێك بەدەست ئەم حاڵەتەوە دەچێژین ! . بێگومان هیچ کەسێکیش لەو برا نووسەرە پیت پەڕێنـەرانە ، دوای بڵاوبوونەوەی نووسینەکەی لەو عەزابەمان بەئاگا نی یەو نایەت ، چونکە ئەو بە بـارە ڕاستەکـەدا وشەکـانی بەرچـاو دەکەونەوەو بـۆ هەتـا هەتـایە وایـدادەنێ کە خـۆی وەهای نووسیون ! .

ز ـ مەسەلەی خاڵبەندیو لەم بوارەدا دەڵێـین : دادو بێدادمان لەدەست پیت پەڕاندنەکە لەچاو ئەمیاندا تەنیا قەترە بەدەریایەکە ! . ئێمە کە سات بەسات لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا دەژینو بەدەستی یەوە زەلالەتمانەو وەك گەردەلوولێك لەگەڵ خۆیدا بەردەوام گێژمان دەدا ، ناچارینو بەپێویستی دەزانین ئەو ڕاستی یە بەزەقی بخەینە پێش چاوی نـووسەرانمـان کە نیسبەتێکی یەکجار کەمیان بە هوشیاری یەوە حیساب بۆ ئەم مەسەلەیە دەکەنو لەنووسینەکانیاندا بایەخی پێدەدەنو هەقی خۆی دەدەنێو ئیتر زۆربەی هەرە زۆریان ( لەگەڵیاندا گەلێ نـووسەری بـەناوبـانگو خـاوەن تاقیکـردنـەوەیـەکی زۆرو درێـژخایـەنو خاوەن چـەندین نـووسینو بـەرهـەم ) ، زۆر هەرەمەیی و بێبـایەخـانە مـامەلەی لەگـەڵدا دەکەنو هیـچ حسابێکی بۆ ناکەن ! . من زۆر جار لەم ڕووەوە ئەوەم (بەدەمی) بە نموونە هێناوەتەوە کە جارێکیان (420) نوقتەم لە نووسینێکی برادەرێکدا فرێداوە ، وەك ئەوەی نووسیبێتی : « منو .. تو .. چووین .. بۆ بازاڕ ... دوایی .. گەڕاینەوە .. بۆ .. ماڵەوە .. ! » (هیوادارم ئەو برادەرە لێم زویر نەبێ . بەتایبەتی کە دەبینم نووسینەکانی ئەم دوایی یەی لەو نوقتانە ڕزگاریان بووە ) .

نموونە هێنانەوە لەو نـووسینانـەی بۆ (کـاروان) دێنو بڕیاری بڵاوکردنەوە شیان دەدرێو بڵاویش دەبنەوەو ئـەگەر لەم بارەیەوە زۆر پەرپووت نەبن ، دەسکاری ناکرێنو ئەگەر زۆر پـەرپووتبن ، خـۆمان پێرا نـاگیـرێو دەسکـاری یـان دەکەین ، ئەمەش عەزابێکی گـەورەیترەو هـەروا لە خوتـو خۆڕایی دەینۆشـینو بۆ ئـەمیشیان بـرای نووسـەرمان لێ ی

بێئاگاو بێ خەبەرەو کە نووسینەکەی خۆی دەکەوێتەوە بەر چاو ، قەت‌وقەت بە بیریدا نایەت کە لە رووی خاڵبەندی‌یەوە ئەو هیچ هەڵەیەکی کردبێ‌و بۆی ڕاست کرابێتەوە ! .

ئێمە ناچارین ئەم مەسەلەی خاڵبەندی‌یەتان لەلا بکەینە مەسەلەیەکی گەلێ بایەخدارو بۆتانی بخەینە قالبی بانگەوازێکەوەو بڵێین : برایان .. تکایە .. خاڵبەندی شان بەشانی پیت‌و وشەو ڕستەو دەستەواژە مانا دەبەخشێ . [ وێرگول‌و نوقتەو دوو نوقتەو سێ نوقتەی تەنیشت یەکترو دوو نوقتەی سەرو خوارو کەوانەی بچووك‌و کەوانەی گەورەو نیشانەی پرسیارو نیشانەی سەرسامی‌و داشی بەیناو بەین‌و داشی چوونە سەری دێڕ بۆ گفت‌و گۆو چوونە سەری دێڕی ئاسایی ... هتد ] ، هەر یەکەیان مانای خۆی هەیەو دەبێ لەشوێنی خۆیدا دابنرێ‌و بەکار بهێنرێ . تکایە .. شان بە شانی داڕشتنی نووسینەکەت لەڕووی ڕێزمان‌و ڕێنووس‌و ڕەوانبێژی‌یەوە ، ئەو مەسەلەی خاڵبەندی‌یەش فەرامۆش مەکەو ئەرکەکەی مەخەرە ئەستۆی ئێمە ! . ئەرکەکە ڕاستەوخۆ ئەرکی سەرشانی خۆتەو دەبێ خۆت بەجێی بهێنیت ، دەنا ئێمە ئەگەر بەسەرێك دڵگوشران بەرامبەر بەو کەم‌وکووڕی‌یەو دڵسۆزی بۆ زمان‌و ئەدەبەکەو بۆ گۆڤارەکە نەبێ ، مەجبوری ئەو دەسکاری کردنە لەم لایەنەوە نین . ( لەوەش ئاگادار بن کە دەسکاری کردنەکەمان تا ئێستا ئەو نووسینانەی گرتۆتەوە کە لەم ڕووەوە بێتام هەڵەو چەوتی‌یان تێدابووە نەك هەموو نووسینێك ) .

**برایان :**

ئەوانەبوون داخوازی‌و ئامۆژگاری‌یەکانی ئێمە بۆ ئێوەی بەڕێز کە لامان وایە ڕەچاو کردنیان ، زەحمەتی‌یەکی زۆری بۆ ئێوە تێدا نی‌یەو بەلام زەحمەتی‌یەکی گەورە لەکوڵ ئێمە دەکاتەوە . جگە لەوەی کە هەم نووسینەکانی ئێوە پوختترو جوانترو بێ‌کەم‌وکووڕی‌و بێ هەڵەی چاپ بڵاو دەبنەوەو هەم گۆڤارەکەش لەم بوارەدا ، ڕوو لەوە دەکا ببێتە گۆڤارێکی نموونەیی‌و ببێتە مایەی شانازی بۆ هەموو لایەکمان . ئیتر سا ئێمەو ئێوەو ژمارەکانی داهاتووی «کاروان» ... با بزانین ! .

**«کاروان»**

# ئاگادارکردنێکی گرنگ

زۆر بەداخەوە ، لەم ماوەی دوایی‌یەدا بۆمان دەرکەوت کە چەند برایەکی شاعیرو نووسەرمان هەن لەناو ئەو بەرهەمانەدا کە بۆیان ناردووین ، تیایاندا هەبووە لەوەبەر لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە بێ ئەوەی ئیشارەتیان دابێ بەو بڵاوکردنەوەیەو بێ ئەوەی ئاگادارمان بکەن کە.حەز دەکەن جارێکی‌تر لە (کاروان)دا بڵاوببێتەوە ، ئێمەش بتوانین بڕیاری خۆمان بدەین کە ئاخۆ ئەو سەرلەنوێ بڵاوکردنەوەیەی پێویستە یان نا ؟ .

واتە ئێمە غافل کراین‌و چەند بەرهەمێکی لەوەبەر بڵاوکراوەمان سەرلەنوێ لە ژمارەکانی ئەم دوایی‌یەی «کاروان»دا بڵاوکردەوە .

جا ئێمە وا بەم ئاگادارکردنە ، خەوشی ئەو کردارە چەوتە دەخەینە ئەستۆی نووسەران خۆیان‌و تکایان لێدەکەین کە ڕێگەی ئەم شێوەی دووجارو سێ‌جار ، بڵاوکردنەوەیە بۆ بەرهەمەکانیان لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا نەگرنە بەر ، چونکە بۆ لەمەودوا ناچار دەبین هیچ بەرهەمێکی ئەو برایە بڵاونەکەینەوە کە ئەم جۆرە کردار ەمان لەگەڵدا دەنوێنێ .. بمان بەخشن .

**«کاروان»**

هەردەویل کاکەیی

سەر گوزەشتەو ژیانی شاعیرێکی نەناسراو

# موحەممەد کەساس

«موحەممەد کوڕی چۆبان کوڕی مەحمود کوڕی قەمبەر»ە لە هۆزی کاکەیی یە لەدەورو بەری ساڵی (1890)ی ز . دا لەگوندی زەنقر لە ناوچەی ناحیەی داقووق لەخێزانێکی ڕەنجدەر بۆ یەکەم جار چاوی هەڵهێناوەو هاتووەتە ڕووی جیهانەوە .

بەمنداڵی لەحوجرە لای زانای بە ناو بانگ مەلا «سەمەد پیر وەیس خوبیلە»ی کاکەیی لە شاری کەرکوك خوێندویەتی ، پلەی خوێندن و زانیاری بەرز بووە . لەنووسیندا خۆش نووس بووە ، هەر لە منداڵی یەوە ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدەب و نووسین و خوێندنەوەی شیعر پەیدا کردووە ، ئارەزووی لە نەخشە کێشانی نیگارو وێنەیش هەبووە ، جگە لە زمانەکەی خۆی عەرەبی و تورکی بەقسەو نووسین بەباش زانیوە ، هۆنراوەی هەمە جۆری بە کوردی بە شێوەی «ماچۆ = گۆران» هۆنیوەتەوە . ناز ناوی «کەساس»ی بۆ شیعر نووسین داناوە .

لە ساڵی 1911 یان 1912ی ز . دا «شوکریە» ی کچی زەینەڵ بەخشی دەخوازێ و دەبێتە هاوسەرو هاو ژیانی ، لەو ئافرەتە دوو کورو کچێکی دەبێ ئەوانیش «عەلی و وەلی و سەلیمە» ن . ئێستا ئەم کچ و دوو کوڕەی لەپارێزگای کەرکوك دادەنیشن کەساس پیاوێکی مەردو ژیرو بیر تیژو داناو چاو تێرو مێوان دۆست بووە . هەژاران و داماوانی خۆش ویستووەو بەپێی توانا یارمەتیانی داوە . شاعیر جگە لەنووسینی شیعر لەئیشی ئاسنگەریدا شارەزایی یەکی باشی هەبووە ، لە چەخماغچێتیدا واتە «تفەنگچێتی» بێ هاوتا بووە ، هەندێ کەس لەپیرە پیاوان و پیرە ژنانی هۆزەکەی وادەگێڕنەوە گوایە فرۆکەیەکی دروست کردووە پێی وتووە «فرفرە» . لە پاش تەواو بوونی ، سەیید خەلیل سەرەك هۆزی کاکەیی ئاوری تێ بەرداوە گوایە ئەگەر ڕژێمی گەندەڵی پاشایەتی بەو کارە بزانێ فەرمانی خنکاندنی دەدەن .

لە ساڵی 1925 ی ز ماڵی دەگوازێتەوە لە دێی ناو براوەوە بۆ شاری کەرکوك لە دائیرەی پۆستە «دائرة البرق والبريد» لە هەمان شار بە کرێکاری پۆستەچی دامەزراوە . لەپاش یەك دووساڵ لەشارە ئازیزەکەی و خاوخێزانەکەی دوور خراوەتەوەو فەرمانی گواستنەوەی (نەقلی) دەرچووە بۆ ناحیەی گوێر کەسەر بەشاری هەولێرە ، لەوێ بۆ ماوەی شەش مانگێك دەمێنێتەوە ، لە پاشان دەستی لەو کارە هەڵدەگرێ لە بەر ئەوەی نەیتوانی‌وە بەو مووچەیەی بۆی تەرخان کراوە ماڵ و منداڵەکەی بەخێو بکات ، بۆیە ناچار دەبێ بار بکات بۆ دێی عەلی سەرای لەوێ دەستگایەکی «ئاش» دروست دەکاو دەس دەکا بەکار کردن .

شاعیر ئازارو کوێرەوەری و دەس نەڕۆیی و ئاوارەیی فرەبینیوە ، زۆرداران باری دژواری سەخت و سامناکیان بەسەریان سەپاندووە ، بەڵام ئەو مەردانە بەرەنگاری ئەو هەموو کۆسپ و بەرهەڵستانە بووەو کۆڵی نەداوەو خۆی ڕاگرتووە ، ڕازی بووە بەژیانی خۆی . هەمیشە دژی ناپاکان و پیاوە دڕندەکانی ڕژێمی بۆگەنی پاشایەتی بووەو لە دژیان ڕاوەستاوەو شیعری دژیان هۆنیوەتەوەو هەرگیز ملکەچی بۆیان نەکردووە ، بۆیە لەسەرەتای ساڵی 1935ی ز دا بەدەس جەندرمە خوێن مژەکانی کۆنە پەرستان دەخرێتە کونجی بەندیخانەوە .

لە بەندیخانەدا تووشی گەلێ دەردە سەری و ئازارو ئەشکەنجە دەبێ تا تووشی نەخۆشی یەکی قورس دێ ، کۆنەپەرستان کاتێ دەزانن چارەسەری نەخۆشی یەکەی نی یە لەبەندیخانە بەرەللای دەکەن .

لە مانگی حوزەیران سالی 1935ی ز . دا سێ ڕۆژ لەپاش ئازاد بوونی لەزیندان هەر بەو نەخۆشی یە فەرمانی یەزدان بەجێ دەهێنێ و مال ئاوایی لەنەتەوەکەی و لەئەدەب و ئەدەب دۆستان دەکا . لە گۆڕستانی «حەواشەکان» لەگوندی عەلی سەرای نێژراوە بۆ هەتا هەتا سەری ناوەتەوە .

شاعیری نەمر مەلا خەلیل خدر مونەوەر کاکەیی سەردەمێك لە ئاوایی عەرەب کۆیی دأدەنیشت ، یەکێك بووە لەچینی چەوساوەکان و بەشاعیری چەوساوەیش دەدرێ لە قەلەم ، دانشتوانی گوندەکە دەستی یارمەتیان بەتەواوی بۆدرێژ نەکردووە ، ڕۆژێکیان دەیەوێ بارە ئاشێك بهاڕێ و بیکا بەئارد بۆنان بەلام کەسێك ولاخێکی پێ نادا تاکو بارەکەی بەرێ بۆ سەر «ئاش» . لەگوندی عەلی سەرای خاوەن ئاش و ئاشەوان خوالێخۆش بوو «موحەممەد چۆبان»ی شاعیرە ، میرزا خەلیل لەپارچە هۆنراوەیەکدا بەناوی «عەرەب کۆیی نام جاگەی سەرحەدەن» باسی چاو تێری و چالاکی موحەممەد چۆبانی نەمر دەکاو هێرش دەکاتە سەر خەلکی گوندەکەو هەموویان دەکاتە قوربانی ئەو ، هانا دەباتە لای دۆستێکی بە ناوی «عەلی خەمە» کەیەکێك بووە لە دانشتوانی دێی عەرەب کۆیی بۆ ئەوەی دانەوێلەکەی بەرێ بۆ موحەممەد بۆ هاڕین ، لەبڕبڕەی هۆنراوەکەدا وادەردەکەوێ خاوەن ئاش هەقی کرێی هاڕینی دانەوێلەکە وەرناگرێ .

ئەمیش چەند دێڕێکە لە هۆنراوەکەی :ـ

پارەم تەسلیم کەرد وەعەلەی خەمان
ئی جومعەی وەرین خۆش وەخت زەمان

عەلە ئەمرش کەرد دوو ڕۆ بۆ مۆلەت
مەهاڕیش پەرێت یەك شەو وەهەلمەت

من تۆم چەقەومان وەعێلان زانا
فریادو هانام وەلای تۆ کیانا

گشتش مەشانی وەچنگ سەپان
ببان وەفیدای «موحەممەد چۆبان»

من میرزا خەلیل شوعەرای زەمانم
ڕەحمەت خوان ڕۆح ئوستا چۆبانم

داخی گرانم تائێستا بەرهەمی ئەم هونەرمەندە ئاوارەیە کۆنەکراوەتەوە ، خوێندەواران و ڕووناك بیرانی گەلەکەمان بێ بەشن لە هۆنراوەکانی بۆیە ئەم ئەرکە پیرۆزەم خستە سەر ئەستۆی خۆم و کەوتمە تەقەلادان و کۆشش کردن بۆ ئەوەی بتوانم بەرهەم و سامانی ئەم شاعیرە لە مەرگ و نەمان ڕزگار بکەم ، تا ناوی ئەم سوارە چالاکە لە دەفتەری مێژووی پیاوە نەمرەکانی نەتەوەکەماندا بەشانازی یەوە تۆمار بکەم . فەرموون ئەمَیش چوار پارچەی هەمە جۆر لەهۆنراوەکانی کەساس .

– 1 –

**«ورم گرد عاسا»**

چە دەس کەساسی ورم گرد عاسا
پۆشام نەبەدەن بەرگ پەلاسا
وێم کەرد وەعەودال دێوانە ئاسا
دوور بیم چە دیدار دۆستان خاسا
وێم کەرد وەهامڕاز وەحشی نەسارا
نە ڕەنگ دۆس دیم نە سەلای یارا
غەیر نەئەزیەت و ئێش و نێش خارا
نەدیم هیچ کەسێ نەجای هەوارا
هەرمن ئاوارەێ دەس ئەغیارانم
هەرمن ڕەنجەڕۆ دوور چە یارانم
هەرمن کەساسی دەس بەدکارانم
هەرمن بێ کەمال گەدای شارانم
هەرمن هەژاری دەس زورداراَنم
هەرمن داماوی نام کۆهسارانم

هەرمن یەخسیری نام مەحبوسانم
هەرمن ئالاسکیای توی کلافانم
هەردو دەس منەن وەزەنجیرەوە
زاریو شینمەن چە توی بیرەوە
کەساس باوەس بو کەساسی تاکەی
پەی ئەغیار ئازار غەواسی تاکەی

- 2 -

**«قیبلەم بالاکەت»**

قیبلەم بالاکەت ..
وەختای دیم شەوکەت شیرین بالاکەت
بالا چون لاو لاو خوش خەرامەکەت
لال بیم تواسام پەی ناز عیشوەکەت
بەدیدەن دیدەت دەروون چەنی جەرگ
شەقار شەقار بی شیم وەشەرای مەرگ
گجیەکەی وەرت کالای فەرەنسی
سوغمەی رووی مەمان قوماش ئەتلەسی
نەچیر ئاسوغمە دوو سیر هاشارەن
یەکیوش بەیەن یەکیش هەنارەن
چەم بەوینەی ماه زولف ڕەیحانەی ڕەش
دەم نوقلو نەوات سین عەبیر بو وەش
گەردەن چون شویشە قامەت بەیداغەن
ئەگریجە چون سەول جەمین گول باغەن
کەساس ئەشعارت بێ تابو هازەن
مەنازە پەنەش دانەش مەجازەن

- 3 -

ئەم پارچە هونراوەی خوارەوەی هونیوەتەوە کاتێ لە گوندی عەلی سەرای دەستگایەکی ئاش دروست دەکا ، تێیدا داوا لە ئاشناو خزمو خێش دەکا بارە ئاشیان بولای ئەوبەرن بو هاڕتنی ئاردو شتیتر هەر وەها بەلێنیش دەداهەقی هاڕتنی ئارد لەهەژاران و یەتیمان وەرنەگرێ . « ..... »

ئاسیاوی ئاردم بێ عەیبەن پاکتاو
حازڕەن دوستان پەرێ بارەسیاو
مەطلەبم ئێدەن چە ئاشناو یاران
بارەسیاو پوشان وەلامان باران
پەیتان مەهاڕمێش ئارد ئێمە وردەن
هەنی وەشاران وەس بارتان گڕدەن
ساکن بەر کەساس کەم سەدا بکەر
یەتیم چە هەق ئارد یەکسەر مەعاف کەر
ئەگەر ئی کارە وەئەنجام باری
ئەڵلاو ئێوەڵلا نەگروی یاری

- 4 -

« .... »

هەرچە ڕوی ئەزەل تا وەڕوی ئارو
بەختم سیاو بی شکست ماوەرو
وێنەی درەخت بید بەختم بێ بەر بی
وەسیروان لوام بیلو کەمەر بی
هەر کەس بێ خەبەر چە حاڵ کەساسەن
بەیو گوش دەرو زانو چیم باسەن
گاهێ هیتیار بیم نە قاپی مالان
نەزانام ڕەنجم مەلو وەتالان
گاهێ موزارع وەڕەنجێ بێ سوود
ئاغایان دێ بەردشان پەرێ خوود
گاهێ جوشمدا کوورەی حەدادم
لوا وەعەبەس ڕەنج فەرهادم
گاهێ ماکینەی گوڕگوڕ ئاسیاوم
گاهێ چەغماغچی مەشهوورەن ناوم
گاهێ پەی مەعاش ڕوپیەو دیناران
بیم وەموەزع بەرید نەشاران
«والحاصل» حالمان وەجزتو فرەن
چە دەس گومڕاهان بەرگمان شڕەن
گروی ئینگلیزان عێراق فەرهوود کەرد

سەرووەت موڵکو ماڵ گشت پەی ویشان بەرد
رەئیس مەجلیسمان ئینگلیزەن سەرووەر
پەوکە حاڵ فەقیر یاوان وەختەر
پەی بەرژیای تورکان کەردمان زەماوەن
نەزانایم ئینگلیز بەتەر خەراوەن
تفو چە حوکم عوسمانیان تفو
تفو چە حوکم ئینگلیزان تفو
تف چە عەساکر گروی ئەغیاران
تفو چە رەگو ریشەی زۆرداران
هەر بەدەن پەی یار بی‌یەن وەزۆردار
هەر خاسەن وەدەس زۆردار گرفتار
هەرپیسەن پەی پاک بی‌یەن وەتێشە
هەر پاکەن چە دەس پیسان نەئێشە
کەساس مەواچە ئەشعار کەساسی
ئی‌کارە سەختەن کۆتا کەر باسی .

فەرهەنگۆکی هۆنراوەکان

| | |
|---|---|
| ئاسا : | وەك ، وێنەی |
| ئەغیار : | بێگانە ، دوژمن ، ناحەز |
| ئاسیاو : | ئاش |
| ئی : | ئەمە |
| بارەسیاو : | بارە ئاش |
| بید : | داری‌بی ، دارێکی بێ بەرە |
| بیل : | خۆڵ |
| بەیۆ : | بێت |
| بەتەر : | زیاتر |
| بەد : | خەراو ، دژی چاك |
| پەرێت : | بوت |
| پەلاس : | پۆشاکی زبر ، بەرگی پینە پینە |
| پاکتاو : | بێ گەرد |
| پەرێ : | بۆ |
| جەمین : | روومەت |
| چێر : | ژێر |
| چە = (جە) : | لە |
| زانۆ : | دەزانێ |
| هێتیار : | جوتیار |
| ویم : | خۆم |
| حەداد : | ئاسنگەر |
| تاب : | توانا |
| یار : | چاك ، دۆست |

کۆهساران = کۆکراوەی (کۆهسار) : شاخ ، کێو

| | |
|---|---|
| کالا : | کووتاڵ ، جلو بەرگ |
| کەمەر : | بەرد |
| گەدا : | سوئاڵکەر ، دەروازەکەر |
| کجی : | کراس |
| گاهێ : | جارێ |
| گۆش : | گوێ |
| ماوەرۆ : | دەهێنێ |
| مەلۆ : | دەڕوا |
| موزارع : | وەرزێر ، ڕەنجدەر |
| مەواچە : | مەڵێ |
| سەپان : | قەڵماسنگ ، ووشەیەکی تورکی‌یە |
| سەلا : | دەنگ ، بانگ دان |
| سەدا : | دەنگ ، هەراو هوریا |
| سیاو : | ڕەش |

عێلان = کۆکراوەی (عێل) : هۆز ، خێش ، خزم

| | |
|---|---|
| عاسا : | داردەس ، گاڕان |
| عەبەس : | فیڕۆ |
| غەواس : | ئەو لەبن ئاوی دەریا شت دەدۆزێتەوە وەك گەوهەر ، |
| | دوڕ ، لؤلؤ .. هتد |
| خاس : | باش ، چاك |
| خەرامە : | لەنجەولار ، نازو عیشوە |
| خوود : | خۆی |
| رۆ : | رۆژ |
| شکست : | کورتی ، ناتەواوی . |

وصفی حسن ردینی

# کارئینانا فولکلوری دناڤ هـوزانێت «مـزویـری» دا

بەرزترین گروڤە بو دیارکرنا چاکیا هوزانا نـوی‌و پەیڤ
رەسەنیا وێ بکارئینانا فولکلوری دناڤ هوازنێ دا ، هەروەسا
ژ مەربەبەندیت کو بزاڤا هوزانا هەڤچەرخ لسەر هاتیە دانان
پشتی جەنگا جیهانی‌یا دووێ ئەوە کو پی‌کـول بێتە کـرن دا
هـوزانا نـوی ببیتە هـوزانەکـا ئارمـانجبەرو خـزمەتـا چینا
رەحکێش‌و دوزا نەتەوەیی بکـەت پشتی گەلەك مـایە دنـاڤ
کوچك‌و دیوانێت بەگاو بیروقراطیاو برجوازیادا

خویایە ل جەم مە هەمیا کو فولکلوری میللەتی مە گەلەکێ
بەرفرەهەو بەلاڤە لەورا دی کورت ڤەبریں‌و دی بیژین [گەلەك
کیماسیە کو نەڤ فولکلورە ببیتە بەرزەکرن‌و دڤیت هەر ئێك ژ مە
ـ لایی خوڤە هیزی ب دەتی‌و ڤەژینیت ج ب ریکا بکارئینانا وی
دناڤ هوزانی‌دا یان چیروکا نوی‌دا یان کەڤالیت تەشکیلی‌دا یان
شـنویی‌دا یان ب ریکا بەلاڤکرن‌و نڤیسینیدا]

سەیدا عبدالرحمن مزویـری ژ میژە سـەر ڤی راستیێ
هەلبویە لەورا نەوی فولکلوری کریە بنیات‌و بنواشە بو دیواری
هوزانا خو

ب راستی هـوزانێت (مزویـری) ئـەو هـوزانن ئـەوێت
دگـونجن دگـەل وەرارو بـارودوخێ فیکـری‌و رامیـاری یێ
میللەتی ... ئەو هوزانن یێ دگەل پلا هزرکرنا ئەڤرو دگونجن
چونکی هوزانێت پێشکەڤتی‌خوازو ئارمانجبەرن ...

مزویری بخو ژی تورەڤانەکێ ب سەنگ‌و ل خو هوشیارە
نانکو گەلەکێ هوشیـارە ل وێ پەیڤێ ئـەوا دنڤیسیت چونکی
پەیڤ ژیانا وی یەو چەکێ وی یە دخەباتێداو هەتـا مزویـری
پشت‌راست‌و یـەقین نـەبیت ژ رستەکێ یـان ژێـدەرکی یـان
هوزانەکێ یان پەیڤەکێ بەلاڤ ناکەت چونکی ژ مەسئولیەتـا
داهێنانی (ئیبداعی) د ترسیت‌و نەڤێت ئەدەبەکێ بەیهودەیی
(عەبثی) بەلاڤبکەت . مزویری د هوزانێت خودا گەلەك بایەخێ
دەتە فولکلوری‌و ب ریکەکا هونەری بکار دئینیت یانکو نەڤێت
وەکی گەلەك تورەڤانا دەقا فولکلوری وەك تشتـەکێ غەریب‌و
بیانی ب کاربینیت دناڤ گوتاریت خودا یـان هوزانێت خـودا
یانژی ب کەتە دناڤ دوو (کڤانادا) مزویری دەمێ فولکلورێ ب
کار دئینیت دناڤ هوزانیت خودا ناچیت وی دەقا فـولکلورێ
بیخیتە دناڤبەرا دوو کڤانادا بەلکو ئەو وی دەقا فولکلورێ چ
گوتنێت مەزنا بن یان ستران‌و یاری‌و چیروك بن . دگەل هزرەکا
هەڤچەرخ‌و ڤەنج تێکەل دکەت‌و دکەتە هوزان‌و نیگارەکێ پاشی‌و
ژێ هاتی‌و دانیتە پیش چاڤ‌و ئەم دکارین بیژین مزویری دوو
کەوا ب یەرەکێ د کوژیت چنکو فولکلورێ د پاریزیت‌و تومـار
دکەت‌و ب کاردئینیت‌و هەر وەسا فولکلوری (تەحویر) دکەت‌و
روحێ د دەتێ‌و تێکـەل دکەت دگـەل مـەسـەلەکـا فیکـری‌و
روشنبیری .

د دیوانا خودا یا بەرکەڤتی «ژ ئەڤینا چرایێن کەڤن» یا
سـالا 1980 دەرچوی ، عبـدالرحمن مـزویـری شیـا ب ریکـا
فولکلوری چەند مەبەست‌و بیرهاتنێت دلێ خو ب کەتە هوزان‌و
داریژیت‌و ب کەتە کەڤال‌و بپاریزیت .

خویندەڤـانێ هێژا ... مـەژی لڤێ گوتـارێ هەولا دای
بەحسێ بکارئینانا فولکلورێ دناڤ هوزانێت مزویری‌دا بکەین ل
دویڤ تاو پشکێت فولکلوری‌و بڤی رەنگێ خوارێ :ـ

1 ـ ناڤداریت مە
2 ـ گوتنێت مەزنا
3 ـ یاری‌و گالتە

4 ـ ستران
5 ـ چیروك
6 ـ رەوشت

مزویری بێ گومان گەلەك خەمخۆرێ فۆلكلۆری‌یەو وان كەسێت جهەكێ بەرفرەهـو تایبەتی هەی دناڤ پەرێت فۆلكلۆریدا ئەڤە ژی خویا دبیت جاخێ ناڤێ وان ئینای دگەل هۆزانێت خو وەك [عیسێ دەلا ، میهرەبانا بەرواری ، كاوێس ئاغا ، دەرویشێ عەبدی ، خەجوكا سلیڤی ، مەم‌و زین ، خانێ لەپ زێرین ، فەرهادو شیرین] .

گوتنێت مەزنا بەشەكێ ب نرخ‌و گرنگە ژ بەشێت فۆلكلوری چونكی پڕە ژ ئاقل‌و بورا (تجارب) ئەڤە ژ لایەكی‌ڤەو ژ لایەكێ دی ڤە گوتنێت مەزنا گەلەك تێنە بكارئینـان ل سەر زمانێ هەمی كوردەكی د ژیانا رۆژانەدا لەورا پێتڤیە ل سەر مە هەمیا ئەم ڤان گوتنا ژبیر نەكەین‌و بێخینە بەر چاڤ .

بێ گومان گۆتنا مەزنا دهۆزانا كوردی‌دا ژمێژە یا هاتیە بكارئینان ، «خانیێ» مەزن‌و بەركەڤتی دبێژیت :ـ

هەر چەندە كەلام شوبهی دوڕ بیت
بێ قەدر دبیت دەما كو پڕ بیت

شێخ ئەحمەدێ جزیری ژی پشكداریا كری ب كارئینانا چەند گوتنەكێت مەزنا دناڤ شیعرا خۆدا ژ وان گۆتنا دیوار ب گوهن جاخێ دبێژیت :ـ

بەلكو دیوارێ ب گوهـێن ب خـودێ كەی ب خـودێ
ب تـو ڕەنگی نـەكـەی ئـاشـكـەرا ئـەسـرارێ حـدوث
زفنكی جـ 1 ب 160

هەر وەسا ژ بیرا مە نەچیت (نالبەندێ) ئەمر ژی ل سەر گۆتنا كەو دوژمنێ سەرێ خویە دبێژیت :ـ

كەو بخو هەر ژێك بەلاڤن
قەبقەبا بێ فایدەیە
ئەهلێ نێچیری ب چاڤن

زوو گەهشتن ئەصرەتێ
نالبەند خالد حسین جـ1

مزویری ژی وەك مروڤەكێ باش بهایێ گوتنێت مەزنـا بزانیت‌و باوەری ب راستیا وان هەی چەند گۆتنەك ژ گۆتنێت مەزنا تومار كرینە ، ژ وان گۆتنا
(دنیا د هژییت ... نا بژییت) و «بەفر ساریا خو ناهێلیت» دەمێ دبێژیت :ـ

لۆ خالۆ
دنیا د هژییت ، خراب نابیت
بەفر خاتوینەكا سارەو
لیڤە نابیت ب 46

دوو «هەر نشیڤیەكێ ئەڤرازیەكێ لبەر»و دبێژیت :ـ
راستە گەلۆ
هەمی كاروانێین دلێ من ..
سەرنشیڤ چوون
پشتا خودا سەرەكانیاو ..
بو وارەكێ كندو نزم ،
بێ نان‌و بێ پاشیڤ چوون
بلا بچن
دێ كیڤە چن ؟ !
گاڤا نشیڤی وان بڕی
دێ ئەڤراز بن
دێ بلندو سەرفەراز بن
لەورا گەلۆ
دخەما كاروانیان نینم
چونكی پشتی نشیڤیا ..
ستێرا ئەڤرازیا دبینم
ستێرا ئەڤرازیا دبینم ب 88

سێ «چوكا ئاڤ لێ چویی هەر دێ لێ چیت»و دبێژیت :ـ
ئەگەر ئەز شاهینەك بامەو ..
گۆتبانە من :

لۆ شاهینۆ
خەم کومکەرو ، خەم جەمینۆ
جما دەنگێ تە ناهێتن ؟ !
تاکێ کو تە ، دادایە سەر
نا بلندبیت و هژیێتن
دا بێژم ئەز
تەڤا بارانا دەنگێ من ،
چك نەبویەو ..
هەر دێ هێتن
ژ مێژە باپیرێ من گۆتی :
جوکا ئاف لێ چوی جارەکێ ،
دێ هەر لێ چیت و ..
دێ هەر لێ چیت و ..
دێ زێتن
ئەڤینا جاما دلێ مە مشت کری ،
ئەخار دبەو ..
ئەتێ رێتن ب 107

تەمبیرا فەقیێ تەیران ..
بۆ پزوکا
بۆ بیتانوك و کەڤوکا
چاك شارینم
وەکی خورتا
ئاڤا ڤی گوندی سەرئەڤراز ،
بو سەرەکانیێ زڤرینم
زەڤیکا ، ئادەکەم ، شەکەم
تەڤ دەرگەهێن دائیخستی ..
بو خاتوین تیرۆژکێ ،
ڤەکەم
ئەو لاندکا ئاف دایە من
ئەو دارا سێتاف دایە من
ئەو کانی یا ئاف دایە من
دارو بەرا
تێوەر نەکەم
تێوەر نەکەم ب 101

چوار « = دوو گۆتن دی ژ گوتنێت مەزنا «ئاڤا خورتا سەر ئەڤراز دچیت و ئەو کانیا تە ئاف ژێ ڤەخواری دارو بەرا تێ وەر نەکە» د هوزانەکا مزویری‌دا بیت هاتین جاخێ دبێژیت :ـ

ئەگەر ئەز دەروێشەك بامەو ..
گوتبانە من :
وەکی تەیرێ ،
مەست و سەرخۆشێ ئاف رەڤێ
هلو پلاڤێژە دەڤێ
دا بێژم ئەء
مەژی ڤەدا ئەو بەر پەرێ ،
قرش و کەڤێ
ئەزێ رابم
لاوکەکێ نوی ، ژ وەرا خوینم
کەزیێن (خەچوکا) سلیڤی ..
ژ دل ڤەهینم

هەر وەسا ئەڤ گوتنە ژی یا ب کارنیای «بەر ل جهێ خو یێ ب قەدرە» دەمێ دبێژیت :ـ

خۆزی ئەز بارانەك بامە ..
ژبۆ شویشتنا ،
ژەنگ و قرێژا گوندێ مە
خۆزی ئەز سنگەبەر بامە ..
ژبۆ کوژتنا ،
شەڤا درێژا گوندێ مە
خۆزی ئەز بازنەك بامە ..
ژبۆ دەستێ وێ ستی یا ،
ژ دل شرین بێژا گوندێ مە
خوزی ئەز سنگەبەر بامە ..
دناف کەلەکا ،
شەنگە پرێزا گوندێ مە
بەر ل جهێ خو یێ بسەنگە
بەر ل جهێ خو یێ بقەدرە ب 17

مزویریێ زاناو پێشکەڤتیخواز پشتی باش ل بارودوخێ ڤی وەلاتی گەهشتیو شیانا ڤی میللەتی زانی ئەڤجا وەك روشنبیرەکێ شورشگێر ب رێکا بکارئینانا گوتنەکا مەزنا بومە هزرەکا گەلەکا مەزنو بەرکەڤتی دبێژیت مەزنێت مە یا گوتی «چ دکەنە کارێ ئەو تێتە خوارێ» مزویری ب شێوازەکێ مەڤچەرخو سپەهی ئەڤ گوتنە بو مەسەلەکا ئازادی .. خوازیێو پاشە ڕوژێ ب کارئینانە دەمێ دبێژیت :ـ

خۆهـو لڤینو وەرارێ
باوەریەکا موکم وەکی ،
قورمێ دارێ
بکەنە کوارێ
دا مزگینیا ڕوژەکا نوی ..
بێتە خوارێ ب16

یاریو حەنەكو گالتە نە هاتینە ژ بیرکرن ژ هزرا مزویری چنکو مزویری بخو مروڤەکێ یاریکەرەو سوحبەت چییە هەر چەندە مروف وێ هزرێ ژێ ناکەت [بیست] ئێکە ژ یا رییت فۆلکلۆریو میللیە گەلەکا بەلاڤە ل کوردستانێ ... هەر شولەکا دناڤبەرا هندەك ه.ڤا ئالۆز دبیت دێ بیستێ خوینن «ژمارە ئێك هەتا ژمارە بیست دێ خوێنن کا ژمارە بیست دێ گەهیتە کێ ئەو دێ ب وی کاری رابیت» ...

مزویریێ هۆزانڤان بەحسێ (بیستێ) دکەتو دبێژیت :ـ

جوان کەڤوکا
جارەکێ کۆتە چەقوکا
بو وە شەرمو فهێتییە
هەمیکاڤا ،
بیستا وە لسەر مە ،
کەتییە ب32

ژ سترانێت فۆلکلۆری دوو سترانا جهێ خویێ کری دناڤ هێلێت هۆزانا مزویریدا ئەو سترانا لۆ خالۆیەو سترانا شێخ مەحمودێ ئەمر . هەردوو ژی بێت سترانبێژی ئەمرن کاوێس ئاغا .

سترانا ئێکێ سترانا لۆ خالۆیە یانکو سەرهاتیا قەهەرەمانێ کورد (عەلیێ ئەمر) خارزاییێ [هەمزێ پەلەڤان] شێری دەشتا پورسینێ ل کوردستانا تورکی ئەوێ کو دزیندانادا هاتیە کوشتن :ـ

لۆ خالۆ
بەندا رۆمیا بەندەکا گرانە خالۆ
هات لەشکەرێ شەپولا ڕەش ..
وەکی بەلگێن دارانە خالۆ
ئەڤرو لبێدەرا خواستو هێڤیێن ..
خانێ لەپ زێرین
تالانە خالۆ
شووڕە لەوندیێن کەڤوکا بڕین ،
نەکە ترانە خالۆ
گورزێن مە بو پەنجێن تارییێ ..
فندو چرانە خالۆ
کێ گوتییە مە بەرێن سەنگەرا
خارینە خالو ب 49

کا چاوا تولا عەلیێ خارزا بەیهودە نەچوو هاتە ڤەکرن ل سەر دەستێ خالێ وی (هەمزی پەلەڤان) دەمێ مەلا عەلیێ بابلی کوشتی ...
کا چاوا ئەڤە چێ بۆ هەر وەسا مزویری ژی هیڤیا د سینگێ مەدا نا کوژێتو مزگێنییێ د دەت ب خوشییو سەرفەرازییێو سەربەستییێ :ـ

لۆ خالۆ
عەوڕینمە ، درەوا ناکەن
دێ باران هێن
بهار ژ زومێن مە بارناکەن
دێ کانی زێن
دێ بیتە بارباڕا کارا
هەی هەیا خورتو سیارا
دەنگێ ستزانو خۆشیو ..

سەر نقارا
دێ گەهیتە
هەمی خیڤەتێن کوچەراو ..
هەمی وارا   ب51

سترانا دووێ سترانا (شێخ مەحمودێ نەمرە) دەمێ شەڕ گەرم بووی دناڤبەرا وی‌و دوژمنا ژ ئینگلیزیو هێزێت مەلەکی ل دەڤەرا سولیمانێیو د دەلیڤەکێرا شێخ مەحمود بریندار دبیتو دچیتە بن بەرەکی ئەڤجا ژبەر ڤێ قەنجیا بەری دگەل قارەمانەکێ کورد کری گوتنێ بەردێ قارەمان مزویری ئەڤ (بەرە) ژ بیر نەکریەو ناڤێ وی دناڤ بەر پەرێت هۆزانێت خۆدا نفیسیو تومارکر ئەڤە ژی بۆ رێزگرتنو بها وی‌و نەبیرکرنا وی د دیروکا مەدا لەوا دبێژیت :ـ

کێ گوتیە خەونێن دولبەرا
سوتینە خالو
مە ژڤان
بەردێ قارەمانە خالۆ
مە ژڤان
بەردێ قارەمانە خالۆ   ب51

سەبارەت ب چیروکێت فۆلکلۆرێ ڤە کریارەك یا هەی د گەلەك چیرۆکێت فۆلکلۆرێدا د هێتن ئەو ژی ئەڤەیە ...

دەمێ هندەك جەحیل وەك کورێ قازی یان کورێ مفتی یان کورێ حاکمی یان کورێ هەژارەکی سەرا کچەکا جوان لێك دکەڤنو ب شەڕ دچن دوزا وان دێ ڤێ رێکێ هێتە چارەسەرکرن .. کچك دێ رابیت سێڤەکێ هەلگریتو دێ هاڤێژیتە سینگێ وی لاوی یان وی تولازی یێ دلێ وی ڤیاییو پێ خوشیێبووی ، بڤێ رێکێ د چیرۆکێت فۆلکلۆریدا دوزا ڤان مرۆڤا دهێتە چارەسەرکرن .

مزویری ب رەنگەکێ جوانتر ئەڤا هە یا ب کارئینای دەمێ وەلاتێ خۆ دانایە بەر چاڤێت خۆ وەك جانەکا بەژن بلندو تەرو ژێ هاتیو خو دبینیت مروڤەکێ بەلنگازو هەژار چ د دەستا نینە کو بکەتە خەلاتو پێشکێشی بەژنا وێ ڤێزی بکەت لەورا دبینیت جانترین تشت ئەوە کو دلێ خو بکەتە سێڤە صورەکا بەرواریاو هاڤێژیت ل سینگێ وێ بدەت دا بڤی ریبازێ جوان ئەڤینا خو بو دیار بکەت وەکی دبێژیت :ـ

وەلات
نە من گەنجو خزینەنە ..
ئەڤرو ژ بەژنا ،
تەرا بدەم
نە من پەلکەزێرینەنە ..
هنداڤ سەرێ ،
تە ئەز ڤەدەم
نە من ستران‌و لاوژەنە ..
لتە ڤەشێرم یان نەدەم
وەلاتێ من
من چ هەیە ؟!
ئەڤە دلێ من سێڤەکا بەرواریانە ..
دێ هاڤێژم
لسنگێ تە دەم
لسنگێ تە دەم   ب 58

ژ رەوشتێت چڤاکێ کوردیێیە دەمێ باران دوەستیێنو ئەهێن دەخلو دانو داروبار زهاو هشك دبن بچویكو زاروك دێ رابن شەقلەکێ بلند ئینن‌و دێ وێنێ (نیگارێ) بویکەکێ ب سەرێ ڤە چێکەن ب پاتەو بەندەکا ڤە گریدەن ، کراسیو فیستانا کەنە بەرو دێ لناڤ گولانا گەرنو بەردەرێت مالاو سترانەکا هەی زاروك بخو دبێژینو ڤەدگێرن سەرێ وێ ئەڤەیە :ـ

[بویکا مە باران دڤێ باران دڤێ
هو بویکێ ،
دەخلەکێ ئەرزان دڤێ ئەرزان دڤێ
هو زارێ ، ... هتد]

هۆزانڤانێ مە عبدالرحمن مزویری ب شێوەکێ جوان‌و هەژی ئەڤ سترانا هە د هۆزانا خودا ب کارئینای ، دایك یا دانایە شوینا بویکێو دایك نوینەریا وەلاتی دکەتو بچویك لڤێرە

کورێت وێ دایکێ‌نه کورێت وه‌لاتی‌نه . ...

دەمێ ئەڤ زاروکێت هه بەرێ خۆ د دەنه دایکا خۆ هناڤێت وێ بێت هشك‌و زوهابین ژ تێنادا خولکێ خو یێ ئێخستی‌و دلێ وی بیه دەریا ئێشاو کۆچکێ پەل‌و بریناو ژانا ... بوهارا وێ یا بیه زفستان بەنك‌و پرچ‌و بسکێت خو یێت وەراندی ..

پسیارێ ژ دایکا خو دکەن ؟ ! ...
دادێ دادێ
پسیار دکەین
ژ تەرا ئەم گوفتار دکەین
تە چ دڤێ ؟ !
لە زێ بکە
بدە دەستێ مە بەرسڤێ ب 22

پشتی پسیارا وان دایکا وا ب دەنگەکێ دامایی‌و غەمگین ڤە ب دلەکێ تژی کوڤان‌و برین ڤە ب دوو چاڤێت تژی گری‌ڤە بەرسڤا زاروکێت خۆ ددەت‌و دبێژیت :ـ

هو لاوێن من
دل‌و مێلاک‌و چاڤێن من
ناڤەشێرم
دەیکا هەوە ، ئەڤینداره
.. برینداره
دەرمان دڤێ
باران دڤێ
بن ئاخکرنا ماران دڤێ
ڤەمرینا عەمرێ چەوت‌و ..
خواران دڤێ
ژ دل رەڤین‌و شکەستنا ،
شەڤ‌و قەیدو هەوران دڤێ
وێ (لاوك)و (حەیران) دڤێ
کرنژینا یاران دڤێ
باران دڤێ
باران دڤێ ب23

پشتی وان بچویکا ئەڤ بەرسڤە گولێ دبیت مزویری خو دکەتە کورەکێ پسپوری ژ وان بچویکاو دبێژیتە دایکا خو ب ئاوازەکێ شورشگێرانە :ـ

دادێ دادێ
پەیمان بیتن جارەکا دی
خولی‌یا کوچکێن ڤەمری ..
بکەمە ئاگر
هەسپێ منە ،
بیرو باوڕ
سنگێ خۆ ، بۆ هەژارو پەپۆکان ..
دانم چادر
د رێکا تەدا
د رێکا سەرکەڤتنا تەدا
خۆ بکەم موم ،
بکەم کاڤڕ
خۆ ڤەنەدەم
رێکا کاروانی بەرنەدەم
هەسپ‌و کەعێلێن شکاکا ..
ل گوولا وانی ئاڤ‌بدەم
نە ، نەرووێنم
زێری‌یا ژ ئاڤێ برەڤینم
بو دایکا خۆ ، جارەکا دی
تەڤین بارانێ ئەز بینم
ئەزێ بینم ب26

بڤێ چەندێ ئەم هاتینە دویماهیا ڤێ نڤیسینێ هەرچەندە نە یا ڤالایە ژکێم‌وکاسا چونکی ب راستی مزویری هۆزانڤانەکی بەرکەڤتیەو ئێکە ژ هەلگرێت ئالایێ شێعرا ئارمانجبەر ل دەڤەرا بەهدینا ب تایبەتی‌و مزویری شاعیرەکێ گەل‌پەرێسەو تورەڤانەکێ پسپۆڕو سەرکەڤتیە هیڤی دکەم ئەز شیا بم ماڤێ نڤیسینێ دەمێ .

---

تێبینی

ئەڤ نڤیسینە ل کورەکێ ناڤخویی یێ ئێکەتیا نڤیسەڤانێت کورد تایێ دهوکێ هاتە خواندن

# قارەمان

# لە چیرۆکی نوێی کوردیداو لە چیرۆکەکانی حسین عارف دا بە نموونە

● عبدالرزاق بیمار ●

## پێشەکی

بەڕاستی جێگەی شادمانییە کە کۆڕێکی ئاوەها بۆ چیرۆکی تازە لاوی کوردی بگیرێتو برایانی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەرانی کورد داوا بفەرموون باسێك بنووسمو بیخوێنمەوە . دەمێکە ئارەزووم دەکرد لە بارەی هونەری چیرۆکنووسیی حسێن عارفەوە لێکۆڵینەوەیەکی بەسەروبەر پێشکێش بکەم ، بەلام لەبەر دەست نەپەرژانو زەحمەتیی کۆکردنەوەی ئەوکەرەستە زۆرانەی دەبن بە بناغەی هەستانی باسو لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرە ، ئەمە جگە لە هەراویو پانو پۆڕیی مەیدانی لێکۆڵینەوەکەو بەهۆی کەم دەستەلاتیم لە زۆر لایەنی زانستیو تیوری هونەری کە پەیوەندیان بە بیناسازیی چیرۆکی نوێی ئەمڕۆی جیهانەوە هەیە ناچار لەکورتی بڕیمەوەو هاتم مەسەلەیەك لەمەسەلەکانی هونەری چیرۆکنووسی لای ئەم نووسەرە باسبکەم کە دەمێکە سەرنجی راکێشاومو لە سەرەتاوە ڕەگەلی کەوتووم ، دوورو نزیك پەیوەندیم بە خۆیو بەخێوەکەیەوە هەیە ئەویش مەسەلەی قارەمانو هەلبژاردنو پێشکێش کردنی قارەمانەو پێشان دانی ئەو قۆناغانەیە کە لە کاروانی گۆڕاندا بڕیویەتیو دواڕۆژ بەرەو کوێ مل دەنێت . بەلای منەوە قارەمان شادەماری چیرۆکەو هەموو کاکلی بیرو ڕاو فەلسەفەی نووسەر لە دەوری هەلبژاردنو جۆری پێشکێش کردنی قارەماندا دەگەڕێت ، جا هەلسەنگاندنو پێشان دانی ڕووو تخووبو دیوەکانی قارەمان بۆیان هەیە کەلێنێکی باش لە لێکۆڵینەوەی هونەری چیرۆکنووسی پڕ بکەنەوەو عوزرخوازی چمکێکی نەهاتنەدیی ئاواتو خواستەکەم بن .

کاك حسێنیش که دەست پێشکەریی لێکۆڵینەوەومێژوو نووسینی ئەدەبی چیرۆکی کردووەو دوور نییە یەکەم کەس بێت که ووتاری بۆمێژووی چیرۆکنووسیی کوردی له عیراق تەرخان کردبێت ، جگه له کۆمەڵە ووتارێکی رەخنەگرانەش ، سالی 1977 کتێبێکی بەنرخیشی دەرکرد بە ناوی ( چیرۆکی هونەری کوردی لەنێـوان 1925 — 1960 دا ) ، بـه زمـانـی عـەرەبـیـیش لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژی بەناوی ریالزمی رەخنەگرانه له چیرۆکی کوردیـدا بلاوکـردەوه . له مانـەدا باسی زۆر کـەسی کردووه باسی خۆی نەبێت . منیش لەو باوەڕەدام دەوری دیاری « حسـێن عـارف » وەکـو چیـرۆکنـووسێکی لێهـاتـوو و هونەرمەندێکی بەهرەدارو رەخنەگرێکی بە بزاوت لەمەیدانی چیرۆکی کوردیدا نیشانەیەکی بەرزه بە ئەدەبی کوردییەوه ، نەك ئەمڕۆ لەدوارۆژیشدا مێژوو نووسی ئـەدەب ناتـوانێت له بیری بکات .

ئیتر لەبەر ئەم هۆیانە هەڵبژاردنی ئـەم بابـەتە لەلایـەکەوه ، هەڵبژاردنی چیـرۆکەکـانی کاك « حسێنیش » بـۆ هەڵچنینی بابەتەکە لەلایەکی ترەوە جێی خۆی گرت .

**یەکەم : قارەمانی ریالزمی سەرەتا**

وابزانم یەکەم چیرۆکی بلاوکراوەی « حسـێن عارف » چیرۆکی ( چایشیرین ) ه کە سالی 1958 یاداشتی یەکەمی گۆفاری (شەفەق) ی وەرگرتو له سالی 1957 دا نووسراوه که به راستی بەهۆی وێنه کێشانی رەنگینی ژیبی خێـزانیکی خومالیو پەیوەندی سروشتیانەی نێوان تاکو تەراکانی تویژالیك له گروی ئیشکەرو رەنجبـەرانی کۆمـەڵی « شار نشـیـن » ی کوردەواریو راوێژێکی سەنگو دەمودوویکی رەوانو گورجو گۆڵو دارشتنێکی سفتو بێکەلێنو روح سووکی ی کەسانی چیرۆکەکە پایەی شیاوی خۆی لەو دەورەدا وەرگرتو لام وایی تائێستاش نموونەیەکە لەنموونە بەرزەکانی چیرۆکی ریالزمی کوردیی پێش تەمووز .

هەر لەو مێژووەشدا کۆمەڵێ چیرۆکی پێکەوەنا ، بەتەمابوو له بەرگێکدا به چاپیان بگەیەنێو ناوی ( مندالانی شارەکەم ) ی لێناولە سەر بەرگی دوایی کۆمەڵەی ( لە کۆری خەباتا ) نیازی چاپکردنی بەم زووانەی راگەیاند . هەروا له بیرمه سالی 1961 که داوای چیرۆکێکم لێکرد تا لە گۆفاری (هیوا) بلاوی بکەینەوه ، کۆمەڵە چیرۆکەکەی دامێ ، بەبێنێك لام مایەوه ، یەك دوانێکم لێ بـلاوکردەوه ، یـەکێکیـان دوژمنـەکـەی مـام قیتـەڵ بـوو له (هیـوا) و نامـەی دلداریکی ترسنـۆك بوو له (رونـاهی) ، شایانی باسیشه کۆمەڵە چیرۆکی ( کلافەیەك ژانی توورە ) ش جگە له چای شیرین دوو چیرۆکی ئەو دەورەی بەخۆوە گرتووه .

لەم مێژووەوه (1957) تاسالی 1970 بەلای منەوە قۆناغی یەکەمی کاروانی هونـەری چیرۆك نـووس جێگیر دەبێت ، بـایەخێکی گـەورەی هەیـە بۆ تێگـەیشتنی چیرۆكو ژیـانی هـونـەریی چیـرۆکنـووس . لەگـەل ئـەوەشـدا کـه بـەردی بنـاغـەیـه بەرهەمەکەشی وەکو هەمـوو بەرهـەمەکـانی قۆنـاغەکـانیتر شایانی لێدوانو باسکردنن . رێکەوتێکی نایابە که سـەرەتاو بنەتای ئەم دەورە لەم لێکۆڵینەوەیەماندا دوو نموونەن که به گەشاوەترین نموونەی چیرۆکی کوردی دەژمێردرێن بـەپێی کاتو سەردەمەکە ، سەرەتا چیرۆکی (چای شیرین) کۆتاییش چیرۆکی (بەسەرهاتێك) .

کـاك حسین خـۆی له کتێبەکـەیدا[4] خـەوشی هونـەری تەکنیکی چیرۆکی سالانی پێش تەمووزی بەوە دیارکردووه کە له شیوەی ریبورتاج نووسراونو لەدەربریندا روکەشنو نووسەران پەنایان بردووەتە بەر ریکەوتو قەزاو قـەدەر . ئنجا کـەلەکە کردنی هەر چی دەردو نـازارو چەرمـەسەری هـەیە بـەسەر کەسانی چیروکەکانیاندا کەنەگەر چیروکەکـانی ئەم دەورە جگە لە هەلوەدەر کـردنی چەنـد بەرهـەمیکی مونـاسەبـه کردوو ، ئەو گەرو مەید بە نگریی دەبینین ئازادەیەکی چاك له خـەوش رزگاریـان دەبیت بەتـایبـەتی چـای شیـریـەکـه نموونەیەکی گەشی ریالزمی وینەگرانەو سروشتییە چـونکه رادەی پتسوو گەرمیی لاویو تاو هەلقولینی بەهرەو سەرەتای خوکردنی . دروشمی رەسەنیو رەوانی خویان پیوە دیارە

بەلام ئەو چوار پێنج چیروکەی پاش شورشی تەمووزی 1958 له نامیلکەی ( لە کوری خەباتا ) سالی 1959 بلاو کراونەتەوە ، بە هوی جوری بابەتەکانیان کە هـەولی گرتنـە خوی رووداویکی گـرنگی وەکو شـورشی تـەمـووزە ، ئـەو رووداوەی کـەنـەك نووسەران بەلکو خـەلکی دەرەوەو ناوەوەی سـەرسامکـردو شیـرازەی زور شتی لەگەبـرد ، هیـچ لە تـوانـادانییـە بـەو

پەلەپڕۆزێیە نووسەرێکی لاو بتوانێ تێکەڵ بەقووڵایی زاتی خۆی بکاتو بەبێ هەزم کردنێکی هێمنو سروشتیانە بیان نوێنێ . بەرهەمی دوو نووسەری ناوداری ئەوسەردەمەش لەم بابەتەوە بەڵگەی قسەکەن ، کەوا مصطفی صالح کریم ( زرەی زنجیر ـ 1958 ) و محرم محمد امین ( ڕێگای ئازادی ـ 1958 ) بڵاو کردەوە کە نووسەرانو رەخنەگران گشتیان لەو باوەڕەدان کە نرخێکی هونەریی ئەوتۆ جیاکەرەوەیان نییەو[5] هیچیان بەسەر چیرۆکەکانی تەموزیی حسین عارفەوە نییە .

چیرۆکەکانی ئەم قۆناغە جۆرە قارەمانێکی واقیعی پێشکێش دەکەن کە لە ئاوو هەوایەکی خۆماڵیدا دەژینو تابلۆی لەنووسەر نزیکنو زادەی تەجرەبەو تێڕوانینێکی پێشکەوتووانەن . قارەمانی ئیجابی ژیانو بە چاویلکەی ساوایی ڕووناکەوە دەڕواننە ژیان . ئەگەر خۆی نەبن ، نموونەی خوێنو تارماییەکەی نووسەر لەدوا پەردەی ئەوانەوە هاتوچۆ دەکات ، زۆر جار لە یەك دەکەون تا وێنەو سێبەرەکەی لەگەڵ یەکدا جووت دەبنو جارجار لەنزیکەوە بۆ یەکتر دەڕوانن بەبێ ئەوەی زۆر لەیەك دوور بکەونەوە .

ئافتاوی (چای شیرین) و مندالە (دوژمنەکەی مام قیتەڵ) و سمەی ناو مندالانی دراوسێی (میمکە هوڵی) . مامەی قوشمەی ئاژاوەچیو گشت قارەمانانی کۆمەلە چیروکی ( مندالانی شارەکەم ) گشتیان مندالی بزێوو چەتوونو بێباکی یەکەیان بەلای لاسارییەکی پاکنیهادییەوەیەو هەمیشە لەجوولانەوەو بزووتنەوەدان . هەروەکو ئاوێنەیەکی مندالکاری قسە لەڕوون . بێپێچو پەنانو ئازان قینیان لەمەیینو وەستانو ترسو پەککەوتەییەو کردەوەکانیان ئاگردانی گیانی شۆرشگێریی دواروژە

« ئافتاو » چا لە کورەکە تاڵ دەکات کاتێ کە چای شیرین ڕەت دەکاتەوەو لچی لێ هەڵدەقورتێنێو شۆڕشی لەڕوودا بەرپادەکاتو نووسەر گوتەنی کوڕە ( لەدەست ئەم چەتیوە دەعەجانییە )[6] وکردەوە مندالانەکەی بە دادە دادە .
مندالە چەتوونەکەی دوژمنی مام قیتەڵ ، شەرم لەسمێڵی قیتو دیمەنی قیتو قۆزی مام قیتەڵ ناکاتو ڕاستی دەخاتە بەردەم ، کاتێك کە دەیەوێ نەهێڵێ لەگەڕەکەکەی ئەودا حەلوا فرۆشی بکات ، ڕاستییەکەش زۆر بێ توێکڵو ڕەپو ڕاستو بەنالەیە :

( جا تو هەقت چییە ؟ تۆ بڕۆ مجەووری خۆت بکە )

( خۆتاپۆت نەکردووە .. ئەرز ئەرزی خوایەو لێی دائەنیشم )[7]
شێوەی ڕوح سووکیی چیرۆك گێڕانەوەو گورجو گۆڵیو بزێویی کەسەکانو جوولانەوەی بەردەوامیان ووتەی شیرینو دەربڕینی کۆمیدیو نوکتەپەردازیی نووسەر ، جگە لە وێنەکێشانی واقیعی ئەم کەسانە وەکوگوتم بۆیان هەیە بڵێین هۆی سەرکەوتنی نووسەر لەکارەکەیدا نزیکییەتی لێیان ، یان بۆچی نابێ هەر یەکە بەجۆرێك دەنگدانەوەی ڕووداوێك یان بینینێك یان بەسەرهاتێکی ژیانی مندالیو لاویی خۆیبن ؟ بەتایبەتی لە تەمەنێکدا بوو کە لەلایەنی ڕاستگۆییەوە نەیدەتوانی لەمانە زیاتر دەست بۆکەسانو نموونەی تری ژیان بەرێتو قارەمانانیان لێدروست بکات .. چونکە وەکو بلێی خۆی ئەم مندالە بزێوە یاخییە بوو کە هەتا لاویشی هەر بەگیانی ڕۆشنی مندالیی مامەلەی لەگەڵ ژیان دەکرد ؟
نووسەر لەتەمەنێکی زوودا حەپسیو دوورکەوتنەوەی دی . لەگەڵ سیاسەتکارانو ڕۆشنبیران ژیا . فێری عەرەبی خوێندنەوەبوو . هەر زووش دەستی دایە قەڵەم . ئەوسا نووسەران کەمو مەیدان چۆل بوو ، ووتاری دەنووسی ، هەڵبەستی دەهۆندەوە شیعری کوردی دەکردە عەرەبی ، لێکۆڵینەوەی دەنووسی سەرباری کارو کردەوەی نهێنیو ئاشکرای سیاسەت نیتر لەوەکە بوی هەیە خۆی لە ڕادەی خۆی بەزلتر ببینێت لەم ... ویژو بەشیوەی ئەم جۆرە پیاوانە بەرهەمی ... شۆڕشی تەموور لە چوارچێوەی کتێبی (لەکوری خەباتا) ... پێشکێش دەکات

لەم کۆمەلەیەدا خاڵێك سەرنجی ڕاکێشاوم کەلە چیروکی ( زۆری بەدەمەوە ماوە ) دا[8] تووشی بووم ، ئەویش ئەوەیە کەقارەمان لالە یەکێك دەکاتەوە کەبەر لەشۆڕش بەشداری تێکۆشانی نەدەکردو هەرگیز لەو بڕوایەدانەبوو قەلای سەختی پاشایەتی بڕووخێت . جا پاش شۆڕش ولەکاتی خۆپێشاندانێکی

گەورەو لە ئاهەنگی سەرکەوتن‌دا دەستی دەگریت‌و بی‌ئەوەی لۆمەی بکات ، دێ هانی سەرلەنوێ خەبات کردنی دەدات .. بۆ قارەمانی چیرۆکی ئەو رۆژگارە ئەوەندە زۆرە کەلەگەرمەی هەڵچوون‌و سەرگەرمی‌ی سەرکەوتندا ئەوە بزانێت کە شۆڕش زۆری بەبەرەوەماوەو لەسەرە ڕێ‌دایە .. وە نییە بڵێ هەموو شتێك براوەتەوەو خەتی راست‌و چەپ بەسەر ئەم جۆرە کەسانەدا بێنێ . بەڕاستی هەڵوێستێکە شایانە بەچاکە تۆماربکرێت .

لە چوارچێوەی شێوەی تەکنیکی چیرۆکەکانی ئەم قۆناغەدا نووسەر چیرۆکێکی رەنگینی بەهات‌و هاوارو رێکوپێك دەنووسێت بەناوی (بەسەرهاتێك)[9] و بۆ نووسینی مێژووی ساڵی 1963 ی داناوە ، کە قارەمان‌و کەسەکانی نموونەی واقیعێکی بەجووڵەو مرۆڤانەی گەرموگوڕن .

چیرۆکەکە ئەگەرچی شێوەی گێڕانەوەی تێدا بەکارهاتووەو بریتی‌یە لە چەند رووداوێك بەلام هەرگیز خەوشی چیرۆکەکانی بابەتی حیکایەت‌خوانی‌راپۆرت دەربڕی تێدانییە ، کە رەخنەگران خەوشی ئەم جۆرە چیرۆکانە بەوە پوختە دەکەن کەوا : « یەکێك لەدانیشتنێك یان لەکۆڕێکدا دەست‌دەکا بەگێڕانەوەی قەوماوێك ، بۆتامی قسەو شیرینی‌ی زمان ناکاوی‌و گری کردنەوە بۆدوادوای چیرۆکەکە هەڵدەگریت‌و چەند وێنەو رووداوێك بەیەکەوە گری‌دەدا .. زوربەی‌جار داوەکەی پسوکەو کشتەکی وەعز دادان لەبەینی دەنکی وێنەو رووداوەکان‌دا بە زەقی خۆی دەنوێنی ..[10]

لەکورتە شیکردنەوەیەکی چیرۆکەکە ئەمەمان بۆ دەردەکەوێ ؛ سەرەتا نووسەر دیمەنی خۆهەڵکوتان‌و پەلەفڕکێ‌و کێشمەکێشی کۆمەڵێك پێشان‌دا بۆچوونە ناودواپاسی بەرەو سلێمانی رۆیشتوو .. لەناو حەشامەتەکەدا کوێرێك ، پیرەژنێك ، شەل‌و پیرو ژن‌و ژاڵ‌و کەسانی دی بەخۆیان‌و کۆڵەکانیانەوە هەڵپەی پاس دەستگیرکردنیانە تالەم رۆژە رەشەی شەڕدا ئەوگەنمەی کڕیویانە بۆخێزانەکانیان ببەنەوە . لێرەدا وەکو هەموو هونەرمەندێکی راست‌بێژو بەجەرگ ، نووسەر ببڕای ببڕ لەعاتیفەی ساوێلکەو سۆزی رووکەش نزیك نابێتەوە ، ئەمەتا لەم رۆژگارەو لەکەمەی ئەو ڕووداوەدا کەس گوێ بەباری پەککەوتەیی مەلایەکی کوێر نادات‌و ووشەو رستەووشەی « خواناسی ، پیاوچاکی ، سیلەی‌رەحم »[11] لەو کاتەدا ناخوێندرێتەوە ، بابە خۆی‌و بارەگەنمەکەیەوە لەودرەنگ وەختەدا لەبەکرەجۆدا بەجێ‌بمینێ ! خەتای کێ‌یە ؟ .

ژنێکی گەنج لە پیرەژنێك رادەپەڕێ کاتێك کە پیرەژن (خەتا) لەخانەی باری کۆمەڵ‌و دەروونی مەردمی رۆژگاری شەڕدا دانانێت‌و بەم‌جۆرە وەلامی دەداتەوە :

( میمکە بۆخەتای سیلەی‌رەحم ئەگریت ؟ خەتای ئەوانە بگرە کە وەهامان لێ‌دەکەن )[12] .

پیرەژن مرۆڤێکە وەکو هەموو مرۆڤانی تری پەروەردەی دەستی میثالیات‌و سەرمەستی رەوشتی سوارچاکێتی‌ی جاران ، خاوەن زاتی خۆیەتی‌و دەڵێ :

« تۆمن فێر مەکە » « لەشەڕ گەڕێ .. من باسم لەخۆمانە »[13] بەلام ژنە گەنجەکە کەنیشانەی نەوەی دوای‌ئەوە زیاترلە واقیعی ئەوسەردەمەوە نزیکترەو دەزانێ لەم‌دنیایەداو لەکاتی تەقینەوەی مەسەلەی نەتەوەیەکدا کەداوای ژیانی سەربەستی‌و نان‌و شارستانەتی دەکات ئەگەر ئەوەی باوو باپیران نەیاندیبێت‌و ئەمڕۆ ببیینن ئەمە ماناو نیشانەی ئاخر زەمان نییە .. چاك دەزانێ ، بۆیە دەڵێ :

« ئەوەی لەمەوبەر ڕووی نەداوە ، وائێستا روودەدات »[14] .

مەلای‌کوێریش وەکو مرۆڤێکی رەنجبەری تێکۆشەر دەست بە زامەگەورە بەئێشەکەی خۆیەوە دەگرێت ، وەکو هەموو خەڵکی ناوشان‌چاڵ‌و گێپەڕەی مل‌ئەستوورو چاوساغ بۆژینی خۆی‌و خێزانی‌خۆی تێ‌دەکۆشێت‌و دەگاتە بەکرەجۆ تارپەیەك گەنم لەم‌لاو لەولا دەست‌بخات‌و پاسی بەرناکەوێ پێ‌ی بگەڕێتەوەو شەولە مزگەوت دەخەوێ . لەمزگەوتیشدا زۆرباش دەمی توورەکەی گەنمەکەی دادەخات‌و دەی‌ئاخنێتە ژێر کڵاوو جامانەکەیەوە ، لە دڵی خۆیدا دەڵێ ( ئادەمیزاد زاڵمە .. نەوەکو یەکێك شەیتان بچێتە بن کڵێژەیەوەو زەفەری پێ‌بەرێ ) کەئەم قسەیەش دەکات هەر خۆی‌دەزانێ چ برینێکی گەورەی وابەدڵەوەیە ، بەڵێ‌خەڵکەکەی تریش « پیرەژن‌و شەلەو پیرەمێردو هەڤاڵەکانی بریندارن بەلام کاتێك پەرۆ لەسەر برینەکەی خۆی هەڵ‌دەداتەوەو چیرۆکەکەی خۆی دەگێڕێتەوە دیمەنی ئەوەندە ساکارو راستگۆیانەوووردو خۆماڵیانە پێشان‌دەدات کەمن چەندجار لەخوێندنەوەیدا قوڕگم بەیەکەوە نووساوەو بەزۆر فرمێسکم لەهەڵوەرین گیرکردووە .

برایەکی لەو دێوچیاو لەرەش‌بگیرو شالاوی درندانەی

ـوژێکی ڕەش‌دا ، بـراگەورەکـەشی دەکـوژرێت‌و بـەخـۆی‌و قورئانەکەیەوە کەبەپڕ شالاو هێنەرەکـانەوە چـووە بەرزەبـر کەوتووەو دەلاقەیەك کەوتووەتە سەری . کـوێریکی بـریندار مەیتی براگەورەو پشت‌وپەنای لەباوەش‌نـاوە ، بەم‌شـەوەش کـەس‌نییـە مـردوو ببـاتــەمـزگـەوتێ ، ئیتـر دیمـەنی ژنی کـوست‌کـەوتـوو ، منـدالی هـەتیـومـاوەو بـرینی کـوێـریکی بێ‌دەسەلات‌و دیمەنی مال‌و کۆلان‌و مزگەوت‌و خەستەخـانەو

... چاکترین دەستکردی ئەو کاتەمێژووییانەن کە بەسەر ئەم شارەدا هاتوون‌و شایانی تومـارکردنن . ئیتـر واکوێـرە خۆی گەورەی مالەو بەخێوکەری دووبەرە هەتیوەو هـاتووە لەژێـر سێبەری سونگی‌و کلاوئاسن‌دا ڕبەگەنمێك پەیدادەکات‌و نانیان بۆدەباتەوە ، شەو لەمزگەوت دەخەوێ‌و چاوەڕوانی بەیانی‌یە کەبالی‌سپی بەسەر ژیانی شاردا بلاوبکاتەوە .

ئەوەی لەم قۆناغەی سـەرەتایـەدا لەو بابـەتە پـوختە دەکـرێت ئەوەیـە کـەقـارەمـانی چیـرۆك بـەگشتی لەشـارو گەرەکەکانی شاردا هەلبژێر دراون‌و ڕەنگوڕووی شارنشینی‌و هەلسوکەوتیان لەژێر پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتی‌یەکانی ناوشاردا دیارە . ئەمەش بەنیسبـەت هەلبـژاردنی قارەمـانی چیرۆکی کوردی هەنگاوێکي بەرەوپێش چووەو مانای ئەوە دەگەیەنێ کە چیرۆکنووسان جلەوی هەلبژادرن‌و سەودا کردنیان لەبـارەی بـابەت‌و کـەسانی چیـرۆکەکـانیانـەوە بەدەست خـۆبـووەو بەسەریدا زال‌بوون . جاران وەکوشتێکی سادەی چاولێکەری زوربەی مەیدانی ڕووداوو قارەمـان‌و کەسـانی چیرۆکـەکان لادێ‌و لادێیەکان بوون .

ئـەم قارەمـانە شـاری‌یـەش کـەزادەی قـۆنـاغی مێـژوویی شارستانەتی‌ی نەتەوەی کوردە قارەمانێکی بزێووو بەجوولەیەو پێ‌ی لەسەر زەمینەی تـەقینەوەی شـۆڕشی دوارۆژ داناوە ، ئەگەر خۆشیان لەشۆڕش‌دا نەبن بەلام کەرەستەی پەیدابوونی شـۆڕشگێڕەکـەی لەمەودوان . ئـەمـەش لەکـارو کـردەوەی یـاخی‌یانـەیان‌و لەدادپـرسی‌و هەق‌خـوازی‌ی بیرکـردنـەوەو ووتەکانیان‌دا دەردەکەوێ .. گیان‌پاکی‌و گیانی مندالێتی‌یـان ڕەنـگدانـەوەی ئـەو سـەردەمـەیـە کـەپـەیـوەنـدی‌یـە کۆمەلایەتی‌یەکـانی ناوشـار لەدەوری شێوە دەرەبـەگی‌یەوە بەرەو برجوازی چوون‌و تازەرەگیان دادەکوتاو دەهات لەهەموو کەلین‌و قوژبنەکانی ژیانی گەل‌دا خۆیان بنوێنن .

## دووەم : ریالزم‌و هونەری شێوەو ڕوخسار

قۆناغی دووەمی هونەری چیرۆکی « حسین عـارف » لەسالی 1970 وە دەست پێ‌دەکات ، دیارە ئاگاداری ئەوە بوون کەمن لە دابەش‌کردنی قۆناغەکان‌دا ـ بەش‌بە حالی بابەتەکەی خۆم کە هەلبژاردنی کەسان‌و قارەمانانی چیرۆکە ـ وەسەرجەم هونەری چیـرۆکي گـوێم نـەداوە بـەدابـەش‌کـردن بـەپێ‌ی سـالانی پەنجاکان‌و شەستەکان‌و حەفتاکان . چونکە لەو بڕوایەدام کە ئەوهەل‌و مەرجانەی بۆ قـۆناغ بـڕین‌و پێشکەوتنی چیـرۆکی عەرەبی لەعیراق هەلکەوتووە مەرج‌نییە بۆ چیرۆکی کوردییش هەر هەمان ـ هەل‌و مەرج‌و هەمان مەیدان بووبن ، بێ‌گومان هەموومان باری نەتەوایەتی‌و دەسەلاتی بەکارهێنـانی مافـە سـروشتیـەکـانی کـورد وەکـو هـەمـوو مـرۆڤی سـەردەم لەرۆشنبیری‌و شارستانەتی‌دا دەزانین‌و ئاگـادارین تا چـەند بـووەو لەچ حالەتێکـدا بـووە .. چـۆن دەرگـاو پـەنجـەرەو کلاورۆژنەمان لێ‌گیراوەو لە ڕووناکی‌ی زانست‌و ڕووناکبیری‌ی جیهـان بێ‌بەش بـووین .. گەلێکی نـەخـوێنـدەوارو چـەنـد خوێندەوارێکی کەم و خوێندن بەزمانی نەتەوەییان لێ‌حـەرام کـراو ، نەبـوونی ڕۆژنامـەو کۆڕو تـاقم‌و حزب‌و دەزگـاکانی هۆشیاری‌و ڕووناکبیری‌ی نیشتمانی ، پێ‌شێل کردنی هەستی خۆبەکورد زانین‌و دەربـڕینی ئەم هـەستەو هـەولی ناسـین‌و تێگـەیشتن‌و وێنەکێشـان‌و پال پێـوەنانی واقیعی نـەتەوەکـە لەلایەن نووسەرانەوە . ئەدیبەکانمان لەوپایە ڕۆشنبیری‌یەدا نەبوون کە لەسەر بناغەیـەکی نەتـەوەیی پتەوو لەئـەنجامی تێکەلاوی‌یەکی هۆشیارانە بەرۆشنبیریی نوێ‌ی هـاوچەرخ‌دا بینای تازەبابەتی ئەدەب کەچیرۆکە دابمـەزرێنن .. تەنـانەت ئەگەر هەولیشیان‌بدایەو بیان‌ویستایە ، من‌لەو باوەڕەدا بووم کـە خوێنـدەواری چیرۆك کـڕمان دەست نـەدەکەوتن ، واتـا جەماوەری خوێندەواران پێ‌نەگەیشتبـوو . پاشـان جگە لەوە کەچیرۆك هونەرێکی تازە بابەتە ئەگەر لە چوارچێوەی هەموو ئەدەبی کوردی‌یەوە سەیری بکەین هەمیسان سەیردەکەین کە قۆناغ بـڕینی ئەدەبـەکە بـەلای‌کەمـەوە لەسەر مـاوەپێدانی بلاوکردنەوەو بەگوڕکەوتنی بزووتنەوەی چاپەمەنی وەستاوە .. ئەگەر ئەم‌ماوەیەش بۆشیعر هەبـووبێت ئەوا بـۆ چیرۆك زۆر

كەمتر بووە .. تەنانەت حزبەكانیش ئەوەندە لایان لەچیرۆك نەدەكردەوەو دەیان ڕوانی كە وەكو شیعر بەكەڵكی كۆڕی تێكۆشان نایەت .

دوای بەیانی 11 ی ئاداری 1970 كەدەرگا لەڕۆشنبیریو ئەدەبی كوردی كرایەوەو باری سیاسی نەتەوە گۆڕاو پاش سالانی قاتیو نەهاتی دەوری هێمنایی‌و هات باڵی بەسەر نیشتماندا كێشا .. هەوری خوێناوی‌ی كۆنەپەرستیو دوژمنایەتی ماف نەتەوەییو پێشكەوتن ڕەوی‌یەوەو ئاگری چاپەمەنی گەشایەوەو ڕۆژگاری زبرو تفتو تاڵ ، بەندیخانەو دەربەدەری‌و ژێر باڵی تۆقاندن‌و برسی بوون .. پەرژینی پۆڵابەندیان لەدەوری مێشك‌و دڵی نووسەران لاكەوت . لەهەموو لایەنێكدا باری نەتەوایەتی كورد گۆڕاو بەرەوپێشكەوتن ملی‌نا .. لەلایەنی چینایەتیشەوە دەركەوتێكی ئێجگار گرنگ هاتەكایەوە ، كەلەكاتی هێور بوونەوەی ئاسمانی ئاڵۆزی لایەنە نەتەوەییەكەوە ، ڕووناكی زیاتر كەوتەسەر پەیوەندی‌یە چینایەتی‌یەكانی كۆمەڵی كورد كەوا پەیوەندی‌یە بۆرجوازی‌یەكان زیاتر پێگەیشتن‌و ناكۆكی‌یە درەكان توندوتیژتربوون .. ئاواتو هەوڵی بەجێ‌هێنانی شێوە ئیشتراكی‌یەكانیش لەبەرهەم‌هێنانی لادێو شاردا زیاتربوو .. كاروباری ئیسلاحی‌زراعی‌و ژیانی‌كرێكاران‌و جووڵانەوەی ئافرەتان‌و لاوان ، كۆمەڵەی جوتیاران‌و چەند دیاردەیەكی ئەوئاوات‌و هەوڵانەن .

بەلام ئەم دەرگاڵ‌بوونەوەی پاش‌ئاداره بەسەرگیان‌و دڵی‌بریندارى نووسەرانەوە پێ‌ی‌نا ، ڕابردوویەكی ڕەش‌و تاڵی لەدوا خۆیدا بەجێ‌هێشت كەتارماییەكەی لەسەر گەلێكیان بەزۆركەوت‌و قووڵاییەكانی هەژاندن‌و تەجرەبەیەكی زۆری‌بۆ ڕەخساندن ، جۆری تێڕوانینی ئەوانی بۆهەندێ ڕووداوو دەركەوتنی ناو كۆمەڵ گۆڕی . سالانی شەڕو قاتی‌و نەهاتی شوێن پێ‌ی خراپی خۆیان لەسەر ئاوێنەی دەروونی توێژە بەهەستەكانی كۆمەڵی كوردەواری بەجێ‌هێشت‌و لەقووڵییەوە كۆمی ڕەووشت‌و نەریتی كۆمەڵ شڵەقا ، پەیوەندی تری كۆمەلایەتی پێگەیشتن .

بەكورتی « گۆڕین » لەكۆمەڵ‌و لەنووسەرو لەئەدەبەكەدا پەیدابوو ، كۆمەڵ كۆمەڵی سالانی پێش تەمووز نەما ، نووسەر ئاسۆی فیكرو ڕۆشنبیری‌ی فراوانتر بوو . مەودای خوێندنەوەو بلاوكردنەوەی زیاتربوو ، جۆری خوێندنەوەكەشی واتا چەشنی ڕۆشنبیری‌یەكەشی وەكو جاران نەما ، گۆنا گۆن‌و هەمەجۆر بوو ، خۆیشی بوو بەخاوەن تەجرەبەی زۆر تفت‌وتاڵی ژیان .. ئەدەبەكەش تەنیا بەئاوێنەی ڕووداوە گشتی‌و گەورەكان نەمایەوە . لەزەویی ئەم گۆڕینانەدا تۆوی نوێ‌كردنەوە ڕەگی‌خۆی داكوتا ، هەموو زەمینەیەك بۆیەوە خۆش‌بوو كەداری ئەدەبی كوردی بە هەموو پەلوپۆكانی‌یەوە ( چیرۆك ، هەڵبەست ، لێكۆڵینەوەو ڕەخنە ... تاد ) گەشە بكات‌و پتەوترو گەورەتر بێت‌و بەردەوام سەوزوبە بەرزگ‌و بار بێت .

ئەو ڕەخنەیەی لە شەپۆلی نوێ‌كردنەوەی سروشتیانەی پاش ئاداردەگیرێ ئەوەیە كەلەئەنجامی چاوكردنەدەرەوەو خواستنەوەی بۆتەو قالبی بیانی‌و كاریگەریی ڕێبازو ڕێژگەی ڕۆژاواییدا ڕوخسارو شێوە بایەخیان زیاتر وەرگرت‌و سەرلی‌شێوان‌و ئاڵۆزی‌یەكی زۆر كەوتە ناوەرۆك‌و جۆری پێشكێش‌كردنی بەخوێندەواران ، شەپۆلەكە شێوە شۆڕشێكی ڕومانتیكیانەی وەرگرت‌و تەڕاشی دەكردبەئاش بەبێ هیچ پێویستی‌یەك ، دەنا ڕەنج‌و تەقەلای نوێخوازی‌ی یەكێكی‌وەكو « حسین عارف » لەمەیدانی چیرۆكدا هەرگیز بیرناكرێت‌و بێ‌گومان دەورێكی كاریگەرو بەتەووژمی هەبوو لەشەپۆلەكەدا .

حسین لەو قۆناغەدا زۆر بەزاتانە پەیكەری تەكنیكی چیرۆكی‌گۆڕی‌و پشتی كردە شێوە نووسینی جاران ، گێڕانەوەو وەسفی بەلاوەنا یان‌ئێجگار خەستی‌كردنەوەو لەجیاتی ئەوە وێنەی شاعیرانەی بەهێزو وتووێژێكی توندوتیژو گورچكبڕوچڕی بەكارهێناو دیكۆرو دیمەنی كارەساتەكانی‌بە زەق‌و ڕەوانی خستەبەرچاو . زمانی نووسین دامێنی خۆی هەلكردو بەگورج‌وگۆڵ‌و بەخەستی‌و شیعرئامێزی‌و دەربڕینی پوخت‌و بەهێز هاتەكایەوە ، شێوەی (تداعی) و مەنەلۆجی ناوەوە ئاشكرا جێگیربوو . لەقۆناغی یەكەمدا ڕوانیمان كەكەسانی چیرۆكەكان ئەوكلۆڵ‌و داماوو هەژارانە نەبوون كە لەژێرباری كوێرەوەری‌و خەم‌و جەخاردا نركەیان بێت‌و نووسەر بەهۆیانەوە هەستی نابەكام‌و سەرەتایی‌و بەزەیی خوێندەوار بجووڵێنێ ، هەروەها ئەو پاڵەوانەش نەبوون كەتواناو هێزیان لەخەڵك بەدەربوو‌بێت‌و لەجەنگەگاهی خێروشەڕدا گۆی

هونەریان بردبێتەوە ، دیمان چۆن قارەمانەکان لەژیانێکی ڕواودا دەجوولێنەوەو بە گیانی منداڵی ی پاك و بێباکی یەوە هەنس و کەوت دەکەن . جانەو منداڵە بزێوو لاسارو چەتوونانە ، ئەو منداڵە قسە لەڕووو ڕوح سووکانە لەقۆناغی دووەمدا سەر دەردەکەنەوە ، هەرخۆیانن یاخی دەبن لەڕووی ناهەق و دیلی و ڕووشانی ئابڕووی مرۆڤانەو سەربەرزیدا هەڵدەچن چ لە ڕیزی پسوولەی نەوتدا بێت و چ لەناو ئۆتۆمبیلی نوختەی تەفتیشدا بێت ؟ هەروەها هەروەکو جاران بێباکن ، بەچاوی بێباکی و بێ پەروایییەوە سەیری دیمەنەکانی واقیعی ژیانە تازەکە دەکەن بەکۆمیدی و تراجیدی یەوە . یاخی بوونەکەیان زۆربەی جار سەردەردەکا بۆ شۆڕش و بە لەخۆبردوویی و خوێنگەرمی یەوە تێکەڵ بەشۆڕشی گەل دەبن .

چیرۆکی ( رووی کردەوەشاخ )[15] نموونەیەکی شەنگی ئەو چیرۆکانەیە ، کەبریتی یە لەبەسەرهاتی کۆمەڵێ ڕێبوار سواری ئۆتۆمبیلێك بوون لە ڕۆژانی شەڕدا لە نوختەی تەفتیش ڕادەگیرێن بۆئەوەی دڵنیابن کە شەکرو چاو شتی قەدەغەکراویان لەگەڵ خۆیان هەڵنەگرتووە . جگە لەتەکنیکی نوێی چیرۆکەکە کەئەگەر لەگەڵ چیرۆکێکی هاوبابەتی خۆیدا کە چیرۆکی ( مۆمەکەی شەماشەدنحە ) ی[16] مامۆستا محمد مولودە بەراوورد بکرێت چەشنی نوێیەتییەکەی تەکنیك و جیاوازییانم دیاردەبێت . دەڵێم جگە لەتەکنیکی نوێ ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لێرەدا قارەمان تاقە کەسێك نییە ، بەڵکوچەند کەسێکن کەیەکساتی مێژوویی بوونی مرۆڤانە داوای هەڵوێست و بڕیاریان لێدەکات ، یەکێك لەوانە بڕیاری شۆڕشگێڕانە دەدات و لەدواییدا لەنیوەی ڕێدادەبەزێ و ڕوودەکاتەوە شاخ .

هەروەکو شەماشە دنحەش کەلەنوختەی تەفتیشدا نەیتوانی قامتە مۆمێك لەگەڵ خۆدابیبات تالەسەر مەزارێك شەو دایانگرسێنێ بڕیاریدا کەگەیشتەوە ماڵ لەجیاتی مۆم گیشەدارێك بسووتێنێ و ئاگریان پێ بکاتەوە .

### سێیەم : قارەمانی قۆناغی نوێ لەبەردەم (جنس) دا

کاك « حسین » لەو ریالزمە نوێیەدا جۆرەها قارەمانمان پێشکێش دەکات کەمنداڵە شۆڕشگێڕەکەی ناو واقیعی شۆڕشەکە دەنوێنن ، بەڵام لەدوادوای ئەمقۆناغەدا ، لەئەنجامی تێکەڵاوی بەقالبە بیانی یەکاندا ، قارەمانەکە تووشی خەم و جەخاری شارستانەتی ی ئاڵۆزی مادی ی ڕۆژاوا دێت و بەدوا بیروڕای زادەی خوێندنەوەی زۆرو ئارەزووی نوێخوازی و هونەرنواندنی نووسەر لەمەیدانی تازەدا تووشی قالبی دەگمەن دێت .

قارەمان لە چیرۆکی ( وەچەی یاسای خۆڵ و دۆ ) دا قارەمانێکی ترەو لە بەرگێکی چیرۆکانەی تردا پێشکێش کراوە . کەئەم چیرۆکە بریتی یە لەسیناریۆی داستانێك و دیمەنی بروسکەبابەتی جوولە ـ پێکەوتووی کامێرای ریالستی فلیمێکی سینەما .. سەرەتا کاکڵی باس و ئەورووداوە سەرەکی یەی کەخوێندەوار لێی ڕەچاو بکات دیار نییە . لەجیاتی کاکڵی ناواخنکراوەی ئەوروخسارە هونەرییە نوێیەو دیمەنە بروسکاویانە بیروڕایەکی مەیلەو فەلسەفی تووش دەبین دەربارەی بنەڕەتی مێژووی ژیانی مەسەلەی زیناو داوێن پیسی ، کە وای تێدەگەم پوختەی بیروڕایەکەی ئەوەیە داوێن پیسی تۆوێکە لەپشتی باپیرە گەورەو منداڵدانی داپیرە گەورەی داوێن پیسەوە ( ئەگەر هەموو مرۆڤایەتی نەبێ ) ڕوواوەو (تاك) بەروبوومێکی مێژوویی ئەو بەرو تۆوەیەو تاوان تاوانی بنەیەو ئەویش داب و دەستوورێکی باوی مرۆڤایەتی یە . هەروەکو لەمەودوا دەبینین قارەمان لەم چیرۆکەدا ئەوقارەمانە نییە کەتاکێکە لەکۆمەڵێکدا ئێمە ئاگاداری هەڵسوکەوتی ژیانی هەین و لەئەنجامدا دەزانین ، چ بارو زروفێکی کۆمەڵایەتی و بەپێی چ مایە ڕەخساوەکانی باری ماددی ژیانی کۆمەڵ پێگەیشتووەو قۆناغەکانی نەشونماکردنی شەخسیەتی بۆ ئەوە شی کرابێتەوە کە قارەمانێکی نموونەو مرۆڤێکی تەواومان لەبەرچاو بێت .

دوورنییە بگوترێ کەقارەمان لێرەدا وەکو ناوی چیرۆکەکەش دەری دەبڕێت (وەچە) یەکە ، کەوەچەی یاسای خۆڵ و دۆیەو ئنجا ئەم وەچەیە لەجوولانەوەو هاتوچۆی ژیانێکی سەرداپۆشراوی بنتەپکی بێمایە لەلایەن نرخ و بەهاکانەوە یەکێکی دەبێتە قوربانی و لەژێر پێی جوولانەوەکەدا دەپلیشێتەوەو ئەوانی تریش لەدوا چەپەری قوربانی یەکەوە دەوری فێڵبازی لەو وەچەیەدا دەگێڕن کەڕاهاتوو وڕام کردەی

پاسای خۆڵ و دۆن . بۆزیاده روون کردنەوەش دەڵێین
کەمەسەلەی خۆڵ‌ودۆ ئەو نەریتە کۆمەلایەتی‌یە کۆنە
دەگێڕێتەوە کە جاران ئەگەر لە شارێکدا ئافرەتێك داوێن‌پیسی ی
لێ‌دەرکەوتایە بەرەواژ سواری کەریان دەکردو کلکی‌کەریان لە
دەست دەناو خۆڵ‌ودۆ ( لەهەندێ ناوچەشدا ماست‌و دۆشاو )
یان بەسەردا دەکردو بەناو شاردا دەیان‌گێڕا ئنجا
شاربەدەریان دەکرد . ئنجانازانم ئایا وەکو شەرع فەرمانی
پێداوە بەردەباران دەکرا یان‌نا .

چیرۆکنووس بە (8) بەندو سەرەباس چیرۆکەکەی پێشکێش
دەکات . سەرەتای چیرۆك کەلام وابێ بۆکۆتاییش
دەست‌دەدات‌و رەنگبێ نووسەر وای‌نیاز بووبێت سەروبنی
چیرۆکەکە بکاتەوە یەك‌و دیمەنی کۆتایی پێش‌بخات ، بریتی‌یە
لەوە کەنووسەر بەدەزگاو دوکان‌و کۆلانەکانی شارێکدا
دەمان‌گێڕێت چاومان بەدیمەنی سبەینەیەك دەکەوێت
کەخەلکەکە لەخەو هەلدەستن ، نان‌دەکڕن ، بەرچایی دەخۆن ،
دەچنەسەر کاری‌خۆیان ، لەچاخانە دادەنیشن . دیمەنی
دایەرەو چاخانەو مەحکەمەو کۆلان‌و بازاڕ دەبینین ،
ئەم‌دیمەنانە لەژیانی شارێك‌دا لاپەرەیەکە شروشت هەر رۆژە
جارێك هەڵی‌دەداتەوە ، بەگشتیش لەژیانی رەنجبەران‌و خەلکی
وێلی بەدوا پاروودا . هەروەکو نووسەر بە زۆردانە دەمەوە دەیلێ
:

« بۆ جاری ملیۆنەها جارە ، جەجاڵ هەڵ‌ئەسا .. ئەبوو
بە رۆژی حەشر ، شار بەیەکا ئەهات . شاربەیەکا
ئەچوو .. شار چنگ لەسەر شان ئەنیشە سەر رۆژێکی
تری تەمەن‌و پەیرەوی یاسای ژیانی ئەکرد » ل 26 .

لەم‌شارەشدا جارچی بریارو سزا یان یاسای وەچەکە بەگوێی
خەلکدا دەدا ، هەرەشە لەوە دەکات کەوا ( لەکە دەنێتە سەر
رەوشتی خۆمان‌و باو باپیرمان ) هەر کەسێکیش گوێ بەم
بریارە نەدات بەودەردە دەچێت کەچیرۆکەکە روونی دەکاتەوە .
ئەم‌سەرەتایە ، زیاد لە چارەکی چیرۆکەکە دەکوژێت‌و هێشتا
قارەمان دیار نیە ، قارەمان هەر کووچەو کۆلان‌و وەچەیەکە کەلە
جەنگی ژیان‌دایە . پاشان لەژێر سەرباسی ( سەرەتای
هەنگاو ) دا یەکێك قسە دەکات :

( کەلە پشتی باپیرەگەورەما بووم دایەگەورەم بە
بەرچاوی خۆمەوە زینای‌ئەکرد . باپیرەگەورەشم وەك‌ئەو
دزبوو ) ل 26 .

ئەو باپیرە گەورەیەش لەمێژوویێك دایەکە کڕین‌و فرۆشتن‌و
ماملەت بەگۆڕینەوە بووە ، بابی‌یەکە بەروبوومی سروشت
بووە ، بەنموونە هێشووە تری‌یەك‌بووە .. ئیتر لەسەردەمی
بەردەوە تائیستا کەبازار دامەزراوەو لەجیاتی هێشوەتری
سەودا بەمرواری دەکرێت ، واتێ دەگەین کە ئەم باسە هەر
عەینی باسەو دووبارە دەبێتەوە ! لێرەدا پاش کەمێك دەزانین
کەخاوەنی ئەم رایانەو ئەوەی قسەکە دەکات کچێکە ، کچێك
کەتۆوێکی ناومندالدانی دایك‌بوو چاوەڕوانی ئەوەی لێ‌دەکرا
ببێ‌بەنێر . مادام تۆوەکە بەمێ دەرچوو ئیتر ئازارو ترسی
کوشندەو نووکی شووژن لەناو زگی دایکی‌یەوە دەستی پێ‌کرد
هەتا تەمەنی بوو بە 16 ساڵ .

ئایا چارەنووس وایە کە هەر دەبێ ئەم کچە تووشی تاوانی
زینا بێت ؟ بریارێکە دراوەو مێژووی بنەماڵەکەی خۆی
مۆری‌کردووەو سەرپێچی لەئاستیدا بێ سوودە ؟ یان بارو
زروفێك لەژیانی مادی‌ی کۆمەڵەکەی رەخسا کە لەم‌لاو لەولا ،
دیارو نادیار ، ئاشکراو نهێنی سەرە دەزوو بەیەك گەیشتن تا
تۆری راوکردنی ئەوی پێ‌بهۆننەوەو بەرەو (داوێن پیسی)
پەلکێشی بکەن ؟ ئەمەیە ، یان لەلایەنی فزیولوجی‌و
شیکردنەوەی جنسی‌یەوە وەکو خۆی‌دەلێ ( کولی ئارەزووی
زینا ) ی هەستاوەو جۆشی سەندووەو لافاوەکەی بەندوبەستی
توانای خۆگرتن یان گوێ‌دان‌بە رەووشت‌و یاساکانی کۆمەلی
تێك‌شکاندووە ؟ یان نموونەیەکە بۆ هەر مرۆڤێکی یاخی
کەئامادەیە لەپچووك تاگەورەترین راوورەسم‌و ری‌وشوێنەکانی
ژیانی کۆمەل سەرکێشی بکات‌و ژیانێکی خۆویستانەی
سەرزەدەی بەرەللا بژیت‌و لەنوێوە بابی‌و نرخی تایبەتی کە
لەهەلس‌و کەوت‌و ژینی خۆی هەلدەوەرن دلۆپ دلۆپ کۆیان
بکاتەوەو رەووشت‌و نەریتی تازەیان لێ‌ئیجاد بکات ؟ ئەمانە
کامیانە ؟

من‌لام‌وایە قارەمانی ئەم‌چیرۆکە لێرەدا ئەو قەدو بالایەی نییە
کە لەسەری بووەستێ‌و بتوانێ وەلامان بداتەوە .

ئەگەر بلێ کۆمەل تاوانبارە ، بەلێ ئەوەی بۆ دەرخستووین کە
پایەی مێینە لەکۆمەلدا نزمەو کۆمەل بەیەك‌چاو سەیری نێرومێ
ناکات چ‌لەئەرك‌و چ‌لەمافدا . لەکۆمەلی فرەچین‌دا زولم‌وزۆر
شەخسیەتێکی تایبەتی بەژن دەدەن‌و ئاستی نزم دەکەنەوەو

ەنرخی بوون‌وسەنگی کۆمەڵایەتی دادەشکێنن‌و مەسەلەی هاوسەریی ژن‌وپیاو دەبێت بەمەسەلەیەکی دارایی‌و پیاو ژن‌دەکا بە بەندەو ژنەکەش فەیلوسوفێک گوتەنی ( دەبێتە بەندەی ئارەزووو تاقە ئامرازێکی منداڵ بوون ) .
کچەکە خاوەن دایك‌و باوك‌و خێزان‌وماڵە ، دیارنییە چ‌کۆت‌و پێوەندێکی گوزەران‌و زۆ اریی چینایەتی‌و نەریتی کۆنەپەرستانەو دەمارگیریی باب‌وبرای بەسەرەوە بێت .
( شانزدە ساڵ بەسەر پشکۆی حەزو ئارەزووی کچێنی‌ی خۆیدا هەڵنشتووە ) ( فرشتەی بەختی هەمووان هاتە دەنگ ، تەنیا هی‌ئەونەبێت ) . لەژیانیدا ( تەنها فریشتەیەکی هەتیو ( شاووری بۆلێ‌دا ) و ویستی زەماوەندی جۆش‌و ئارەزووی کپ‌بکات ، بەڵام دەردەکەوێ ئەم نەیویستووەو پشتە پێ‌یەکی لێ‌داوە . کەباس دێتەسەر ئارەزووی جنسی ، هەروەکو قارەمان باسی‌دەکات یان‌بڵێین نووسەر دەیەوێ پێ‌ی بدرکێنێ ناگونجێت مەسەلەکە هەر مەسەلەی زینابێت ، هەرگیز ڕەوا نییە لەبەرەبەیانی مێژووەوە تائەمڕۆ هەر مەسەلەی ( تەگەبەرانی‌یەکە ) بێت ، واتا ئارەزووی جنسی هەموو هەست‌وسۆزو ژیریی‌و خەوو خەیاڵی مرۆڤایەتی ڕاپێچی تونێکی تەنگ‌و تاربکات . ڕایەڵی پێوەندی مرۆڤایەتی نێوان نێرومێ ، سۆزی دڵداری‌و خۆشەویستی‌ی دایکێتی‌و منداڵپەروەری‌و باڵی بەزەیی باوکایەتی‌و هۆگریی خێزان‌و ژینی ژێر سایەی ماڵێك کەبەرەنجی شانی هەمولایەك ژیانی تێدا بەسەر دەبەن ، ئەمانە هەمووی نەخوێندرێنەوەو تەنیا مەسەلە مەسەلەی کوژاندنەوەی پشکۆی حەزو ئارەزوو بێت ؟ ڕەوانییە قارەمان بەم جۆرە تێ‌ی‌بگات :

« کە باپیرەی گەورەم لەدایك بوو ، دایە گەورەم بەسواری ئەسپی زینا بەپیریەوە چوو : باپیرە گەورەم سەرچۆپی گرت‌و زەماوەندێکی سازکرد ، کە زیناکەرانی ئەم پەڕ تا ئەوپەڕی دنیای هێنایە جۆش . حەوت شەوو حەوت ڕۆژ بەکاتی تیشك هاوێژ دایان لەدەهۆڵ‌و زوڕنا »

« دەنگی دەهۆڵ‌و زوڕنای زینا بەجۆشتر بوو . کەچی کەنۆرە هاتەسەر من ، دەهۆڵ‌و زوڕنا کپ‌بوو »

ئیتر لەداخی ئەمە بڕیاری یاخی‌بوون دەدا ؟! بەڵام چ یاخی‌بوونێك ؟ لەزنجیرەی هەنگاوەکانی ئەم یاخی‌بوونە دەردەکەوێت کە لەجیاتی ئەوە لەبەر هەر هۆیەکی کۆمەڵایەتی یان دەروونی ناچاری ئەوە بووبێت خۆی‌بە قەڵبەیەکدا بدات وببڕێتەوە . نەخێر ، بەپێچەوانەی نەریت‌وباوەوە دەچێتەسەر جێ‌ی‌پیاوێك ! دەچێ ئاگری ئارەزووی جنسی خۆی دادەمرکێنێت . لەگەڵ‌کێ ؟ لەگەڵ کابرایەکی نیوە لەش‌مردوو کەبەقوونەخشکێ لەودیو دەرگاوە بۆی‌دێت . ئەمجا کە خورووی نەشکا هەنگاو لە یەکەوە دەگاتە شانزدەو‌سەدهەزارو وەکو داوێن پیسێك جاڕی غەزا دەدات !

ئەمەیە هەڵویست ! بەڵام باچاوێك لەقارەمان‌و کەسانی چیرۆکی ( ڕێگاو کاتی وون ) بکەین کە لە 1970 نووسراوەو لە کتێبەکەی (کلافەیەك ... ) دابڵاوکراوەتەوە .. کەوا قارەمان پیاوێکە هەڤاڵەکەی دەچێتە بەغداو پێ‌ی ڕادەسپێرێت کە ئاگای لەئەختەری ژنی‌بێت . پێشەکیش ئەختەر بەڵێنی پێ‌داوە کە ئەگەر مێردەکەی‌ڕۆیی ( سبەی‌شەو .. لەبیرت نەچێ .. من‌وەك بووکێك چاوەڕوانت دەکەم )

هەرچەند تێ‌نەگەیشتین ئەختەری تازەبووك بۆچی ڕێگای ناپاکی دەگرێت ، بەڵام دەزانین کەڕێگای پەهەشت بۆ هەڤاڵەکە دەکاتەوە . (ل ـ 25) هەڤاڵەکەش لە ناخی‌یەوە مۆنۆلۆجی بڕبەندکاری‌و پۆلاو ئاگر دەست پێ‌دەکات‌و لەدواییدا بڕیاری مەردایەتی دەداو شار بەجێ‌دەهێڵێت‌و ڕوو دەکاتە شاخ کە دەگاتە سەرکەلی گوێژە تۆپەڵێ تف لەهەموو تیشکی هەڵفریواندن‌و بۆمبای بێ‌هێزیی مرۆڤ دەکات ( ئەوساوەك هەردێوانەیەك ڕێگاو کاتی دیار وئاشکرای گرتەبە ر ) کە ڕێگای شۆڕش‌و تێکەڵ بوونە بەمرۆڤایەتی .

کەچی لەچیرۆکی ( وەچەی یاسای خۆڵ‌ودۆ ) دا قارەمانەکەمان خەریکە مەردایەتی بنوێنێ کە « وەچەی زینای ڕیسوادەکرد » !! ئەمجا نووسەر دەڵێ :

« زمانی شار گویزان‌بوو بۆجاری ملیۆنەها جار خۆی لە هەسانی مێژوو ئەسوو . »

ئەگەر بەرامبەر بە عیبارەتی ( ئارەزووی جنسی ) کە لەسەراپای چیرۆکەکە دەچۆڕێتەوە ڕاستتر ( خۆشەویستی جنسی ) بەکاربهێنین ئەوا دەڵێین خۆ خۆشەویستی ئەو کارە خەیاڵی‌یە پەتی‌یە بێ‌گەردە نییە کە ڕاهیمەی عاشقان هۆگری بێ ، هیچی تیابەستە نییە ئەگەر بڵێن خۆشەویستی بەجنسەوە بەستراوە ، ئەم خۆشەویستی‌یە جنسییەش دیارە بەپێ‌ی یاسای گۆڕانی کۆمەڵ‌و قۆناغەکانی ژیانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی

لەپێکەیشتن و گۆڕان و پێشکەوتن دایە .

لەبەرەبەیانی شارستانەتیدا ئەگەر جنسەکە لەشێوەی ( بەکۆمەڵ ) دا بووبێت کاتێ کەبەکتایی ژن ومێردی ( یەکژنە ) پەیدابوو ئارەزووی جنسی تاکانەش پێگەیشت و هەروەك نووسەری کتێبی ( اصل العائلة ) دەڵێ :

« خۆشەویستیی شەخسیی ئەمسەردەمە لەنێوان توخمێك و توخمێکدا لەپێشوودا نەبووەو نەزانراوە ، کەوا خۆشەویستیی جنسیی تاکە شەخسی بەرزترین شێوەی خواستی جنسی یە . »

هەروەها دەڵێ :

« خۆشەویستیی جنسی ئێمە لەجەوهەرەوە لە ئارەزووی ساکاری جنسی و لەخۆشەویستیی پێشینان جیاوازە ، کەوابێ شایانە بەیەك چاو سەیری ئەم مەسەلەیە نەکەین و دەبێ بزانین کەگەڵ شێوەی مێژوویی وەرگرتووەو لەنزمەوە بوبەرزو لەجانەوەری یەوە بۆ بەرەو مرۆڤایەتی یەوە هەڵکشاوە کە راستەوخۆ پەیوەندیشی بە پێوەندی یە کۆمەلایەتی یەکانەوە بەردەوام بووە . جا لەو کۆمەڵەو لەوشارەی کەنووسەر باسی دەکات و وێنەی دەنەخشێنێ کە کۆمەڵێکە رادێو داروین و شۆڕش و گەل دەناسێت و رادەی پێوەندی کۆمەلایەتی ی بازاڕو کۆڵان و ماڵەکان شێوەیەکی شارستانی پێشان دەدات مەعقول نییە ئەووەچەیە بژیت کەوەچەی زیناو خۆڵ و دۆیە ، بەڵکو نووسەر لەسەریەتی جوانترین و ناسکترین شتی مرۆڤانە لەژن و ژنایەتی بدۆزێتەوەو هەست و سۆزی ئێمەی خوێندەواری بێ بەرز بکاتەوە .

دیمەنی کۆتایی کە ئەوبەیانی یەیە ( پێویستە شار لەکلاوی زینا پاك بکرێتەوە ) هەرچەندە ئاهەنگێکە شێوەی غەزای وەرگرتووەو بەشدارانی زینا بەرگی رووکەشیان پۆشیوەو خۆشیان بەشدارانی غەزاکەن و شاربەدەرکردنەکە دەست پێ دەکات . لەم دیمەنە مرۆڤانە کاریگەرەدا کچە لەو هەڵوێستەدا نییە کەخوێندەواران لەرووی هەست و ژیری و لێکدانەوەیەکی شعووری قووڵەوە پەژارەو خەمی قوربانی دانەکە دایان بگرێت و کرژی و قووڵ کردنی درامای تراجیدی مەودایەکی شیاوی هونەری پێبدەن . بریق وباق و چرووپری جۆری تەکنیکیش کاریگەری یەکەی تارادەیەکی باش نەدیو کردووە . وەکو پەراوێز حەزم دەکرد ناووشوێنی بڵاوبوونەوەی چیرۆکێکی ( مەکسیم گۆرکی ) م لەبیر بمایە کە ئەویش دیمەنی شاربەدەر کردنی ئافرەتێکی لەم جۆرە پێشان دەدات و یەکسەر لەپێشان دانی خەڵکەکەو دیمەنی ژنەکەو زەبرو زەنگ و ناهەمواریی ژیانی کۆمەلایەتی ئەوێ دەست پێ دەکات و لایەنی درامایی ی خەم و دڵ بزوێنی تێدا بەهێزە .

## چوارەم : قارەمانی رامان و بیرکردنەوەی بەپەلە

کاتێك حسین عارف لەرێگەی نوێ خوازی و نوێ کردنەوەدا زیاتر هەنگاو دەنێ ، سەیری شەپۆلی نوێی ئەدەبی ئەورووپا دەکات .. دەیەوێ ئەو کەرەستە تازانەش بخاتە ناو ئەدەبی کوردییەوە . وەکو لەتەکنیکدا شێوەی نووسینی ( شەپۆلی ئاگایی ) و گێڕانەوەی ناوزەین و تەداعی لەلایەکەوە یەککرتنی نووسەر لەگەڵ کەسانی چیرۆك لەقالبی هەست و هۆشی هەڵوێستی نێوچیرۆکەکەدا لەلایەکی ترەوە ، پاشان سوود بینین لەشێوەی سیناریۆی فلیمی سینەماو دیمەنی کامێرایی و دابەش کردنی وتووێژێکی سەربەست و چڕو خەست و خۆ دوورخستنەوە لەسنووری توانا لە چیرۆك خوانی و شێوە راپۆرتی و وەسفی راستەوخۆ . هەروەها هەڵوەشانەوەی تەونی چیرۆکی کۆن دەربارەی سەرەتا ، گرێ ، هەڵوێستی ناکاوو رێکەوت کردو کۆتایی سەرسوڕمێن .

هەموو ئەو شێوە تازانەش کە لەرێگەی ئەدەبی عەرەبییەوە لێیان حاڵی بووەو بەسەریاندا راگەیشتوە روخساری ناوەڕۆك و رێبازە بیری یەکانی وەکو وجودی ، یاخی بوون ، بێ هوودەیی و رێگە فەلسەفی یە تاك پەروەرەکانی ئەورووپا بەناوی ئەدەبی لامعقول و پێشرەوایەتی و ناوی ترەوە بەخوێندەواران دەگەیشت . نووسەریش واتێ بگەم وەکو مۆدەو دەست پێشکەرییەکی زوو بەزوو کەمن شایەدیی رابەری و زووشت وەرگرتنی بۆدەدەم ، زوربەی ئەو رێگاو شێوە هونەری و بیرە فەلسەفیانەی کۆڕی چیرۆك لەچیرۆکێکدا تاقی دەکاتەوە ناوی ناوە ( ئەندێشەی مرۆڤێکی سەوداسەری دواهەوالی ئەمسەردەمە جەنجالە )[17] و قارەمانی تایبەتی ئەمەیدانە پێشکێش دەکات ، کەقارەمانێکی سەلبی یەو

مەست بەپەژارەو دڵتێك هەلاتن و بێهوودەیی ژیان دەكاتو حوی بەوونی ئەم زەمینو ئاسمانـە دەزانێتو سەوداسـەری ـهێنی ی بوونو نەبوونە .

دروستكـردنو شێوەی پێشكێش كـردنی قـارەمـانی چیـرۆكی ( ئـەنـدێشــە ) تـاڕادەیـەكی زۆر لەئــەدەبی لامعقول) دا وێنە دەداتەوەو زۆریش لە ئێوەمانان نموونەكانی ئەو ئەدەبەی بەرچاو كەوتوە لەچیرۆكو لەرۆمانو لەشانۆییدا . نیسلن) دەڵێ ئەم جۆرە شانۆییانە ئـەنجامی هیـوارووخانو خەوڕ وونكردنن ، دەربارەی ئەوەش كـەیاسـاو بناوانی بـاو ـەشكێنن واچاكە دەقیئەم وەسفەی ناوبراو بهێنینەوە كەدەڵێ

« نەچیرۆك یان شیرازەییكی شایانی بـایەخ پێـدان بێ تێیاندانییە . شەخسییەتەكانیشیان ئـەوانە نـین كەبتـوانرێ جیـابكـرێنــەوەو كـاتێـك پێشكێش دەكـرێـن هــەروەكـو بووكەشـووشەی مـەكینە بن وەهــان . ئەگـەر شانـۆیی چاك پێویستی بەوەهەبێت كەبابەتێكی بەگرێكردنەوە كۆتایی هاتوو پێشكێش بكات ، ئەوا ئەمانە نەسەرەتایان هەیەو نەكۆتایی ، خۆئەگەر شانۆیی چاك پێویستی بەوەهەبێت وێنەی سروشت عەكس بكاتەوەو بەنەخشەی سەرنجووردانە شێوەو مەیلەكانی سەردەم وێنە بكێشێت ئـەوا ئەمـانە زۆربـەی جار خـەونو مێردەزمە دووبارە دەكەنەوە . ئەگەر شانۆیی چاكیش پشت بە وتووێژی ناوازەو دەمەتەقێی ڕەوان ببەستێت ئەمشانۆییانە زۆربـەیجـار لەمنـەمنو ئـاژاوەی لەتێگـەیشتن نـەهـاتـوو پێكدێن »[18]

لەڕاستیـدا ، هەروەكـو روبەرت بـروستـایـل دەڵێ ووشـەی (قـارەمان) لەوجـۆرەئـەدەبـەدا بـەتـەواوی مـانـای خـۆی لەدەستداوەو ئەو كەسە سەرەكییـەی هەیـەو كەلەجیـاتی قارەمانە لەتواناشو لەزیرەكیشدا لەئێمە نـزمتردیـارە . كاتێ كەسەیری دەكەین واهەستدەكەین كە لەژوورەوە سەیـری دیمەنی دیلیەك یان تێكشكانێك یان بێهوودەییەك دەكەین ، بێگومان ئەمدیمەنە هەرگیز شایانی دیمەنی یان بێهوودەییەك دەكەین ، بێگومان ئەمدیمەنەكەش زۆربەی جاریان گەلۆرێكە یان رەنجبەرێكە یان تاوانبار یان پیرەمێردێك یـان حەپسێكی بەگیانو بەلەش زیندانییە . لەدرامای وجودیدا نەسروشت ، نەكۆمەڵ ، نەمرۆڤ شوێنیان نییە ، ـ لەمرووەی دواییەی دراما نوێیەكەدا ـ لەناو ئەو هەمـوو خەونـە ئاڵۆزو مـۆتەكـاویو ماخولیـای لەتوانـادا نەبـووو ورێنەو پـڕوپووچی سێبـەرۆ ـ دارانەدا یاخیبـوون بەشێـوەیەكی ئێجگـار بەرچـاوتاریـكو كورتبڕیو شەكەتی دەبینی »[19] .

ئەمپێشەكییە وەكو پێناسینێكو هێڵی درشتی باسن كەسەرتاپا لەچیرۆكەكەی ( ئەندێشەی .. ) « حسین » خۆیان دەنوێنن و لەكـاتی خستنەڕووی وێنـەی قارەمـانەكـەیـدا بـەتـەواوی دەیانبینن و هەستیان پێدەكەین .

چیرۆكەكە وەكو شانۆییەك بە دەنگی كۆرس پەردەی لەسـەر لادەدرێتو كۆرسیش ووشەگەلی ( سزا . ژان . پەژارە . خەم . خوێن . ڕق . لەعنەت . تف . جوێن ) لەدوو دێڕدا دەردەبڕێت كەهەموویان نیشانەی یان حاڵەتی دەرككردنی بێهوودەیـین كابرایەك پێشكێش دەكەن كە : ( ئاوارە ، بێمەلبەندو بێسەرو شوێنە . بەدڵ زەمین هەڵدەلووشێو بەچاو ئاسمان ) كە حاڵەتی وون بـوونـەكـەی وجـودیـیـە ! بـەتـایبـەتی كـەدەزانـین ( سـەوداسـەری نهێنیی بـوونو نەبـوونە ) خـۆیشی كـوڕە برجوازییەكی بچووكەو لەسەر دوكـانی باوكی دانیشتـووەو خامۆشەو لەدەرەوە بێئاگایەو بە دەردێك گـرفتارە هـەروەها لەچیرۆكی ( خوویەكی پووچیش ) دا كە ئەگـەرچی مێژووی دانـانی لەسەر نییـە بەلام لەكـۆمەڵەی ( كـلافـەیـەك ژانی تووڕە ) دا ساڵی 1971 بلاوكردوەتەوە واتابە دووساڵ یان كەمتر پێش چیرۆكەكەی (ئەندێشە) كەوتووە ، لەویشدا نموونەیەكی وەها دەبینین كە مێردمناڵێك لەسووچێكی چاخانەدا بـەتەنیـا دادەنیشێت ، بەچاو سەرنجی ئەدایە مەردمی سەرشەقامەكەو بـەبیـرو هـۆشیش ئـالابـووە كـلافـەیـەك بـاسوخـواسی هەمەچەشنە »[20] زوو زووش خووەكەی خۆی كەزەردەخەنەو سەربادانە دووبارە دەكاتەوە . هەر ئەویشە نووسەر بەئاشكرا وەسفی دەكاتكەوا ( ئەوخولیایە دابووی لەكەللەی كەلەنهێنی ژیان تێبگات ، كەمانای ڕاستی بوونو نەبوونی چنگ كەوێت ) . كەوابێ لەبناغەدا ئەویش وەكو ئەموایە ، بەلام لەئەنجامدا بەهۆی بەرەوانیی لەنابەهەقییەكی تاكانەدا تێدەگـات كە ( لەبەرچییە تووشی ئەوخووە پووچە بێمانایە بووە ) وخەمی بەرزو نزمیو جیـاوازیی پایـەكانی كـۆمەڵی لەبـەرە ، بەلام خەمەكەی بەخەمی هەموو جیهان نەگەیشتووە .

قارەمانی چیرۆكەكەی (ئەندێشە .. ) خوێندەوارەو شەوگوێ

لەبەرنامەكانی ئیستگەكانی رادیۆ دەگریت ، بەلام بەپێنج سەدو هەندیك زمان .. هەر یەكە سەرداوی باسێك دەگریت و ڕستەكە تەواوناكات .. لەم ڕستە ناتەواوانەش بەروونی دەزانین كە دەربارەی حالی مرۆڤایەتین ، مەسەلەكانی رزگاریی نەتەوەیی زانست ، یاریو وەرزش ، تەندروستی ، سیاسەتی دەولەتان ، بەلام نووسەر هەموویان بەوە شیدەكاتەوە كەوا « ئەیویست سەراپا درۆكان ببیسێ » .

ئەم مرۆڤە دەرەوەو كۆمەڵ بەبێگانە دەزانێت و وادیارە هەر كە لە دایكی بووە بێگانە بووە . باشە هەر چۆنێك بێت ، واشەوەو خەوی لێناكەوێ ، هاتووە لەمەسەلەی ئایینو خوا دەكوڵێتەوە . خەوی لێدەزرێت ، ئیترلە دیمەنێكی كۆمیدی سەیردا دەیبینین هەڵدەستێ ، دەڕوا دادەنیشێ ، خۆی گرمۆڵەدەكات ، هەڵدەستێتەوەو دادەنیشێتەوەو بەم جۆرە كەووشەو ڕستە بەهێزەكانی نووسەر جوانترین نیگاری بۆكێشاوە . دووبارە (كۆرس) دێتەوە كەلە زمانی نووسەرەوە داوای لێدەكا بنوێ تاشەپۆلی ژانەكانی بووەستێ ، مێردەزمەی خەونی ئالۆزسواری سەرسنگی دەبێت و دیمەنە دزێوو بەترس و تۆقێنەرەكانی وجودیانە دەبینین .

رادەچەنێ ! نووسەر دیمەنی زۆری دەرەوەی ژوورەكەیمان پێشاندەدا كەوا دیارە نەسروشت ، نەكۆمەڵ كاریگەرییان بەسەرەوە نییە ، ئەویش دەخلی بەوان نیە . دایك . برا . خەڵكی شەقام . ناسیاو .. واتا هەموو ئەوانەی (سارتەر) بە دیگەران ناویان دەبات و دیگەرانیش جەهەندەمن !

« ڕۆییشت ، لەكۆلان دەرچوو گەیشتە سەرشەقام . ڕێگای ڕۆژانی تری گرتەبەر ، لایدا ، گەڕایەوە ، لایدایەوە ، نەچووبۆنیش ، ڕۆییشت ، خەڵكەكەش هات . خەلكەكەش دانیشت . ئەوانیش . هەلسا . ئەوانیش بەدوایەوە بوون ، بەدوایانەوەبوو ، لەگەڵیا بوون ، لەگەڵیانابوو . زۆر برادەری تووش هات . تووشی زۆربرادەر بوو . زۆرناسیاو سلاویان لێكرد . سلاوی لەزۆر ناسیاو كرد . ئەگەڕا . هەرئەگەڕا .. هەرئەگەڕا »[31] دیسان نووسەر بەزمانی كۆرسەوە هۆشیاری دەكاتەوە كەوا ( مەگەڕێ . ئەم زەمینە بەبێئەمو بەبێ ئەوو بەبێتۆش هەر سووڕ ئەخواو هەر دەگەڕێ » .

ئەم دەنگە دەنگدانەوەی ئایدیالزم و بانگی خۆبەدەستەوەدانی چارەنووسەو دەنگدانەوەی ( لا ادری یەكان ) و خۆهەڵسوونە لەمەبەستی بێهوودەیی ژیانو پڕوپووچیو بێتامیی بوونی مرۆڤ بەلام (ئەو) ی سەرلێشێواوو دلپڕو خەیال ئاوساوو لەبەرامبەر ژیانو بوونو گەردووندا ، لەبەردەم سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەدا ، لەبەردەم ڕەووشت و نەریتی كۆمەلایەتیدا .. لەبەردەم شۆڕشو شۆڕشگێڕانو لادانو شۆڕش خنكانو زانستیدا كە هەتائیستا بێدەنگو ماتوخامۆش بوو ، ئیتروەكو سووره كوانێك زەردبوو .. دەربوو ، دەربوونێك بەملاو بەولادا ناوەڕۆك فیچقەیكردو پەلامیسكەی هاویشت .. ئیتر (ئەو) كرایەوەو كەوتە قسە ، لە (144) دێڕی ووردا باسیكەونو كائناتی كرد ، كەزۆربەیان بەهۆی ( لێك هەڵوەشانی ) ووشە بەسەر ووشەیەكی تردا ریزكراون ، یان ناوێك ناوێكی هاوچەشن ، شوێن شوێنێكیتر ، ژمارە حەوت چەندەها هاونرخی ژمارەییتر پەلكێش دەكەنو هەستی ناوەوەی دەكەوێتە جۆش و كلافە بەكلافە لەدەروونێكی برینداری بەگلەییو بەهاوار دێنەدەرەوە . قسەكان بریتین لە ڕەخنەو گومانو بێبڕواییو ئاواتی تەپیوو ، هەڵوێستی بەزینو ترسو تێكشكان .. پێشووتر كەلە رادیۆكانەوە هەوالو باسو خواستی ئەم دنیا جەنجالەی دەبیست بەناتەواوی دەریدەبڕینو تاقەتی ئارامگرتنی نەبوو ، تائێستگەكان تەواویان بكەن یان خۆی بیانگێڕیتەوە ، بەلام ئێستاوا بەتەواویو زیاتریش هەوالو باسو خواسەكانی دنیای تێكچڕژاوو جەنجال بەند بەندو بەبێ دەسكەنەو ریزكردن دەگێڕێتەوە ، ناوناوەش دەڵێ ( داپیرە كلكە قولێم بدەوە ) كە ئەمە مانای خۆماندووكردنی خۆڕاییو ( كەس لەكەس ناگاتو كەس نایەوێ لەكەس بكات ! ) .

گشت لەگشت وەكو هەجووی شاعیرێكی زمانتیژی جارانەو كۆتاییەكەی بەجرتێكی وەكو جرتەكەی نووسەر لەچیرۆكی ( رایسز لەخوێنیاندا دەگەڕێ ) دا بووایە گەلی بەجێ بوو . نووسەر فریای كەوتووە كەبڵێ ( ئەی لەشكری خەساوەكان بەس بخەسێنو مەخەسێن ) و لەدواییدا تووشی گرتنبێ لەلایەن پۆلیسانەوە . بەلام ئەم هەلوێستو كۆتاییەش كابرای قارەمان لەدیمەنی نالەباری سەلبیو بێمایەیی رزگارناكات لەكۆڕی تێكۆشانی شۆڕشگێڕیداو وەكو فؤاد قەرەداغی بۆی چووە : ( نەك هەر پالەوانێكی یاخیبووی لێدەرناچێ ، بەلكو كەسێكی سەرجەنجالی گۆشەگیری نەخۆشی

وەمردەچێت . )[22]

تەنانەت لە مەیدانی بیرو ئەندێشەش‌دا : « ئەوەی (ئەو) جیری لێ ئەکاتەوەو بەدەستی‌یەوە ئازار ئەکێشێ زۆر دوورە لە تەزرو ئەندێشە راستەقینەکانی خەڵکی چ لە وڵاتەکەی خۆی‌و چ لە جیهانیش‌دا »[23]

ئەگەر بەچاوی کوردایەتیشەوە سەیری قارەمانەکە بکەین‌نە لە رەنگ‌و سیماو هەڵس‌وکەوت‌دا ، نەلەبیرو زووربەی ئەندێشەکانی‌دا رەنگ‌و دروشمی کوردانەی تەواو روونی نییەو تیەتی‌یەکانی نەتەوایەتی لێ‌رەنگ ناداتەوە ، هەروەکو قەرداغی دەڵێ : ( پاڵەوانەکە وەك یەکێکی خەیاڵی ئەکەوێتە بەر وەك لەوەی کەسێکی واقیعی بێت لە وڵاتێکدا بژی‌و ئینتیمای نەتەوایەتی خۆی هەبێت )[24] .

هونەری چیرۆکنووسی‌ی « حسین عارف » وادیارە لەدەشتی ریالزمی بەپیت‌دا وەکو رووبارێکی خوڕ دێ ئاوەڕۆی خۆی بگۆڕێت تا بێ‌هێزی‌و لاوازیی سروشتی مرۆڤانە وێنە بکێشێت ، کەنەدەبوو بەرامبەر بەوجیهانە ئاڵۆزەو بەرامبەر بەو دیوارە بڵندو دەرگا پۆڵابەندانە لەجیاتی ( کردەوە ) تەنیا وڕێنەی لەدەست‌بێ‌و لەئەدەبەکەی‌دا وێنە بداتەوە ، قارەمانمان دەوێ نەك مرۆڤێکی قوربانی‌ی وڕێنەو دنیای ئاڵۆزو جەنجاڵ . بوریس بورسوف دەڵێ : « هونەر کاتێك کە وێنەی مرۆڤ بەخولقێنەر ناکێشێت‌و لەوێنەی قوربانی‌ی مێژوودا وێنەی دەگرێت ئەم هونەرە لەگەڵ سروشتی تایبەتی‌ی خۆیدا ناکۆکە » لەم دوونموونەیەدا ( کە لەبڕگەی سێ‌و چوارەمی ئەم وتارەدا باسمان کردن قارەمانە سروشت‌کردەکەی چیرۆکەکانی جارانی « حسین عارف » کە مندالە چەتوونە ، شۆڕشگێڕە بزیوەکە بەگیانی ساوایی پاك‌و بێ‌باکانە سەودای لەگەڵ جیهان دەکرد تووشی پاشاگەردانی‌و سەر لێ‌تێك چوونێك بوو کەواقیع ساغی کردەوە تاسەر نەبوو بەڵکو دەمدەمی بوو ، زادەی تاقی‌کردنەوەی شێوەکان‌و زۆر خوێندنەوەو ئاگاداری نووسەری بەرێز بوو بەسەر رێبازو رێژگەو روخسارپەروەرو تاکییەکانی رۆژاوادا ، ئیتر ئەویش کەرەخنەگرێکی هوشیارەو هەمیشە ئامادەیە بەخۆیدابچێتەوە ، پوختەی تێ‌ڕوانینە گەییوەکانی لەکتێبەکەیداو لەوتارەکەی دیداری یەکەمی چیرۆکی عیراقی‌دا دەدرەوشێتەوە چ بەدوور نەدەزانرا کەسەرومڕ قارەمانی ریالستی کاریگەرو بەکەڵك لەشێوازی نوێی ریالزمیدا پێشکێش بکات . ریالزمیش کە هەموو ژیان دەگرێتەوە ، ئێجگار پان‌وپۆڕو فراوانەو ماوەی نواندنی هەموو تەکنیکی هونەری‌و خۆکردیی نوێی تێدایە کە هونەرمەندی راستەقینە دەتوانێ ئیبداعی تێدا بکات ، هەروەکو چیرۆکنووسە ریالستەکانی ئاسیاو ئەمریکای لاتین‌و ئەفریقاو وڵاتانی سۆشیالست ئیبداعی تێدادەکەن‌و مایەی رێزلێگیراوی‌ی خوێندەوارانی جیهانن .

---

پەراوێزەکان :

(1) لێکۆڵینەوەو بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ـ عومەر بەرزنجی . ل 6161
(2) کلافەیەك زانی تووڕە ـ ل 83
(3) لە کۆڕی خەباتا ـ سلێمانی ـ 1969
(4) چیرۆکی هونەری کوردی ـ حسین عارف . ل ـ 162
(5) بڕوانە ( عمر عارف بەرزنجی ـ سەرچاوەی پێشوو ) هەروەها ( حسین عارف ـ چیرۆکی هونەری کوردی ) .
(6) کلافەیەك زانی تووڕە ـ ل 77
(7) دوژمنەکەی ملم قیتەڵ ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل 93
(8) لە کۆڕی خەباتا ـ حسین عارف . ل 17
(9) کلافەیەك ... ـ ل 97
(10) بۆ زێدە ئاگاداری بڕوانە ( الادب القصصي في العراق ) ل 46 بەولاوە .
(11,12) کلافەیەك ... ل 98
(13) هەمان سەرچاوە .. ل 96
(14) = = .. ل 101
(15) کلافەیەك ... ل 3
(16) چیرۆکەکانی مەم ـ بەغدا 1970 / ل 28
(17) گۆڤاری نووسەری کورد . ژمارە (8) ـ ل 43
(18) اللامعقول ـ ارنولد هنچلف ـ کۆڕینی بۆ عەرەبی د . عبدالواحد لؤلؤة ل 21
(19) سەرچاوەی پێشوو ـ ل 57
(20) کلافەیەك زانی تووڕە ـ ل 53
(21) نووسەری کورد ـ ژمارە « 8 » ـ ل 48
« 22, 23, 24 » گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە « 9 » ل 21 — 31 .
(25) الواقعية اليوم و ابداً ـ بغداد 1974 . ل 157 .

سەرنج :
ئەم ووتارە لە یەکەم دیداری چیرۆکی کوردیدا لە سەری‌ڕەش خوێندرایەوە ، کە یەکیەتی نووسەرانی کورد رێکی خستبوو .

د . نەسرین فەخري

# ووشەکانم

ووشەكانم تێك شكاون
پیتەكانیان لەسەر لێوم لێك ئاڵاون
لێویش لەگەڵ ووشەكاندا حەپەساوە
چەشنی خەوو خەیاڵی خۆم
هەموو وەك من
نازانن بۆچی ترساون
بۆ وەك گۆمی شڵەقاون
یان چۆن لەترس دەربازبین
بەس دەزانن كە ترساون
لەگۆمی ترسا خنكاون
داهێزراو وەك ئەندامی لەش
گشت شتێك سوور دێتە بەرچاو
سەرتاپا خەڵتاوی خوێناو
لەجێی گوڵاڵەو دەشتی گەش
هەر چاوێك ترس دەبارێنێت
هەر دەستێك دەرد دەورووژێنێت
هەر هەنگاوێك شاڵاوی مردنی پێیە
لەگەڵ تەقەی هەر دەرگایێك
دەڵێم كێیە ؟

دەڵێت منم مردوەو مردن لەباوەش
هیچ نابینم لە تاری بچێت بەولاوە
جار هەیە تا هاوار بكەم
هەست دەكەم دەنگم خنكاوە
دەڵێی دەنگم « بەكوڵەكەی ئاشاچووە »
یان دەنگم وەك خۆم تاساوە
هیچ شتێك دەنگی نەماوە
هیچ شتێك رەنگی نەماوە

دەنگ تەنیا دەنگی مردنە
رەنگ تەنیا رەنگی مردنە
گشت یەك دەنگن
گشت یەك رەنگن
هەمو دەنگێك
لەگەڵ رەنگێك
لەگۆمی ترسا نێژراون
یان چرپە دێت بەئاسپایی
بەڵام ناگات بە رۆشنایی
منیش ئەگەر بێ دەنگ دەبم
لەبێ دەنگیی خۆم دەترسم
گەر قسەم كرد
دامەوە وەڵامی پرسم
سەد جار دەڵێم
بیڵێم نەیڵێم
یان بۆ گوتم
لەغەڵبە غەڵب و دوو دڵی و
چاوو دەم و گوێی دەورو پشت
گەلێك پەستم
قسە خۆی دەكێشێتەوە
بەرەو زارم نوقم دەبن
پێ دەنێم بە جەرگی خۆمدا
ووشەكانم دەخنكێنم و دەخنكێم
بەرەو تەنیایی بۆی هەڵدێم
كاتێك كەخۆم دەگرمەوە
خۆم دەبینم حەپەساوی
دوو سەرە رێم
جێگەم هەیەو كەچی بێ جێم

« پەشیمانم لەتەوقی سەر
تا نووكی پێم »
لە هەموو شتێك دوو دڵم
هەر كارێك دەكەم هەست دەكەم
گورز لەملم
هەر شتێك دەستی بۆ دەبەم
دەبێت بە خۆڵ لە ناو پەلم
هەموو شتێك لە دەروونمدا ترساوە
لە شتێك بەشكم
كێ یارتە وكێیە دوژمن
كێ دۆستی گیانی بە گیانی
كێیە هەڵپەرست و لێخن
ئەم پرسیارە لەخۆم دەكەم
یان بەخۆم دەڵێم بۆچی بووم
یان كە بووم
بۆ ئەلێرە بووم
یان لەپەر چی بەم جۆرە بووم ؟
لەجیهانی فراواندا جێگە نەبوو
ئێرە نەبێت ؟
ئەوەی من دیم بۆكەس نەبوو
بۆمن دیم بۆ كەس نەبوو
بۆ من نەبێت ؟
بۆ هەر شتەی كەلێی ترسام
هاتە سەر رێم ؟ !
بۆ ووشەكانم ناتوانن
دەرببڕن چیم دەوێت بیڵێم ؟ !
بۆچ حەپەساو ؟ دۆش داماون ؟
وەكو بەختی خۆم رەنجاون

# رۆندك و خوين

- ياهو -

سپیده هەتا ئێڤاریٚ کاریٚ من هەر گریە
روندکا چاڤێت من خارن بهارا من بەهیيا
ودکی کوٚرا ل ڤیٚ جیهانیٚ ئەز د گەڕم بیٚ خودان
ـاخازا من خوزیا من بو شادیو روناهییا
هەڤالێت من دکەنن د بشکڤن ئەز دگریم
من ژی دڤێت بژیم ب شادیو خوش وەك هەمیا
بومە پیرەمێرەك پشت خار ب گوپالی د گەڕم
من بار نەما دڤیٚ جیهانیٚ خوٚش ژ من ڤەقەتییا
چار تغاریٚت گەنمی من کربونە عومبارەکیٚ
ـوهی ئەز چوم من سەحکریٚ ئەو ژی ل من رزییا
گوپالیٚ ئەز پیٚ دگەڕیێم یێ خلولەو پێتی بوی
ژ روژەکیٚ پتر نابیت ئەو ژی دیٚ بیت ژ شکەستییا
کاروانیٚ دەردو کوڤانا هدریێ خو نێزیك دکەت
ریکا گرتی بو جەرگیٚ من دا ل ناڤ ب بیتن خویا
نە روٚژەکیٚ نە هەیڤەکیٚ نە سالەکیٚ من نەدیت
ئەز دلشادم بەختیارم دژیم ب کەیفو خوٚشیا
دیٚ من سوتو کوزری دیٚ بیٚی بنگەهیٚ روژییە
ـل تێهنییٚ روژەکا ب کەیفو شاهی ل گەل زەریا

کی هەیە مەموی نەماف کەت روژا ژ زیندانیٚ دەرکەتی
چپکەکا خوینیٚ ژ دفنیٚ کەت بو مێڤانیٚ مرییا
ئەو ژنبابا بیٚ باوەرو گار ستوینو بیٚ بروا
بجادویٚت خوە سەد ئاغا شێتکرو بەردا چیا
چیمەنو مێرگێت زوزانا ئەز ژ واژی بیٚ بار بوم
ئەڤروکە د دویڤ گریٚیٚ دا خریکیم وەك زارویا
دەما گری ب دویماهی دئێت دبیت خریك خریکا من
چەند روندکا پاقژ دکەم شوینا وا دمینیت ل روییا
کیٚ دیتیە گولەکا تەڕ بیٚ ئەگەر بیٚتە شکاندن
کوڤانا من خڕ ئەڤەیە دلیٚ من ژ بەر هژییا
ژبن زوردار‌یا دەردیٚ گران سەربەستو پشت راست نەبووم
ژمن ڤەنابیت نە ب جەنگا نە ب گریٚ نە ب هیڤیا
لەشکەریٚ خو راکرو ب چەكو رەختو تڤەنگ
رهێت لەشیٚ من راوەستان زەرکرم وەك پێتوییا
هەر کولەکا دلیٚ من بیٚ گومان منەك تیٚ هەیە
جارەکیٚ دل سیار نەبو هەرما پەیا ل سەر پییا
لەرزکەك کەڤتە دلیٚ من وەك بومە لەرزا ل ئاخیٚ دبیت
دلو مێلاك سەرێك داچوون جەرگ ژی لگەل هەڕشیا
ئێشەك کەفتە هەردوو پیا من نەشیا گاڤەکیٚ ب چم
بێهن کورتکەکیٚ ئەز گرتم مینا پیرو ماندوییا
تایەکا سار دا من گریت ئان دا گەرم بیت ب خوهـ
خوهکا هویر لگەل روندکا دهاتە خوار لسەر رویا
بیٚدل قوقی بیٚرەنگ شوخی ل گرێکا ڤیٚ ژینیٚ
ئەو پاپورا من دایە ریٚ بنئاڤ بو خەندقێ ا
کاروانی چوونە کاروانا کوچەرا مال بارکر
کەتمە چیاو دارستانا بڕەنگیٚ هوڤو کویڤییا
گێتی ل من بو کونجا تاری مینا گوڕیٚ بیٚدەرگەهـ
ل ئەڤان چاخێت ستەمبار شێریٚ من نەشهییا
ئەڤ کاریٚ دڕندەیی ببەریٚ من هات کرم دلسوٚز
هوررەکیٚ بتوزو بابەلیسك ئەز ئێخستم تاریا
ئاخو ئاخ هەر دیٚ بێژم ئاخو ئاخ هەتا مرنیٚ
من چاڤ لرێکا دەرمانەکی لدلیٚ من ب بیت خویا
دلیٚ من هەر دگریت روندك روندك ژچاڤا دئێتە خوار
مامە دڤیٚ خرکومانیٚدا من بەر بەرە دا ل کێمییا

# داستانە

جەمال شارباژێری

1983 / 8 / 22

## بۆ هاوڕێ بچكۆلە دڵسوزە بێوەیەكەم   داستانی كچم ..

داستان . داستان

چیرۆكە كورتە باڵا كەم ..
شیعرە دورو .. درێژەكەم
پەخشانە ئاڵو واڵاكەم ..
ئەفسانە زۆر بەچێژەكەم

شانۆگەریە كۆمیدیو تراژیدی پێكەنینو گریانەكەم
گەرمیانەكەم . كوێستانەكەم
داستانەكەم

ئەم ئێوارەیە بە تەنیام
بێتۆ بێ تیشكو بێ كەڵكە ..
هەمو دنیام ..
بیرت ئەكەم .. بیركردنێكی خوا كردی
زۆر بەوردی
كە بەیانی بەجێم هێشتی ..
نوستبوی ماچم نەكردی .
نەوەك بە ئاگا بێیتەوەو ..
ماوەم نەدەی بچم بۆ كار
دوا نیوەڕۆش ئەركو ئێشك
بونبە بێگاری بەرپرسیار

ئەزانم ئێستا ئەزانم .. گوزار ئەكەی
لەدورەوە ریبوارەكان بژار ئەكەی
كەدەركەوتم مژدە بەری
بۆ - هاوراز - و بۆ - زریان - ی شێوە پەری
پەنجەی ناسك درێژ كەیتو بۆ لام راكەیت
باوەشی پڕ تاسەم پیاكەیت

داستان .. داستان

ئەڵقە پیرۆزەكەی دەستم
جگەر گۆشەكەی چوار گۆشەی دڵو هەستم
نیشتمانە بچكۆلەكەم ..
هاوڕێم ، جەرگم ، بەرخۆلەكەم
گەورەم كچە .. بچكۆلەكەم .
كوڕپەم داستان ..
دڵم . گیانم ، چاوم ، هەستم ، بێراوەستان
لەبیلبیلەی چاوی تۆدان
لەقژی كاڵو ئەبرۆتان
سروەو نازو پرشنگێكن ..
لەهەناسەو لەگفتو گۆو رەنگو بۆتان
لەدڵە بچكۆلە كەتان ..
لەدەمە ناسكۆلە كەتان
لە لاملو گۆناو چەناگەو سەر لێوتان
لەدەستو پەنجەی نەرمیلەو ..
خنجیلەو ..
توڕەو بزێوتان
شەپۆلەكەم ...
كچم پەپولەم . چۆلەكەم ..
هەیپەرە سێلكەم . كۆترم ..
یەكەم قوتابی پۆلەكەم ..
خۆتۆ تازە سیو سێ مانگی ..
بێ ناو بانگی ..
من چوار سەدو هەشتاو سێ مانگ خەم ڕێژترم
دەزوی تەمەن ئاڵۆزاوو درێژترم
بەقەد جیهان سزاو ئەندێشە چێژ ترم

كەچی هەرچی تۆ بیفەرموی سەر لەرێتام
رووكەشو ناوەرۆكتم
بەندەیەكی لەش سوكم بۆت لەبەرپێتام
گەورەتمو بچووكتم .

مەسعود حسین بو تانی
1983 / 6 / 7

« دیاری‌یە بو گوڕی کەرێت سنەو مهابادێ »

# گوری کەرێت وەلاتێ من

وەلاتێ من
بلا ژتە رابیم گوڕێ
هەر نالینەك دەركەڤیتن
ژ دەڤێ من
هەر چیكەكا بێتە دێتن
ژ خوینا من
هەر پرتەكا بێت هاڤێتن
ژ لەشێ من
گوڕی كەرەكێ بهێزە
دێ رابن و بنە ریزە
كەنە هەوار
كەنە گازی
ژ دەنگێ من
دارو بەرێت وەلاتێ من
گوڕی كەرن
بگوڕی كرنا ئەوان هەمیان
هەل دبن چرا
دوژمن دڕەڤن
ژ وەلاتێ من
ژ وەلاتێ من

* *

ژ بەر ڤیریا
گوریكەرێت تە وەلاتو
چیا هەژیان
ژ ئەسمانێ دویرو بلند
ستێر ژێ ڕژیان
ڕەڤی دوژمن
كوم و كومەل
خڕ ژێگ بژیان
وەلاتێ من وەلاتو
بخوین ریتنێ
شین دبیت ژیان
بگوڕی كرنێ
ئازادی دبیتە
خودان ژڤان
وەلاتەكێ بتنێ مابیت
ب ئێكەتیێ دێ بیت ئاڤا
هەر گەهتە ئارمانج و مافا

* *

گوری كەرێت تە وەلاتو
نە خولپەكا خلوپەیە
هەچی كەسەكێ دەست دانێ
دێ ڤریێتن
نە دیوارێ لە سەر بەفرێیە
هەچی كەسەكێ پالدانێ
هەرڤیتن
نە ئەڤینداڕەكا بێ‌سوزو پەیمانە
چ بەكروكەكێ ئاخافت
سەرداچیت و لێ ڤەبیتن
وەلاتێ من
گوڕی كەرێت تەنە ئەڤرو
رەهـ و ریشال برینە خار
كرینە ئێك هەر چار كنار
ژبو ئێكەتیا وەلاتێ
هەمیا خوخار .... هەمیا خوخار
دیوارەكێ شەنگستە باش
چتوڤ دیوار
پێلێت دوژمن و نەیارا
لێبن پالە
رەخەك بتنێ ناهێتە خار
ئەڤیندارەكا خودان پەیمانە
چ شەنگە زەریا گوندێ‌مە
ئەڤینێ دلێ وێ‌خار
وانا دبێژتێ روژێ سێ‌جار
روژێ چار جار
دابگەهنە وی ئەڤینداری
خود ریكا وێ‌دا
كرییە ژار
هەر دوو پێكڤەو
ئەم خڕ پێكڤە
خو گوڕی ئاخا خو بكەین
داماڤێ خوو ئازادیێ
پلاڤێژینە ئەسمانا
ژوردا ل وەلاتێ مە باریت
ئو بێتە خار ........ ئو بێتە خار

# لەخەو

(پەروا)

دوێنێ شەوێ ...
کاتێ هەموو شت ئەسرەوێ
لەخەومدا بوو بە « گاور » !..[1]
سزام ... بسووتێ بە « ئاور » ..[2]
دەستو پێیان قایم بەستم
بۆ « کەنیسە » یان رابردم ..!
بەخاچێکا هەڵیان واسیم...
لەبەر خۆر هەتا ماسیم ...[3]
خەڵکی وایان « لێ‌ئەناسیم » ...[4]
ئەمن عیسام ...
پێغەمبەرە گەورەکەی خوام
ئەزمەسیحم
هەق پەرستو راستی ویستم
رابەری چەوساوەکانم
هەل کەوتووی ئاخر زەمانم ..!
منیش خۆم واهاتە بەر چاو ؟
هەتا هەتا بوومە « هەتاو » .. !
بۆ مرۆڤی سەر رووی زەمین
تیشکم ئەروا
بەهەموو کونو قوژبنا
بەتاو وتین .. !
کاتێ کەخەبەر بوومەوە ...
بەهۆشی خۆمدا چوومەوە .. !
گەرمای ژوری کپو تاریك
بەجۆگەلەی باریك باریك
وەکو گەرماو ..[5]
خۆمو نوێنی کرد بوو بەئاو ...[6]

تومەز کارەبا نەماوە
پانکە ووزەی لێبراوە ...[7]

1 — گاور : کافر
2 — ئاور : ئاگر
3 — ماسیم : ئاوسام
4 — لێ ئەناسیم : لێ ئەزانیم
5 — گەرماو : حمام
6 — نوێن : پێخەف : یقتاغ
7 — وزە : تاقە : طاقة

---

## دیاری بۆ گۆڤاری کاروان

•

مەلا کچکە - شقلاوە

•

لەگەڵ قاسپە قاسپی کەوی
نازداری گەردن بەخاڵ
لەگەڵ ئاوازی شالوری
بۆ تاقە گوڵی عەودالْ
لەگەڵ حەیرانی ڕێبوارو
شوانەکانی دەم بە شمشالْ
لەگەڵ هارەی گۆبەرۆکی
کیژی کۆچەری بن رەشمالْ
لەگەڵ داری شۆرەبی و گوێز
کەسەما ئەکەن بە شەمالْ
لەگەڵ بریقەی بەفرەکان

# شیعر بۆ منالان

**محمەد بەدری**

مناڵەکان
پەپولە رەنگاو رەنگەکانی بێگەردی
باغچەی ژیان ..
هەبوو .. نەبوو

پیرەمێردێکی زۆر زانی بە ساڵا چوو
حەوت کوڕی بوو ..
حەزی ئەکرد ئەم کوڕانە
گەورە ببن ..
زیرەك و ئازاو یەك ببن ..
ساڵ و دەیان ساڵ بەسەرچوو
دونیا وەك خۆی نەما .. تێکچوو ..
ئەو پیرەمێردە زانایە
ئەو میرخاسە بە ئاگایە
کوڕەکانی کۆکردەوە
داریان بەسەردا دابەش کرد
ئەو پارچە دارە بشکێنن
دوو کەرتی کەن واز نەهێنن "

لە ئەنجاما
ئەو کوڕانە بە ئاسانی ، دلێرانە
دارەکانیان خێرا شکاند
پەردەی بێدەنگیان دراند
ئنجا باوکە
حەوت داریتر پێکەوە بەست
ویستی روونکا هەمان مەبەست
وتی : هەر یەکێك لە ئێوە
کە بە باڵادا وەك دێوە
ئەبێ ئەم دارە بشکێنێ
بە هیچ جۆرێك واز نەهێنێ
کوڕەکانی هەرچەندیان کرد
ئەم لایان کرد ، ئەو لایان کرد
داریان نە شکاند
باوکە وتی :
رۆڵەکانم ئێوەش وەکو ئەم دارانەن
گیروودەی دەستی زەمانەن
گەر یەك بگرن ، یەك دڵ ، یەك دەست
زوو ئەگەنە هیواو مەبەست ..

---

کەوا جێماوە لە دەمیال
لەگەڵ لەنجەی نازدارانی
کە لە کانی ئەچنەوە ماڵ
لەگەڵ جوانانی بێ گەردی
رومەت خرو چاو مەست و کاڵ
لەگەڵ گوڵی گەش و بۆن خۆش
لەزەردو سورو ، مۆرو ئاڵ
لەگەڵ خەندەی کۆرپەی ساوا
کەوا کەوتۆتە گرووگاڵ
لەگەڵ شاعیری دلداری
دەرونی پڕ جورە خەیاڵ

گەرمترین رێزو سلاو
لەناخی دەرون هەلقولاو
زۆر گەرمتر لەو دەرونەی
بۆ تاقە یاری سووتاو
رازاوەتر لەو بووکەیە
بۆ زاواکەی دیارکراو
لە ناو قوولایی بیرو رام
ئەم هەمو شوێنانە گەرام

بیکەم بەدیاریەکی جوان
پێشکەشی گوفاری کاروان !!

---

● عومەر فارس محەمەد ●

# شیعرێکی میرزا خەلیل منەوەر

کە تازە خولیای حەز بە شیعر کردنم کەوبتووە دڵ ، هەموو جارێ بە خزمەت وەستا سەعید دەگەیشتم و بە دیداری شاد دەبووم ، « ئەو وەستا سەعیدەی کە کاتی خۆی بەرگ دروو بوو ، مرۆڤێك بوو هەر لە سەرەتای ژیانیەوە رووبە رووی جۆرەها دەردی سەری و ئازارو ئەشکنجەی رۆژگار بۆتەوەو ئەو ئەزیەت و ئازارەش گەلێجار تەنگی پێ هەڵچینوە تاوەکو دواجار لە ساڵی ١٩٦٩ دا چاوەکانی پەکیان کەوت ، ئەگەرچی چەند جارێکیش هەوڵی چارەسەرکردنیانی داو دوو سێ جاریش عەمەلیاتی کردن بەلام مەخابن بێ ئەنجام بوو ، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لەنێو چوار دیواری ماڵەوە بەند بێت تا لە شەوی 22 — 23/7/1977 دا کۆچی دوایی کرد .

زۆر جاران دەچوومە لایی و شیعرم بۆ دەخوێندەوە ، جاری وا هەبوو کە ماندوو دەبوو دەیفەرموو « وازم لێبینە با بۆ شەوێکی تر بێت » .

ئەو مرۆڤە ئەمرە شارەزاییەکی چاکی لە بارەی شیعرەکەی « میرزا خەلیل منەوەرەوە » جا ، هەر بۆ ئەوەی ئەم شاکارەیش وەکو دەیان شاکاریتر لە مردن و بزربوون بپارێزرێت وام بە پەسند زانی کە تۆماری بکەم و لای خۆم بیپارێزم .. ئیتر دوای ئەوەی تۆمارم کرد ، پاکنووسم کردەوەو ناردم بۆ گۆڤاری « رۆژی کوردستان » و لەوێ مایەوە تاوەکو ساڵی 1974 هەر بڵاو نەکرایەوەو رووناکایی یەکیشم لە بارەیەوە دەستگیر نەبوو ..

دووای ئەوە ساڵی 1976 دووبارە تۆمارم کردەوە بە نیازی ئەوەی کە ئەمجارەیان هەڵێکم بۆ هەڵکەوێ و لە شوێنێکدا بڵاوی بکەمەوەو وەکو دیارییەکی خنجیلانە پێشکەش خوێندەوارانی کوردی بکەم ..

شایانی باسیشە کە مامۆستای بەرێز « مستەفا نەریمان » لە ژمارە « 16 » ی ساڵی (1974) ی گۆڤاری « بەیان » دا باسێکی بڵاوکردەوە دەربارەی « میرزا خەلیل منەوەر » و بەشێکیشی لەم شیعرە لەگەڵدا بڵاوکردەوە ، منیش لەبەر گرینگی بابەتەکە وا دەقی شیعرەکە بە تەواوەتی لەسەر لاپەرەکانی گۆڤاری « کاروان » دا ، دەخەمە بەردەست خوێندەوارانی ئازیز بە هیوای ئەوەی کە بە زیندوویی بمێنێتەوە .

دوا سەرنجیشم کە دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە ، دوای سۆراخ کردنێکی زۆر ئەوەم بۆ ساخ بووەوە کە ئەم رووداوە لە ساڵی « 1903—1904 » دا رووی داوە .

لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم بە پێی توانا بەشدارییەك بکەم لە خزمەتکردنی و پاراستنی کەلەپووری نەتەوەکەماندا ..

کوێخا چەن چاوش کوێخا چەن چاوش
ئەمرۆ دیم وەچاو پەنج و شەش چاوش

تیپێ وەحەرا تیپێ وەخاموش
گلێم و جاجم گریتوون وەباوش

تیپێ لەدوما یەك تیپ لەبەر
تیپێ پیادە تیپێ سوار کەر

واتم قەومەکان بۆ چ غەمبارن
ئەشریف سەفەری رێی کفری شارن[1]

واتم قەومەکان نیەن دەماغتان
چمان شەوینکەر .. نیشتەن لەباغتان
واتشان میرزا .. شوعەرای زەمان
دادمان جە دەست ( کوێخا ئەورەحمان )[2]
لەی وەختە لێمان بیەن وەوورك
پەقەمان گرتەن وێنەی تووترك
وەحوکم جەبری دڵمان تەنگ کەرد
لێمان ئیدیعای ئەخز تفەنگ کەرد
ئیشت وەی وەختە خۆتان قەردارکەن
تفەنگ ناسێنن لە ( کادێز ) بارکەن[3]

ئینجار نیشانەی بەخت رەشمانە
بۆیە لەی رێگا پەنج و شەشمانە
ئیتر نازانین چ خاك وەسەرکەین
دەست وەرووی دامان کام رەنج بێوەرکەین
هەناسە ساردین ئەمجار بۆ دڵ بەرد
ئێستەکێ پێمان مەدەر وەدەس قەرد
پە چەند وەختێکە ( سوور ) و مووورنی یە[4]
تەلە نزیك و نە لە دوور نی یە
سەگ حاڵی لە حاڵ ئێمە خۆشترە
ئیشمان لە بەڵم ، کا جۆ بۆشترە

ـەمی هاومالْی ، بێ خەرجی پارە
ـەوت لایەمووت ئەکەین ئیدارە
ـەگەر بار نەکەین ئەوین وەبەدنام
ـەویسن وەریش فەرد واتەی خاس و عام
ـەگەر بار نەکەین بنیشین بێ دەنگ
ـەرمان نی یە بیدەین وەتفەنگ
ـەی تەورە ئێمە گشت سەر گەردانین
عەرق پەژارەی بەحر دەردانین
حۆ توو ئەزانی ئێمە ( دەلۆ ) نین[5]
حەبەردار لە کار ئەی تانوو پۆنین
ـە ( تالەبانی ) لە عام مەشهوورین[6]
ـە ( زەنگنە ) نە ( جاف ) نەخوود
جبوورین )[7] [8] [9]
ـە ( دۆم ) نە ( تورکمان ) نەخوود
بەیاتین )[10] [11] [12]
بی دەنگ و بێ سەنگ لە کادێز ماتین
نەجەهەنمی نە خود جەنەتی
نە لەرەحمەتی نە لە نەعلەتی
چاوەش فەقیر سەرو پاپەتی
مسکین ، مەزلووم ، هەفتامیللەتی
سەرو کەرمان فەس ئەڕای ڕۆز تەنگ
بیدەین وەلێرە بۆ پارەی تفەنگ
لێرە لە بازار کفری وورد یکەین
جا تاو ستانان ( قرچە ) گرد یکەین[13]
باذارمان کەساس سەرمایە سەنگەن
زوڕنامان فیشەك ، دهۆڵ تفەنگەن
( سمایل ) وەت ! خەلیل گوشدەر وەحالم[14]
ئەی تەنیا کلیم یەسی ناو مالْم
ئەیە سەرنداز ژێرو بانم بێ
دۆشەك و وێرغان زمستانم بی
هەمی پەری چێش دلْم نە بۆ تەنگ
بەمەی وە کفری دەمەی وەتفەنگ
کێ قبوولْ ئەکات ئەی زولْم عەزیم
ئانجاخ هەر بکا دووقەران و نیم

منالەکان بمرێ با لە سەرما بێ
دادمان لە دەس کۆخای ئاوایی بێ
لە زەرب سەرما پشتیان بۆت ڕەق
ئەلْبەت دۆعایان گەت وەقاپی حەق
کافر نەوینۆم وەی حالْە حەزین
ئیمان ئیسلام مەکە رۆ تەلْقین
تا ئیستا ئەی دەنگ نەمان وەرپێمان
هیچ کەس ئەی زولْە نەکردەن پێمان
چاوش فەقیر (دلانچی) زەلیل[15]
یەکەی مروەتەن ئەی میرزا
یە ، کەی خوداوەند حەیی لامەکان
حەقمان ئەسێنێ لە عەبدولرەحمان
وەشکارتەی خدر ئەلیاسم بکە
لەدەس ئەی زولْە خەلاسم بکە
(سالْەح) وەت چی بکەم نی یەن عیلاجم[16]
دارەم لە حەرەم سێ کۆنە جاجم
وەزات یەزدان پادشای کەریم
هەریە کێ ناگات دووقران و نیم
چلْکن و کولْکن پیس و پەلاسە
بێ قەدرو قیمەت بۆ یەتك خاسە
لە ترس کۆخا پەی نامووس تەنگ
هاوردەم وەشار بەمەی وەتفەنگ
منالەکان بمرێ یا لە سەرما بێ
دادمان لەدەس کۆخای ئاوایی بێ
لە زەرب سەرما پشتیان یۆت ڕەق
ئەلْبەت دۆعایان گەت وەقاپی حەق
کافر نەوینۆم وەی حالْە حەزین
ئیمان ئیسلام مەکە رۆ تەلْقین
تا ئیستا ئەی ڕەنگ نەمان وەرپێمان
هیچ کەس ئەی ژولْە نەکردەن پێمان
چاوش فەقیر دلانچی زەلیل
یە ، کەی مروەتەن ئەی میرزا خەلیل
ئەلْبەت خوداوەند حەیی لامەکان
حەقمان ئەسنێ لە عەبدولرەحمان
وەشکارتەی خدر ئەلیاسم بکە

لەدەس ئەی زولْە خەلاسم بکە
( دەروێش عەزیز ) وەت ئەی یار غەمبار[17]
دارەم لەدونیا سێ یژن و سێ کار
لە ترس کۆخا پەی نامووس نەنگ
هاوردەم وەشار بەمەی وە تفەنگ
دامەیان وە بەر وە چارو ناچار
مالْ و منالْم کردن شین و زار
کەفتن وەشوێنم وەباوە دەخیل
هەتاوە ئاسیاو ئاو ( حاجی خەلیل )[18]
تو بزن ئەوەی ئەیفرۆشی لە شار
ئێمە لە بێ دۆ ئەوین دەغەزار
وەئاەو زاری خاك کردن وەسەر
زایەلْە و قوغان چون ڕۆژ مەحشەر
باوە سێ بزن شیرو ڕۆ نمانە
لەم تاوستانە دەم و دۆمانە
عەوێشەی ناسکی ئالْتوون و ئینجی
وەك بەچکە بەراز لە ناو کونجی
واتم ئەی ڕولْە بچن وە دوما
وافایدەی نی یە شین و واوەیك
با بۆت وەقوربان کۆخای دەلۆبێ
با ئێوە بمرن هەر خۆی تێر دۆ بێ
لەی تاوستانە دەممان بۆت ڕەق
ئەلبەت دۆ عامان گەت وەقاپی حەق
کافر نەوینۆم وەی حالْە حەزین
ئیمان ئیسلام مەکە رۆ تەلْقین
تائیستا ئەی دەنگ نەمان وەرێمان
هیچ کەس ئەی زولْە نەکردەن پێمان
چاوش فەقیر دلانچی زەلیك
یە ، کەی مروەتەن ئەی میزا خەلیل
ئەلْبەت خوداوەند حەیی لامەکان
حەقمان ئەسێنێ لە عەبدو لرەحمان
وەشکارتەی خدر ئەلیاسم بکە
لە دەس ئەی ژولْە خەلاسم یکە
( سالْەی سەعید ) وەت ساجێب کە شکۆلْم[19]
من هیچ شك نابەم غەیرەس دهۆلْم

چەنی یەك زوڕنای خەنجەر پشتم
سەبەب وەرزق ، هەم خەرجی مشتم
الحكم لله واحد القهار
هەراجیان ئەكەم ئەمرۆ لە بازار
من خولك كۆخا ناوە رۆم وەتەنگ
هەردو ئەفرۆشم بۆ پارەی تفەنگ
ئەمما ئەترسم هیچ كەس نەیسێنێ
وەك گۆشت گەنیو بۆ خۆم بمێنێ
( كازم ) وەت هەسم ماكەرێ وەفاڵ[20]
خواردك و خەفتك چوار پەلی خڕ ، ناڵ
رەفیق هامڕاز رێگەی چۆڵە
حەماڵ زوڕناو هەم دهۆڵە
لە جاگەی ( ئاسیاو ) موڵك و باغمە[21]
هەمینە جاغ و سیكە جاغمە
لە ترس كۆخا پەی ناموس نەنگ
هاوردەم وەشار بەمەی وەتفەنگ
دهۆڵ هەڵگرم پشتم بوبێ رێژ
داد بۆ جەباب حەی بێ ئەندێش
لە قورسی دهۆڵ ناوشانم بۆت شەق
ئەڵبەت دوعای من گەت وەقاپی حەق
ئەڵیەت خوداوەند مەیی لامەكان
حەقمان ئەسێنێ لە عەبدولرەحمان
وەشكارتەی خدر ئەلیاسم یكە
لە دەس ئەی زوڵە خەلاسم بكە
واتم ئەی یاران بەس یكەن فوغان
من ئەچم وەلای كۆخا ئەورەحمان
بێ دەنگ بن ئیتر دڵتان نەبۆ تەنگ
خەلاستان ئەكەم نەسێنن تفەنگ
بەلام بەشەرتێ حال داشم بكەن
لەشایی توركمان ( شاباشم ) یكەن[22]
واتشان خەلیل قۆچ قوربانم
هەرچی تۆ باچی بەندە فەرمانم
هەرچی تۆ باچی قەبوڵ مەكەرین
ئەمرۆ فەرمانت بە جا ماوەریم
خزمەت كارەتین وەڕووی ئیلتیجا

فەقەت پەی ئێمە خاس بكە رجا
واتم بنیشن ئیتر مەخرۆشن
هەتا من نەتێم ئەشیا مەفرۆشن
دەردەم پەرێزام خودام كرد وەیاد
چووم وەلای كۆخاوە دادوێی داد
جە تەقدیر حەق كۆخا لەشار بی
دەرد چاو شێل ئەو رۆژ تیمار بی
لوام بە خزمەت كۆخای پڕ نەسەب
سەلامێ كردم بەرەسمی ئەدەب
عەلەیك دا جەواب كۆخای پڕ فەهام
قیام كرد فەرمابەونیش جەلام
نیشتم لە خزمەت مەرد ئەحبا
كردش تەوازع لوتف و مەرحەبا
واتش چ خەیرەن ئەی میرزا خەلێك
ئەی تەشریف توونی‌یەن بێ دەلیل
واتم ئەی كۆخا حەقدار فەرزم
مەقسود داروون گوشدەر وەعەرزم
دەست تەعەددات ئاوردەن وەتەنگ
بە زۆر بە چاوش ئەسێنێ تفەنگ
ئەی زوڵم و زۆرە كێ ئەكا قبووڵ
نەجاتت بدا خودا و هەم ڕەسووڵ
كێ چاوش دی‌یە وەتفەنگەوە
شێرانە بچێ وەڕووی جەنگەوە
كێ چاوش دی‌یە وەسەنگەرەوە
لە رۆژ مەیدان وەخەنجەرەوە
كێ چاوش دی‌یە وەسلاحداری
لە رۆژ مەیدان خەنجەر گوزاری
كێ چاوش دی‌یە كۆ وەپاشەوە
چاوش شێرانەیە وەشاباشەوە
چاوەڕێی قروش شایی فەراشن
وەتەمای خۆراك مل و مۆی ئاشن
بۆ خەرجی شایی دەروون چوون قاوون
چاوەڕێی لوقمەی ترشی و پلاوون
تفەنگ دەستشان تەحقیق دهۆڵەن
كەرمانیشان لە ڕاگەی چۆڵن

خەنجەر قەدیشان زوڕنا چون سیكەن
گەر فیشەكشیان هەم ووردە پیكەن
تەمەڵو ( لوتی ) دەور زەمانە[23]
كێ لوتی دی‌یە وەجبەخانە
ئومێدم ئێدەن عافیان بكەی
یازوغەن تالان سافیان یكەی
چون ئەوان وەمن كردن ئیلتیجا
منیش وەجەناب تۆ مەكەم رجا
رجای من ئێدەن دڵت نەبۆ تەنگ
مەسنە لێشان قوەو زۆر تفەنگ
هاوأرم وەتۆ عەرزو ئیستێدعام
الامر منكم باقی والسلام
كۆخا وات چونكە مەكەی ئیلتیجا
پەیی چاو شێل تۆ مەكەی رجا
نیازم ئێدبی سافیان بكەم
بەلام ئەی دەفعە عافیان ئەكەم
ئەر چاوش غەددار ئەگەر زەلیل بۆ
عافشان خاتر میرزاخەلیل بۆ
ئامام وەگوفتار واتم ئەی كۆخا
خەلاتم كردی دوعابای ( چۆخا )[24]
ئافەرین بۆ تۆ هەزار ماشەللا
حاتەم سانی سەد جەزاكە الله
عومر تۆ شاد بۆ فەرحەت طەویل بۆ
دۆستانت دڵشاد عەدوت زەلیل بۆ
یاڵ جوبرەئیل سایەیانت بۆ
( انافتحنا ) وە قەڵفانت بۆ
( یوماً فیوماً ) ڕوتبەت زیاد بۆ
دوشمنت وە بەرق بەلا بەر باد بۆ
نەوینی زەرەر جە دونیای فانی
برانی فەرمان وەكامەرانی
دوعام كرد وەزات كۆخای زەمانی
واتم یمانی وەشادماتی
ئامام وەدووما من وەخەندانی
واتم چاو شێل بدن مزگانی
نەخۆش بین دەرمان شافتان كردم

ـ چەلای كۆخا عافتان كردم
...................[25]
.....................
ـەنگ پەیەكێ چەكەس نەترسۆ
ـەحوال شایی توركمان نەپرسۆ
ـو ـریك و خەفتك سێوەران سەنگ
ـێ ئێوە دێیە لە مەیدان جەنگ
ـە ـنو ئێوەدا هەر كازم خاسە
ـسوار ماكەرە سەر وەقەراسە
ـسەكەر كوڕی چوارپەلی ناڵكەن
هێمان شەو ماوە شەلنە بەتاڵكەن
ـشەلتەكەت بێرە بینە وەبەرم
ـوكان فرسەت وە (....) كەرم
ـشەلتەكەت بێرە بینێم وەیانی
ـمەت وەمتكووب بەوول (   ) ی
وەزیرەی زوڕنای مونیرتان قەسەم
وەشاباش مەنسور حەزنیتان قەسەم
وەی ماڵ و غارات چوڵتان قەسەم
وەی سەدای دهوڵ سوبحتان قەسەم
هەر ئێوە ئێمداد پشت ( كاریز ) ن
ـە قەزاو بەلای دونیا پارێزن

( گلالی ) بوینێ چاوش وەتفەنگ
ئێتر را ئەكات فرسەنگ وەفرسەنگ
كاولی لە لاتان زۆر وەحەیایە
گەر ئێوە دۆم بن خەیر خودایە
ئەرچوون قەرەچیان خەیلێ خاسترە
وەك بێژنگ كەربان وەسواس ترە
كۆخا وازبێرە عافیان بكە
مأمور مەیدان (چاف) یان بكە
ئەو رۆژ كە بلیای جەنگ شێران بۆ
ناڵەی ماتلی و دەنگ دلێران بۆ
(دەلو) و (گلالی) لەمەیدان جەم بۆ
با لەرووی و مەیدان چاو شێل كەم بۆ
گشتشیان جەم كەر وێنەی تیپ قاز
هەر دهوڵ لێدەن وێنەی تەپڵ بار
بدەن لە دهوڵ لە مەیدان شەر
سەر خۆش وەشێران لە ناو سەنگەر
وەژە مژە مەی حەرب یدەران كونس
دەروون چوون ئاتەش هەوا ئابەنووس
خرۆش (دەلو) بدەران پەی چەنگ
عامنشان بكە نەسێنن تفەنگ
تایەفەی چاوش لەدەور ئەیام

بێ باكن لە خەرج و ێرگی هەم نێژام
ژات شاهاتە عافشان كەردەن
ئەمەتوع نادەن تاوەرۆژ مردەن
تەفەروج میری موڵكانە
ئەسوبح روبح ناپۆی زەمانە
ئەرەسم ئەغنام جەزای سەرانە
ئەشەخسیەت شەر ئاخز كەرانە
بێ خۆف دیاكن لەخەرج میری
هەر لەیەك ساڵی تا وەرۆژ پیری
عافن مە عافن سفرن سەلیسن
وەك گای مووسایی خۆشیان مەلیسن
لەكونیەی نفووس تەسكەرەی عەسكەر
قەید نیەن سفرن چاوش لە دەفتەر
كەسێ كە لە قەید سوڵتانی نە بۆ
خەرج بدەی دەوڵەت عوسمانی نەبۆ
خار جەل میللەت رووی سەر زەمین بۆ
كێ بۆ چەمیشان وەهام قەرین بۆ
ئەگەر بیاوان وە رووتبەی شاهی
هەرهان لە خەیاك شەوق گەداهی
كاتب الحروف میرزا خلیلم
پەی غەدر چاوش یەكجار زەلیلم

## پەداومێزەكان

1) كفری ـ قەزایەكی سەر بە پارێزگای (دیالی) یەو كەوتۆتە نیوان هەردو پارێزگای ( تأیم ـ دیالی ) ەوە لەسەر چەمی ( قووشە چاپان ) .
2) كۆخا ئەورەحمان ـ سەرۆك عەشیرەتی (دەلۆ) بووە لە ناوچەی كفری دووای خۆیشی ( حاجی محەمەد ) ی كوڕی بوو بەجێ نشێنی تا لەم ساڵانەی دووایشا ئەویش كۆچی دووا یی كردو چەندنەوەیەكی لێ بەجێماوە . ئەوانیش هەربەدەم چەرمووی عەشیرەتەكە لەقەڵەم ئەدرێن
3) كاریز ـ دێیەكە 11 ـ كم لە شاری كفری‌یەوە دووره شوێنی نیشتە جێی كۆخا ئەورحمان و چاوشەكانیشە .. تائێستاش ئەوەكانی هەردوولا هەر لەودێ ماونەتەوە .
4) سوور ـ شایی
5) (6) (7) (8) ـ مەبەست لە عەشیرەتە كوردەكانی نیشتە جێی گەرمیانە .
10) دۆم ـ تیرەیەكن زوربەیان ئەچنە سەر ـ عەشیرەتی (جاف) بەكلاش دوورین بە ناویانگ كوردواتەنی ( دۆم بێ و كلاش بۆ خۆی بچنێ )
9) (12) دوو عەشیرەتی عەرەبن لەخوار كفری یەوە نیشتە جێن
13) قرچە : مەبەست لەو ووردەكایە كە دووای دروێنە كردن لە زووی‌یا ئەمێنیەوە .. خاوەن دەغل و ازی لێ دێنێ .
(14) (16) (17) (19) (20) ناوی چاوشەكانەكە خەلیل منەووەر چاوی پێ‌یان كەوتووە .
(15) دلانجی ـ بەزمانی توركی بەماناتی ( سوالكەر درۆزەكەر ) بەكاردێت
(18) ئاسیاویكە لەخوار شارەوەبوو بەلام لەبەر گەورە بوونی شار ئاسیاوەكە تێك دراو شوینەكەی كرایەخانوو .
(21) ئاسیاو ـ لەبنەرەتا ( ئاشی ـ ئاوە ) واتە ئەوئاشەی كە ئاو ئەیگێرێت و گەنجی لێ ئەهاڕدرێ تا دەبێت بەئارد پاشان ووشەكە كورت كراوەتەوەو بووە بە ئاسیاو .
(22) شاباش ـ جۆرە پیاهەڵدانیكە كە چاوش لەكاتی هەلپەركێ دا بەئەوكەسەدا هەلئەدا كە پارەی بداتێ بو نموونە شاباش لە كیسەی .. ماڵی ئاوا )
(23) لۆتی ـ بە شایە ز ئەووترێ . ئەو كەسەی كە كوڵان یە كۆڵان ئەگەڕێ و گۆرانی ئەلیت تا خەلكی پارەی بدونی
(24) چۆخا ـ جۆرە عابایەكی پیاوانەیە كە شیخ سەركردەی عەشیرەتەكان لە ناوچەی گەرمیاندا ئەیكەنە شان پەراوێزەكانی بەسیمی زەرد ئەچنرێت ( لەكەلەپووری عەروبەوە وەرگیراوە ) .
(25) ئەودێرە شیعرەم بۆ نەخوێژایەوە زۆر تیكەڵ نووسرابوو .

جیهان جیرۆک

# پیاوەکەی ویستی بدوێ

له ئۆتۆمبیل دابەزی ، بارانێکی توندو بایەکی ووشك چنگی له ڕووخساری گیرکرد . گوێی نەدایە باران‌و بایەکە . بەشێوەیەکی نائاسایی تێی تەقاند ، خۆی گەیاندە ناو قەرەبالغی یەکە . لەگەڵ ئەوانەی لەهەڵبەزو دابەزین دابوون تێك قژقژا ، چەند جارێ کەوتە خوارێ‌و هەستایەوە قوڕو چلپاو ئەم دیوو ئەودیوی لەشی سواغ‌دا . له خۆڕەپێش کردن پەشیمان نەبووە . ئۆتۆمبێلێ پڕبوو . ئەم‌و چەندانێکی دی بەریان نەکەوت . کشانەوە دواوە تاشەوێکی دوورو درێژ نیئۆکی چاوەڕوانی ناخیان هەڵکۆڵی . بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت ، بەوەی تەنیشتی گوت :

- ( بەدەی تریش ناگوێزرێنەوە ، دەی چی بڵێ بیست ؟ )

چاوی ئاراستەی تارمەکەی ئەودیو جادەکە کرد . ڕووناکی گڵۆپێکی کز فعناتیس‌ئاسا پەلکێشی کرد . قاچی دانایە سەر جادەکە ، شڵپەی گۆمە ئاوێك هات ، تاگەیشتە جێ چەند جارێ بەپێلاوەوە کەوتە ناو چەند گۆمە ئاوێکی ڕاوەستاو . شانێ لەو شانێ لەم . بەمات‌و بێ دەنگی خۆی لەنێوان دوو ئەفەندی پەستا . ئەفەندیەکان بەمرِی لێی ووردبوونەوە . پاشان بەتوڕەیی ڕوویان لێوەرگێڕا . نەیزانی بۆوا بەتوڕەیی سەیریان کرد . هەستی بریندار‌بوو له بەرخۆیەوە کەوتە لێك دانەوە .

- ( هەر له بەر ئەوەی هەندێ شوێنە کە یانم سەخلەت کرد . خەڵکێکی سەیرن ، لەجیهانێکی سەیریش داین باشە ئەگەر لێرە ئەوەستم بەم سایەقەیە لەکوێ مل‌بشکێنم ، خۆناچم خۆم بدەمەبەر خەنجەری ئەم زریانە ؟!. ) پشتی بەدیوارەکەدا . لەسەرما ئاگای لەمچو مۆڕی دوانەکەی تەنیشتی نەما . لەباس‌و خوازی ئەوانەی دەوروبەری نەگەیشت . جا بۆچی ئاگای لێیان بێ ؟ حەقی بەسەریانەوە ؟ ئەء چۆن حەقی نی‌یە . ئەم سەین‌و بە ینە ، لەخۆ واردنەوە ڕزگاریان کرد . گوێی بۆ شل کردن . بەلام تێیان نەگەیشت خۆ لەبارەی ئەوەوە نادوێن ، پێش ئەوەی ئەویش بکاتە ئێرە بەردەوام لە گفت و گۆدابوون . ئاوڕێکی لەدوو ئەفەندیەکە دایەوە ، توڕەو توندو تیژتر یانی بینی . بۆیە دەماری لووت تێ وەردانی بزوا ، هەژایەوە . وای لێهات بەقوڵی بیر لەتێگەیشتنیان بکاتەرە ، چونکە خۆی وەتەی خۆی ناسیووە نەبۆتە هۆی ڕەنجانی هیچ کەسێ ؟ ئەی باشە کەوایە بۆ ئەم دووانە بەم مۆنی یە تەماشای دەکەن‌و دەتریقێنەوە . مل درێژکرد و چەند ووشەیەکی لەرزۆکی دەرپەڕاندە دەرێ . وەڵام نەبوو ، سەری سوڕما .

- ( نایانە وێ بشیاندوێنم ، بۆ نایانەوێ ؟ لەوانەیە گوێیان لێم نەبووبێ . ئاهە ڕوایە ، لەوەزیاتر نی‌یە . ماشەڵا گفەگفی باو ڕێژنەی باران ناهێڵن هەتا دەنگی خۆشت ببیسی ، جاچۆن خەڵك گوێیان لێت دەبێ ؟ بەڵێ گوێیان لێم نەبووە . دەنا وەڵامیان دەدامەوە . لەوانەشە دەنگم نووسابێ . ئێوارە کەهاتمە ئێرە شتێکی قەڵپم خوارد ، قورگمی ئاوساندوە ، ئەوەتە هەوی کردوە . )

ـیـستی جارێکی دی دەنگی تاقی بکاتەوەو بەرزتر بدوێ . چەند ـیتـەیەکی تریشی ئاراستە کردن هەمدیسـان وەڵام نەبـوو . ـتەـیۆ بووە .

- نەخێر گوێیان لێمەو خۆیان گێل کردوە ، لە سیمایان ڕادیارە ـەدوو کـابرای بلحو ڕوو گـرژ دەچن . نایـانـەوێ لەگـەل ـکبرایەکی شڕوووڕی وەك من بکەونە دەمەتەقێ . وورگ زلانە ، ـەی ئەوەنی‌یە جار جار لەگەل ئەوەی تەنیشتیان پێ دەکەنن ؟ ـەر لەگەلمن وان . من لەشێوەی ئەوان ناکەم . من لەکـوێ ـەوان لە کوێ ئەوان زەلامی وورگ زلی قەلەوی مێشك ئەستور ، من لاوازێکی لاتو هەژار . ئەوان پۆشتەو من شڕووڕ . خۆزگە ـەمزانی بۆ وا پێم پێ دەکەنن . بشێ گاڵتەم پێ بکەن ؟! بشێ ـسەرنجیانم بەشتێکی سەیـر ڕاکێشابێ ؟! خـوا نە خـواستە ـشێتیش نیم ، لە بیرمە تاچەند ساتێکیش لەمەوبەر ئاقل بووم . خوڕەوشتم ئاسایی‌و خراپیش هەڵس‌و کەوتم نەکردوە . ئەگەر وانەبێ چۆن مامەلەم لەگەل خاوەن کۆگاو کابرای شوفێر واڕێك و ڕێك دەبوو !؟ ئـەگەر شێت بـومایـە سەرەنجی ئـەوانیشم ڕادەکێشا ؟ نەئ نە خێر باوەڕ ناکـەم شێتبم . هەبێ‌و نـەبێ دەنگم نابیسن دیارە دەنگم گیراوە . بەلام چـۆن دەنگم تاقی بکەمەوە ؟ هاوار بکەم ، لەبەر خۆمەوە بدوێم ، بـەلام لەگەل هاوار کردن نیم دوایی دوڵم بۆلێدەدەن ، هەر بەجارێ کارلەکار دەترازێ . ئەوسا وەلامم پێ نادرێتەوە بەلام دەنگیشم نەبەلای هەیەو نەگیراوە . ئەی چۆن لە گەل کابرای ساتێ لەمـەوبەر دوام ؟ . )

**کەوتە دواندنی خۆی . نەیدەزانی چی دەڵێ‌و چی ناڵێ تەنیا دەمی دەجولایەوە نەشدەوێرا دەنگی بەرز کاتەوە .**

**- ( بەئیشارەت لەگەلیان دەدوێم ، وەکولاڵێ دەست‌و دەم‌و چاو دەخەمە کار . ئەگەر بەدەنگ تێم‌نەگەن بەهێما تێیان دەگەینم . )**

**دەستێکی بـەرز کردەوە . لێـوەکانی کـردەوە ، قـەبـاتی کـردنەوە . دیسـاکردنیـەوە ، زمـانی دەرهێنـا . ئـەوان نەیانبینی ئەم جار خەمێکی گران بەر دڵی گرت ، بـەزەیی بەخۆی هاتەوە**

**- ( تەنیا جار جارێ دزەنیگـایەکی کـوشندەم تێدەگـرن وپێدەکـەنن . چیم لەوان کـەمتـرە ؟ مـرۆڤن مـرۆڤم . ڕێبوارن ، ڕێبوارم . ئەوەتا دیارین . یانێ‌چی ؟ نەخێر ئەم ماستە مووێکی تێدایە ، دەبێ مووەکـە دەربێنم . منیش کرژو مۆن سەیریان دەکەم ، گاڵتەیـان پێدەکەم . بـەلام باجارێ لەوەگەڕێم بشێ دەم‌و چاوم شێوەکەی ئاسایی‌بێ . لەشم ، جل‌وبەرگم ) .**

**دەستی بۆدەم وچاوی برد ، پەنجەی لێ‌خشاند . هەستی بەهیچ نەکرد سەری خوارکردەوە ڕوانیە شەڵوارەکەی . پیسی‌و سپیاتیەك لەسەر چۆکی چلوەکانی ئەبلەق ڕاگرت . دووکـونی بازنـەیی لەسەرچـۆکی سپی دەچـوونـەوە ، دەبـریسکـانـەوە ، شتی سپی زوو سـەرنـج ڕادەکێشێ « بەفریش لەسەر چیا سپی دەچێتەوە . »**

**لەداخـا توڕە بـوو ، بەتـوڕەیی تێـیان ڕامـا . پـاشـان بـەلالوتێکەوە بـزەیەکی بـۆکردن . بـەکورجیش لەبـەر دەسیـان گیرسـایـەوە ، شـانێکی لەشـانی ئـەوەی لای ڕاستی‌دا ، نـەیـزانی بـۆ پتـر ڕقی لەم هـەستـابـوو . ئەفەندیەکەش توندتر شـانێکی لێدا ، بووە مـڕەمڕ تێـك گیریان ، یەکتریان دایە بەر مستە کۆلە . ئەفەندیەکەی دی ویستی هـاریکاری هـاوڕێکەی بکـا . بەلام چـەند کـەسێ کەوتنە بەینیان . لێك بوونەوە . کابرایەکی باریکەلە ئەوی ڕاکێشایە سوچێ ، لەوانی دوور خستەوە . ئەویش لەداخا دانیشت ، تاتوڕەیی‌یەکەی نیشتەوە .**

**- ( بریا بەم نیوە شەوە شوومە لەئوتێلەکە نەجولابامەوە . تفـلەو چارەیە ، خۆ نەدەمردم ئەگەر تابەیانی چلوەڕی بام . ؟ بەلام نەمدەتـوانی ، مانگێ جـارێکە ئـاخر چـۆن دەتوانم ؟ هەر تەنیا خۆشم نیم هی تریش چاوەڕێمن . ) ساردی لەنێوان کورتەکە دڕاوەکەی بەرەو پشتی هەلکشا . چۆن سەرما کاری خۆی ناکا ؟ تەنیا کورتەکێکی تەنک ، پیاوی واش هەیە بۆ ئـەم جۆرەشـەوانە قـاپوتی سـەد دنیاری دەپۆشێ . پاشان ئەم جۆرانە ئابەم ساتە ناوەختە لێرە چی‌دەکەن چ‌کارەن ؟ .**

لەسەرما لەرزگرتی . هەستایەوە . چلوی بەدوای قوژبنێ
گێرا ، ویستی چەند مەترێ قلچەکانی بگرێتە خۆ .
بۆشلیەکی بچووك لەلای چەپ خستییە هەنگلونان .
چەند شەقاوێ گەڕایەوە . لەبەژنی کابرایەك
ساتمەیکرد .

- (ببورە . )

دیسا هەنگلوی نایەوە ، گەرم نەبۆوە ، ناچار بوو دەستو
پەنجە بجولێنێ . توندتر وەستا خۆ تابەیانی بەمشێوەیە
دەست لێك ناخشێنێ ویستی بچێتە گۆڕەپانەکەی پێش
جادەکە . باران لێیکردبۆوە بەلام کەئەم جولایەوە ، نەرمە
بارانێك بووە دیوار لەبەر دەمی . لەبری ئەو ڕوانییە
ئەوبەر ، چلوی لەبارانلوەکەی بەرانبەری چەقێ
سەرنجەکانی کۆبونەوە سەر بازنە بچووكو گەورەکانی
یەك بەدوایەك دروست دەبوون . دلۆپە بارانێك ،
خاڵێك ، خاڵیك ، بازنەیەکی بچووك ، بەرە بەرە گەورە ،
گەورەتر ، دەکوژانەوە . بەهەمان شێوە دلۆپێکیتر
دەڕژایە نلو بارانلوەکەو بازنەیتر دروست دەبوونەوە .
هەرچەندەی دلۆپە باران دەڕژایە خوارێ ئەویش
ئەوەندە دڵی دادەخوڕپلو دەکەشایەوە . بەلام لەپڕ گرە
گڕی ئۆتۆمبیلێك وێنەی بازنەکانی لەبەر چلو وون کرد .
خەڵکەکەی ژێر تارمەکە ڕژانە سەری .

ویستی ئەویش بەدوای ئەوانەوە غاربداتە بەر دەرگای
ئۆتۆمبیلەکە . بەلام قەڕەباڵغی نەیهێشت لەشوێنی خۆی
بجولێتەوە . بەری نلکەوێ ، لەجێی خۆی متبوو .
چەندانێك سوار بوون ، چەندانێکی تر کەڕانەوە شوێنی
خۆیان . ڕوانییە جێکاکەی هەوەڵ جار لێی وەستابوو ،
کەبینی دوو ئەفەندیەکە لەوێ نەملون . هەناسەیەکی
ئاسودەیی هەڵکێشا . بەلام خۆنابێ هەرلێرە بوەستێو
خەڵك بەرێ بکا ؟ کەکەیشتەجێ ئەوجا گڕی عەشقو
دووریو لەیەك دابڕانی منداڵەکانی دەکوژێتەوە . ئاخر
ملوەیەکە منداڵو ژنەکەی چاوەڕێی بوون
- ( دواکەوتم ، بەمنبێ هەرئیستا دوو باڵ بۆ خۆم
دروست دەکەمو پێی هەڵدەفڕم ، لەوێ دەنیشمەوە ! )
ئلخێکی ساردی هەڵکێشلو ڕووی لەبارانلوەکە کردەوە .
بازنەکان بەردەوام لەدروست بووندا بوون ، بەلام
ئەمجارە بەشێوەیەکیتر ئەمجارە بازنەکان ڕەنگی جوانو
ڕازاوەیان پۆشیبوو . هەربازنەیەك ڕەنگێبوو ، زەرد ...
سوور ... شین ... قلوەیی هەوەڵ جار بەجیاواز پاشان
تێکەڵ بوون . شتی جوانو سەیر لەبەر چلوی قیت
بوونەوە . ڕووبار ، ئاسمان . لەیستۆك ، یاری منداڵانەی
دێ . پاش هەمووشیان ئازادی کوڕی لەنێوانیانەوە
سەری هەڵکێشا . بەهەمان بەژنو باڵا .. هەمان پرچ ...
هەمان دریژی ، چەند !رکەیەك تەما شای باوکی کردو وون
بوو . دەستی درێژ کرد بۆئەوەی هەنگلو بەرەو بلوەشی
بنێ .

- ( کوڕم ، لێم زوێرمەبە . ویستم یارییەکەت بۆبکڕم ،
بەلام دەری نەهێنا ، قەی ناکا بابۆجارێکیتر بێ . )
بەلام پ ش چی ؟ پاش ئەوەی ڕوانییەوە بارانلوەکە ،
لەبازنەکان پتر هیچی تری نەبینی .
لەشوێنی خۆی ڕاپەڕی ، بەرەو بارانلوەکە چوو .
دانیشت ، سەری خوار کردەوە سەربازنەکان . بەتیژی
چلوی تێبڕین . ئازادیبۆ نەدۆزرایەوە . پەنجەی خستە
نلو ئاوەکە ، ئەم سەرو ئەوسەری پێکردبێ سوود بوو .
ئائەم ساتە ئارەزووی کرد ئەویش ببێتە دلوپەبارانێكو
برژێتە نلو ئاوەڕاوەستاوەکە . ئەوسا بەئاسانی شۆڕ
دەبۆوە خوارێ ، بۆ ئەوەی لەنلویەکێك لەبازنەکان
بەکوڕەکەی شادببێتەوە . حەزی کرد بچوك ببێتەوە .
بەلام ئارەزووەکی دوور بوو . کزە لە جەرگیەوە هات ، لە
ڕاخا دوو دلۆپ فرمێسکی گەرمی ڕژاندە نلو ئلوە
ڕاوەستاوەکە وڕووی وەرگێرا . نەیتوانی چی دی سەیری
بکا . هەستی بەغەریبی خۆیو ئازادی کوڕی کرد . غەریبی
بووە مۆسیقایەکی خەمنلكو تەلی هەستی جولاندەوە .
ئلوازێکی خەمناکتریش بێدەنگی ئەم ساتەی هەژاندەوە

1981 / 3 / 20
هەولێر

ژ چیروکێت

• محمد امین بوز ارسلان •

عزت فندي

ژ تیپێت لاتینی کریه تیپێت عەرەبی




فەرهو ، ب دەنگێ لنگێ ژنا خوە ئاسیێ‌ڕا زڤڕی‌و نهێرت . ئاسیێ ، جیر دابو سەر ملێ خوە یێ ڕاستێ ، تاس ژی ب دەستێ خوە یێ چەپێ گرتبو ، ژئالی کانی‌یا گوندڤە دهات . بەرێ خوە دابو دارا مزا ل ئاڤ زەڤیێ . فەرهو ، ساپیێ[1] دەستێ خوە دانی سەر شمبیلێ ، داس‌و تارێ خوە گرتن‌و چو سی‌یا دارێ . ئەو ، بەری نەیێ گیها بن دارێ .

داس‌و تارێ خوە دانین . بپشتا دەستێ خوە خوەی‌دان خوە) ژ ئەنی‌یا خوە مالشت . دلوپێن خوەی‌دانێ ژ ئەنی‌یا وی ڕژی‌یان سەر ئاخێ ، پشکوژێن[2] پێسیرا خوە ڤەکرن ، سێ - چار جار پف کر سنگێ خوە . قاسەك هێنك بو . پاشێ شەوقا خوە ژ سەرێ خوە دانی ئەردێ دیسا زیپکێن خوەی‌دانێ ل‌ئەنی‌یا وی جڤی‌یابون . بدەستێ خوە ئەو ژی مالشتن . هنگی خوەیی دابو ، جلێن‌وی هەمی شل بوبون‌و ب لاشێ وی‌ڤە زلقی‌بون[3] .

د وێ دەمێ‌دا ئاسیێ ژی گیها بن دارێ . جیر ژ ملێ خوە دانی . ل میرێ خوە نهێرت ، کەنی‌و گوت :

« قەوەت بە ژ تەڕا فەرهو ... ! »

فەرهو ، بێ کول ژنا خوە بنێرە بەرسڤ‌دا :

« قەوەت خوەش‌بە .... »

پاشێ ب هێرس[4] لێ نهێرت ، گوت :

« تو ل کومرێ هەتا نوها ، کەچا کوچك[5] »

دلێ ئاسیێ ب ڤێ گوتنێ نەشکی‌یا . لەوڕا فەرهو تم گوتنێن وەها سارو چوڕس[6] دگوتنێ . نە مەرهو تەنێ ، میرێن گوند گشت ژ ژنێن خوەڕا پرسێن وەها تال‌و دل‌شکێن دگوتن نە تەنێ لسەر هێرسێ ، جارنا ب کەن‌و ئەڤین ژی دگوتنوان « کەچا کوچك » یان « کەچا کەرێ » ، یان ژی « کەچا گا » . ژن ژی هینێ ڤان گوتنان بوبون . تەور جارنا کێف‌خوەش ژی دبون . ژبەر ڤێ یەکێ ئاسیێ خەمگین نەبو . کەنی‌و بدەنگەکێ هێدی بەرسڤا میرێ خوە دا :

« شەکرێ دلێ من فەرهو ... ! من ببەخشینە ... ئەز دزانم تو پڕ (تی) بوی‌و ئەز ژی دەرەنگ مامە .... لێ ئەز چ بکم ! .... من هەتا دەو کلا رون هلانی‌و لاوك[7] رازاند ، دەرەنگ بو ..... ب سەرێ تە ، ئەز هەو بێ‌ڕا گیهام »

فەرهو بقالا لاوك نەرم بو ، لەوڕا کوڕێ خوە پڕ دئەڤاند ، ئەو ژی کەنی‌و گوت :

« ب گوریا لاوك بوبێ ، دە تاسەك ئاڤ بدە من ، هەیدێ ! ... » ئاسیێ ، ئاڤ د تاسێ وەردا ، پاشێ تاس ب لێڤان داگرت‌و درێژە میرێ خوە کر . فەرهو تاس کشاند سەرێ خوە‌و ب یەك هلمەکێ ڤالاکر . ئاڤا سارا مینا جەمەد کەزەب‌و لاشێ وی ب جارەك هێنك کرن . دیسا تاس درێژێ ئاسیێ کرو گوتێ :

« ئوخخخ ...! کایەك ژی داگرە »

ئاسیێ ب چاڤەکی تژی دلوڤانی لمیرێ خوە نهێرت :

« تو وەستای فەرهو .. ! تە خوەیی ژی دایە .... پڕ ئاڤ ڤەمەخوە ، تو دێ نەخوەش بکەڤی »

فەرهو کەنی‌و گوت :

« دە ل ڤێ کەچا کەرێ بنێرن ، ئەو ژی شیرەتان ل من دکەها ... ! »

« قەنا قاسەك هێسا بیە ، پاشێ ئەز داگرم ... دو تاس لسەر هەڤ ڤەمەخوە ... »

فەرهو هێرس بو : « ئەز دبێژم داگرە ، ئەو هێژ ژی ئاقل ددە من .... هەیدێ لەز ، هێژ کو شەقام[8] نەهاتی‌یە تە .... » ئاسیێ نەچار ما ، دیسا تاس داگرت‌و دایێ . فەرهو ئەو ژی ڤەخوار . خوەی‌دان دیسا ل ئەنی‌و سینگا وی جڤی‌یا . ئاسیێ جیر سپارت شەلەکە ئاخێ . تاس ژی دانی سەر دەڤێ وی . پاشێ ب داوا کراسێ خوە ، زیپکێن خوەی‌دانێ ژ ئەنی‌یا میرێ خوە مالشتن‌و گوت :

« وش‌ش‌ش ... !! ئەڤ چ خوەی‌دانە لووو ! ..... مروڤی دبێژە قەی کانی دئەنی‌یا تەڕا دەربویە .. »

فەرهو سینگا خوە مێراندێ :

« خوەی‌دانا لئەنیێ نەتشتە . تو لسینگا من بنێرە .... » ئاسیێ ، ل سینگا میرێ خوە نهێرت . مینا کو تاسەك ئاڤ لێ هاتبە ڕێهتن ، ژ خوەی‌دانێ شل - پل بوبو . پرچا سینگا

وی بیّڤه زلقی‌بو . ئاسیّ خوز بو و ب داوا کراسیّ خـوه سینکا میریّ خوه ژی مالشت . فه‌رهو ب‌دل بژوکی ملیّ خوه دستوییّ ژنا خوه‌دا بوهوراندو ئه‌و ب ئالی خوه ڤه کیّشا . لیّ ئاسیّ ب‌له‌ز خوه پاش‌دا ئاڤیّت ، که‌نی‌و گوت :

«وی‌ی‌ی ، ل من رو ره‌شیّ ! .... ما تو نابیّژی کو ژدورڤه مروڤن مه ب‌بینن ! ... »

ملیّ فه‌رهو له هه‌وا مابو . ئه‌و ژی که‌نی :

« هه‌ما بلا ببینن ، چ دبه ! .... »

« وللّا باشه ... ! بلا مه ب‌بینن ، دنیّ‌و ئاله‌م ژی ب مه بکه‌نن ، ئه‌م تیّکه‌ڤن ده‌ف و زاریّن خه‌لکیّ نه ... ! »

هه‌ردو ، ژی که‌نین . پاشیّ فه‌رهو گوت :

« ئه‌ز دکم ـ ناکم تیّهنا من ناشکیّ . کا تاسه‌ك ژی ئاڤ بـده من ... »

« ته پر ڤه‌خوار کورو ! .... وللّا تودیّ نه‌خوه‌ش بکه‌ڤی ... چکا لڤیّ خوه‌ی‌دانیّ بنیّره .... ب‌ڤیّ خوه‌ی‌دانیّ ته دو تاس ئاڤ ڤه‌خوار . هیّژ ژی تو دخوازی .... »

لیّ فه‌رهو ئیسرار کر . ئاسیّ ژ نه‌چاری تاسه‌ك دن ژی داگرت‌و دایێ . پاشیّ فه‌رهو ژ قوتی‌یا خوه جغاره‌کیّ پیّچا ، پیّخست ، شه‌وقا خوه دانی سه‌ر شه‌له‌که ئاخیّ ، ڤه‌زه‌لی‌یاو سه‌ریّ خوه دانی سه‌ر شه‌وقیّ . ئاڤا سـارو هیّنکایی‌یـا سی‌یا داریّ ئـه‌و مه‌ست کربو . بیّ هه‌مد چاڤیّن وی هاتن گرتن‌و دخه‌ورا چو . ئاسیّ ل‌به‌ر سه‌ریّ وی رونشت ، جغارا پیّخستی ژ ناڤ تلی‌یّن وی ده‌رخست ، دا بن لنگیّ خوه ته‌فاند پاشیّ ژی ب داوا کراسیّ خوه ل‌سه‌ر میریّ خوه باوه‌شین کر .

پایزیّ فه‌رهو نـه‌خوه‌ش کـه‌ت . روّژ ب روّژ دهه‌لی‌یـا و ژهیّز دکه‌ت . ووسا بو کو چاڤیّ وی نه‌دبری ژ شونـا خوه رابـه . دکوخی‌یا ژی ، ب‌شه‌ڤ پیّ دبو سار ، پاشیّ ژی خوه‌ی ددا . هه‌ر کو خوه‌ی ددا ئه‌و ژی ، ئاسیّ ژی کیّف‌خوه‌ش دبون باوه‌ر دکرن کو خوه‌ی‌دان ، ژبو ده‌رباس‌بونا نه‌خوه‌شیێ باشه . لیّ بـه‌لیّ نه‌خوه‌شی ده‌رباس نه‌دبو . فه‌رهو هه‌ر روّژ ژ روّژا دن ، هه‌ر شه‌ڤ ژ شه‌ڤا به‌ریّ خرابتر دبو .

فه‌رهو نه‌دزانی کو ئه‌ڤ چ نه‌خوه‌شی‌یه ب‌پیّسیرا وی گرتی‌یه ، مینا ڤیر . ئاسیّ ژی نه‌دزانی . ری‌سپی‌و پـوڕسپیێن گـوند تم دهاتن سه‌ره‌دانا فه‌رهو . لیّ تو که‌سیّ نه‌زانی کو نه‌خـوه‌شی‌یا فه‌رهو چی‌یه و چ ده‌رمان لیّ تیّ . پاشیّ یه‌کیّ گوت « تایه » . ئه‌ڤ گوتن ب‌سه‌ریّ فه‌رهو ژی ، ئاسیّ‌ژی ، گـوندی‌یـان ژی که‌ت .

نه‌خوه‌شی‌یا فه‌رهو ب‌راستی ژی مینا تاییّ بو . هه‌ر شه‌ڤ پێ دبو سار . پاشیّ گه‌رم . خوه‌ی ددا ، روّژ ب روّژ زه‌دو زوا دبو . ئه‌ین (عه‌ین) مینا که‌سیّن تاوی . گه‌ر چ هشیّ که‌سیّ مه‌سه‌لا خوه‌ی‌دانیّ . نه‌دگـرت ، لیّ ئیّ کو گـوت «تایـه» ، سه‌بـه‌بێ خوه‌ی‌دانیّ ژی زو دت : « ژ زوّرا تاییّ خوه‌ی دده »

ژبو تاییّ ژی یه‌ك هاڤله‌ك هه‌بو : برینا تاییّ ... دڤا کو مه‌لایه‌ك ژ فه‌رهوڕا « تابره‌ك » چیّکه . هنگیّ تا ژسه‌ریّ رابویا لیّ ده‌رد یه‌ك بوما ! ..... ل گوند مه‌لا تو نه‌بو ... گوند بچوك بو ، گوندی ژی خزان* بون . نه‌دکارین ئابوری‌یا مه‌لایه‌ك پیّك‌بینن . ژبه‌ر ڤیّ یه‌کیّ ، دڤا کو فه‌رهو ببن نك مه‌لاییّ گونده‌کی دن . ژبل ڤی‌یا تو هاڤل تو نه‌بو .

سبه‌کی دو خوّرتان ، فه‌رهو ل‌که‌ره‌کی سوارکرو به‌ریّ خوه دان گوندیّ جیران . مه‌لاییّ وی گوندی ژی مه‌لاکی خورت بو ، ناڤ و ده‌نگیّ وی ل هاوردور هه‌می به‌لاڤ بوبو . ژ گوندیّن دور ژی مروڤ دهاتن جه‌میّ‌و پیّ نڤشت ددان چیّکرن ، تا ددان برین . مه‌لیّ ژ هه‌ڤیّ نڤشتان‌و تابران گه‌له‌ك ژی دراڤ جڤاندبون .

فه‌رهو ، ل پیّشبه‌ر مه‌لیّ ل‌سه‌ر چوکان رونشت . مه‌لیّ ب‌ڤاسیّ دو بهوستان ده‌زی ئـانی . ئه‌و ژی بـه‌ر ب‌قبلیّ ل‌سـه‌ر چوکـان رونشت ، ده‌ست ب خوه‌ندنیّ کر . سه‌ریّ هه‌ر چه‌ند که‌لیمان جاره‌کیّ پف دکر ده‌زییّ‌و گریّکه‌ك لیّ دخست . ب‌ڤی ئاوایی نه‌هـ گریّك ل‌ده‌زییّ خستن . پاشیّ ده‌زی ل‌زه‌ندیّ فه‌رهو پیّ ڕاستیّ گریّ‌داو گوتیّ : « ب‌رایا خوه‌دیّ ، تو دیّ د ناڤبه‌را سیّ ـ چار روّژان دا سپی ـ ساخ ببی »

فه‌رهو ده‌ستیّ مه‌لیّ ماچ‌کرو گوت :

« ئه‌ز خولامیّ ته‌مه ، ئاخا بن سولا ته‌مه ، سه‌یدا ! ... خوه‌دیّ ، یێن مینا ته ژ سه‌ریّ مه کیّم نه‌که ! .. »پاشیّ هه‌ڤیّ تابرا مه‌لیّ دا . هه‌ردو خوّرتان دیسا ئه‌و ل‌که‌ریّ سوارکرو ری‌یا گوندیّ خوه گرتن .

ئه‌و شه‌ڤ فه‌رهو دیسا خوه‌ی دا . لیّ مینا هه‌ر شه‌ڤی نه‌ترسا . باوه‌ردکر کو تابرا مه‌لیّ ، هه‌من ، ژسه‌دی سه‌د دیّ نه‌خوه‌شی‌یا وی هلینه ، ژیّرا شیفاکی خیّریّ بینه . لیّ ئه‌ڤ ب جـاره‌ك‌و د روّژه‌ك دا نه‌دبو . نه‌خوه‌شی چاوا هن ب هن هاتبو ، دیّ ووسا ژی هن ب هن رابـویا . بـه‌ر ده‌ستیّ سبیّ دیسا کـوخی‌یا . کوخکه‌که زواو بیّهن‌چکین ب‌گه‌وری‌یا وی گرتبو ، به‌ر نه‌ددا . ژنشکاڤه به‌لغه‌م که‌ت ڤرکیّ و ب کوخکیّ‌را ژده‌ڤیّ فری ، چو ل‌سه‌ر بالگیێ که‌ت . به‌لغه‌م ئیجار نه‌وه‌ك ئا هه‌ر جار بو .... سور بو ئیجار ، خوینی بو . ل‌به‌ر روناهی‌یا چراییّ وی ژی ،

خـر ژی ل بەلغەمێ نهێرتن . ئەرێ ، خەلەت نەدیتبون .... حەمە ب ڕاستی ژی خوینی بو .... هەردو ژی کێف خوەش بون سێف ل هەڤدو نهێرتن ... ئاسێ کەنی و گوت :

« شبکر ژ خوەدێ ڕا ! .... تو ئێدی رهەت بویی .... نەخو مەت نوها ئەڤ خوین د سینگا تەدا جڤی‌یابویە .... بەلکی ژی ژ ڕو هوندردا کونێر[10] مونێرەك ل سینگا تە هاتبویە .... نوها ...و .... ئەڤ خوین ، خوینا وی‌یە .... ل سەر ڤێ خوینێ ئێدی تشتەکی تە نامینە .... سبێ ـ دوسبێ ، ب رایا خوەدێ تو دێ ...ێف نڤینان دەرکەڤی و رابی سەرخوە !..... »

...رهو ژی ووسا باوەردکر :

« ئەڤ ب خێرا تابرا مەلێیە ، ئاسێ ! .... خوەدێ ژی ...ی‌بە .... وی ئەز ژ نەخوەشیێ خلاس کرم .... خوەدێ » پەیڤا خوە تەمام نەکر . دیسا کوخکێ ب ڤرکێ گرت . کوخی‌یا ، کوخی‌یا .... ئاسێ تایفکەك[11] ئانی . دا بەرێ .... ...رهو بەلغەما خوە دئاڤێت تایفکێ .... بەلغەم هەمی ب خوین ...و ....

ژ وی شەڤێ پێڤە ، فەرهو ڕوژ ب ڕوژ خرابتر بو .

هەر ڕوژ ب خوینێ ڤەدرەشی‌یا و بەلغەما خوینی دئاڤێت . ڕەنگ و ڕوچک ژی لێ نەمابو . ڕویێ وی زەر بوبو ، بو بو مینا شما ، درەمەك گوشت ژی ب لەشێ وی‌ڤە نەمابو . پارسویێن وی یەکا ـ یەك دهاتن ژمارتن . لێ تابرا مەلی هێژ ژی د زەندێ وی‌دا بو . وی ژی ، ئاسێ ژی هێڤی‌یا خوە ژ خوەدێ نەدبڕین . باوەر دکرن کو تەسیرا تابرێ دێ ڕوژەك هەمن خوە ب مێرینە . ئاسێ تم و تم دگوت : « مالا خوەدیێ ڤێ تابێ بشەوتە ! .... ئەڤ چ تەور[12] تایە کو ئەڤ قاس ئاژوت ! .... کەسێ بەلاکی وەها نەدیتی‌یە ، هەتا نوها ! .... »

ڕوژەك ژ ڕوژان . چەرچی‌یەك هات گوند . زەلامەکی ناڤسال و شارەزا بو . گوندی‌یان ، ڤالا نەخوەشی‌یا فەرهو ژ وی‌ڕا ژی کر . مێرك هات سەرەدانا وی . بالا خوە ڕەنگێ نەخوەش . پرسا ڕەوشا وی کر . فەرهو پڕ نەدکاری ب پەیڤە . ئاسێ بەرسیڤا پرسێن چەرچی ددا .

چەرچی ، پاشێ ژبو نەخوەش شیڤا داخواز کر و دەرکەت . ژ گوندی‌یان‌ڕا گوت : « گوندینو ، ئەڤ نە تایە ، ئەڤ ژانا زراڤە ... »

ڤێ گوتنێ ، مینا دەنگێ توپەك ، گوندی ڤەجنقاندن . هەمی‌یان ب دەڤەك‌ڕا « بسم الله » ئانین و پف کرن خوە . هەر یەکێ ژوان تشتەك گوت :

« دور دور ! .... دورێ ئاڤایی‌یان بە ! ... »

« خوەدێ ئومەتا محەمەد ژڤێ نەخوەشیێ ب پارێزە ! .... »

« نەیێ سەرێ دژمنێ مە ژی ! »

چەرچی ، پەیڤا خوە ئاژوت :

« ئەڤ نەخوەشی کو وەختێ ئاڤێن نەوالان گەرمن ل مروڤ پەیدا ببە ، دەما ئاڤ سار ببن مروڤ پێ دمرە . نا ، کو دەما ئاڤێن نەوالان سارن ل مروڤ پەیدا ببە ، ب گەرم بونا ئاڤان‌ڕا مروڤ دچە .... خلاسی ژڤێ نەخوەشیێ تونە ....خوەدێ نەینە سەرێ کەسان ! .... »

گوندی‌یان گشت دەنگ دان هەڤدو :

« ئامین .... ئامین .... ئامین .... »

چەندەك پاشێ ، شەڤەك بەر دەستێ سبێ ، فەرهو گران بو ... ئاسێ زانی کو مێرێ وێ ئێدی چون‌دوخە .... ب لەزو بەز چو ، گازی چەند ڕی‌سپێین گوند کر ... ئەو ژی دهاتن دیتن کو خێرا فەرهو نەمایە .... یەك ژوان قورئان‌خوین بو ... لەزا ـ لەز دەس‌مێژ گرت و دەست ب خوەندنا « یاسینێ » کر ... لێ هێژ نیڤی نەکربو ، باوشکا داوی ل نەخوەش کەت ... فەرهو گانێ « گیانێ » خوە تەسلیم کر . ئاسێ ل بەر سەرێ مێرێ خوە ڕونشت ، کوڕێ خوە یێ دوسالی کر هەمبێزا خوە و دەست ب گرینێ کر . پێ‌ڕا ژی دستری .

ژێدەر :

ژ کتێبا « مەیرو » هاتیە وەرگرتن

چاپا سالا « 1981 » ، ێ ..... « سوید »

پەیڤێن گران

1 — سلپێ - سلپ = [ ئەو ڤەسەلا کو دگەل جەهـ و گەنم تێ سەر بێندەرێ ] .... فەرهەنگا جگەر خوینی هژمار « 1 » ، ل252

2 — بشکوژ = دوکمە ـ ڤوپچە .

3 — زلڤی‌بون = ب لاشێ و ی‌ڤە نویسیابون .

4 — ب هێرس = ب تورمیی ، ب علجزی .

5 — کوچك = کویچکێ صا .

6 — چوڕس = [ دبێژن : گوتنێ بلرام چوڕسن (نەخوەشن) ] ـ فەرهەنگا جگەر خوینی ل « 32 » ، هژمار « 2 » .

7 — لاوك = ل هەمی جهان دچیروکێدا ب (لێوك) هاتیە .

8 — شەق ، زلەهـ .

9 — خزان = زار ، فەقیر .

10 — کونێر = کولك ( ڤونێر ، ڤونێری ) .

11 — تایفکەك = ئامانەك ( دویر نینە ئاغلەویك بیت ) ....

12 — تەور = توخم ، نوع .



**نووسینی : ی . مارچینکۆ**

**وەرگێڕی لە ڕووسی‌یەوە : جلال تەقی**

لە خەوێکدا کـوڕەکەی هـاتبۆوە ، بـۆیە لە بـەیانی‌یـەوە دڵی خۆش‌بوو ئەبوایە خۆی ماندوو بکردایە بۆ پێشوازی کردنی : ماڵی پاک بکردایەوەو خواردنی ئامادە بکردایەو بۆ تلێک ڤۆدکاشی بکریایە .

نزیکی دوو ساڵ بوو کوڕەکەی نەدیبـوو ... هێشتا دوا ساڵی خوێندنی تەواو نەکردبوو لەیەک ترازان ، لە پێشدا وچان دەستی پێ کردو هەریـەکە بـەلایەکـدا ڕۆیشت‌و دوایيش لە شوێنێکی‌تر لەسەر ئیشێکی گەورەو گرنگ دامەزرا . هەرچەند لە نامەیەکدا جۆری کارەکەی بۆ نووسیبوو بەڵام ئەم هیچی لێ تێ نەگەیشتبوو ، هەر ئەوەندە تێگەیشت کە کـۆمەڵێـک لاو لەبەر دەستدایە پەروەردەیان ئەکات . بەشـانازی‌یـەوە لای دراوسێکانی باسی ئەمەی ئەکرد . دوا نامەی ، کە بە بـۆنەی هەشتی مارتەوە بۆی ناردبوو لە پشت وێنەکەی عیساوە هەڵی گرتبوو . لەو نامەیەدا بۆی نووسیبوو کە زۆر ماندوو ئەبێ ... ئەی چۆن ؟ ... خۆڵاوی ئێستا گوێ لە کەس ناگرن . بێ‌یان ئەڵێ‌ی نوێژ بکەن گاڵتەت پێ ئەکەن ، بە ئارەزووی خۆیان ئەژین

هەرکە چەپەرەکەی دەرەوە کرایەوە بەرزەپێ ڕاست بـوەوەو ڕایکردە دەرێ ، وایزانی پـۆستەچی‌یـەکەیـە ، لەڕاستیشدا « بەگاتسکیخ » ی پۆستەچی بوو ، بەڵام نەنامەی بۆهێنابوو نەتەلەگرام ، بەڵکو مووچەی خانەنشینی‌یەکەی بۆ هێنابوو پێی ووت :

ـ « سیمیۆنۆڤنا ... چەپەرەکەت پێویستی بەچاک کردن هەیە تێگەیشتی ؟ ... بەم جۆرە نەبوونی باشترە ! »

ـ « کوڵا دێتەوە چاکی ئەکاتەوە ! »

ـ « بـەخوا شێتی ، مـەگـەر بێتـەوە بـۆسـەر گـۆڕەکـەت ، تێگەیشتی ؟ ... »

ـ « چەنەبازی مەکە ! ... »

ئەمەی ووت‌و بە جۆرێکی‌وا شالاوی بۆ پۆستەچی‌یەکە برد ناچـاری کرد بـەپرتـاو بەرەو دەرەوە ڕابکـات ، خۆی‌دا لەچەپەرەکـەو بەیـەکجاری خستی « سیمیـۆنۆڤنـا ... چووە باخەکەو هەر بیری لەوە ئەکردەوە کە مرۆڤی زیان بەخش چەند زۆرن وەک ئەم بەگاتسکیخە ! لەگەڵ ئەوەشدا کە نامەی بـۆ ئەهێنا بە پیاوی باشی ئەزانی‌و بێجگـە لەو کاتـانە کـە بەلای مـاڵەکەیـاندا ، بـەخۆی‌و هـەگبەکـەیـەوە ئـەڕۆیشت لەشی دائەهێزراو وەک عەلەشیشی گیف بوەوە ئەهاتە بەرچاوی .

ئەم کابرایە هەموو ژیانی هەر بەوجۆرە بەسەر بردووە ، نەزەوی کێڵاوە ، نەتۆوی وەشاندووەو نەکاری کردووە . هەموو ئیشەکەی ئـەوە بووە لە ئیسگـەوە پۆستـەی هێناوەو بـڵاوی کردۆتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا خانوویەکی وای هەیە هەموو کەس ئـاواتەخـوازیەتی ... سـەر بانـەکەی چینکـۆ ڕێژ کـردووەو بەنەخش‌و نیگار ڕازاندوویەتیەوە ... ئـایریـلی تەلەفـزیۆنیش

ـ بانەکەیەوە قنج بۆتەوە ... منداڵەکانیشی پێگەیاندووە ... ـ‌ـن مووچە خۆری کشتوکاڵو ئەویتریان مامۆستایە ... ـوشیان لەم خانوەدا بەیەکەوە ئەژینو کە کۆ ئەبنەوە هەتا ـ ـمێ گرمە گرمیان دێ !

ـسیمیونۆڤنا » ئێواران دۆخی زۆر خراپە ... خەیاڵی خـراپ ـت بەمێشکیدا .. ئێسکەکانی دێنـەژان قاچـەکانی تـوانای ـەگرتیان نامێنێ ... دەستی هیچ ناگرێ ... بەکورتی خەریکە ـکی بکەوێ !

ئـەم هەمـوو ژیانی پشتی بـەسـەر کێلگـەو بێشکـەی ـ ـەکانیو کاری ناوماڵدا چەماندۆتـەوە ، لەگەڵ ئـەوەشدا ـەخانوویەکی سەربان بـەچینکۆ داپـۆشراو دروست بکـاتو ـتەلەفزیۆنێك بکڕێ ... هەموو سامانەکەی ئێستا بریتییە لە ـچ مریشكو کەلەشێرێك .

تێناگات چۆن ماوەیەکی دوورو درێژ گەورەی خێزانێکی ـگەورە بووەو خوێنو گۆشتی لەرێیاندا کـردوە بەئـاو کەچی ـئێستا تەنیایە ! ... دوو منداڵی بەدەردی خوا مردن ، دووانو مێـردەکـەشی لە شـەڕدا کـوژران .... ئـای بـەچی دەردی سەرییەك دوانەکەی تـری پێگەیـاند ... مـەگەر هـەر خوا بزانێ ... هەرچەندە بەیەکیشەوە پێگەیشتن بەڵام زۆر لەیەك جیاوازبوون ... کچەکەی وەك مێردەکەی تەمەڵو قسە ڕەق بوو مەنجەڵ خلبوو بوەو سەرقاپی خۆی دۆزیبوەوە هەر باشیش بوو ئەو مێردەی دەست کەوتبووو شووی پێکردبوو .. بەڵام کوڕەکەی جۆرێکی تربوو . ڕاستە ئـەڵێن پاشـە بەرەگـرتگی بەردڵانە ! هەتا ئەم دواییەش ئەگەر لە دەمی خۆی بگێرابایەوە مانگی دوو جار پیوی بەراز هـەرمێو هێلکەی کـولاوو لوتکەو شتیتری بۆ ئەنارد بەڵام لەم دواییەدا بۆی نووسی کە ئیتر بۆی نەنێری . دیاربوو ئیشی باشەو خۆی ئەتـوانێ شت بکڕێ ... بەڵکو واش نەبێ ؟ کێ ئەزانی چی دەست ئەکەوێ ؟ بەڵکو هیچ پەیدا نەکاتو برسی بێت ؟ ... بەڵکو نەیەوێ دایکی . دڵتەنگ بکات بۆیە ئەڵی هیچی بۆ نەنێرێ ؟ .

لە باخەکە پڕ سەتڵێك تەماتەی ڕەقو سەوزی کردەوەو هێنایە ژوورێ . پێش ئەوەی دایان بنێ سیدانەیەکی گەییوی سووری لەسەر قـەراغی پەنجـەرەکە هـەڵگرتو بـەشێنەیی خستنیە کیتەلەکەیەوەو بە خاولیـەك دایپۆشیو چـوە دەرێ بەرەو ئێستگەی شەمەندەفەرەکە .

ئێستگەکە حەوت کێلۆ مەتر دوور بوو ، بەڵام ئەمجارە زۆر بەدرێژتری هاتە بەرچاو ... ڕەنگە ئەوە بوو بێ کە زۆر خێرا ئەڕۆیشتو کات ژمێریشی پێنەبوو . شەمەندەفەری ئاسایی لەو ئێستگەیەدا سێ دەقیقە ئەوەستا ، بەڵام « تیژ » ڕەوەکان لایان نەئەداو وەك تیسکەی تفەنگ دەرئەچوون .

چەند پیرێژنێکی لەگەرماندا پڕووکاو بازارێکی بچووکیان لە ئێستگەکەدا پێك هینابووو تەماتەو هێلکەی کولاوو گـەنمە شامییان ئەفرۆشت ....

بێجگە لەم پیرێژنانە کەسیتر دیار نەبوو ، و هەموو لە تاوگەرما لەبەر سێبەرەکەدا خۆیان شاردبۆوە .

دڵی خۆش بوو کە دوا نەکەوتوە . ڕۆژی سێ شەمەندەفەر ئەهات ... ئەوەندە ماندوو بوو خەریك بوو بـەلادا بێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی بە درێژایی ژیانی ئەوەندەی چەرمە سەری دیبوو ڕاهاتبوو بەرگەی هەموو شتێك بگرێ . کیتەڵەکەی لای ئەوانی ترەوە داناو چاوەڕێی کرد .

زوربەی پیرێژنەکـان لەکاتی کچێنییـەوە یەکتـرییان ئەناسی . کەباسی ، کاروباری خێزانییان ئەکرد هەروەك جاران ئەیان ووت .

ـ « دەکچینـە بەسـە ... ئـای کچینـە گـوێ بگـرن ! .... » پیرێژنێکی نەناسیاو لای سیمیونۆڤناوە دانیشتبوو ، ئەوەنـدە قەڵەو بوو وات ئەزانی هەر ئێستا کراسە پوواوەکەی لەبەریدا شەق ئەبات ! زوو تێیگەیشت کە ناوی « ئولگا » یەو هێلکەی هێناوە بۆ فرۆشتن بۆ ئەوەی بتوانێ کچەکەی بنێری بۆ تاقی کردنەوەی وەرگرتن لە زانکۆ ... تازە هاتوونەتە ئێرەو لە دروست کردنی پردی شەمەندەفەرە تازەکەدا کار ئەکەنو لە کارەڤاندا ئەژین ... بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا مریشکی هـەر ڕاگرتـووەو لەقەفەزدا شاردوونیەتەوە .

سیمیـو نـوڤنا ش بـاسی خۆی بـۆ کردو تێی گـەیانـد کـە منداڵەکانی پێگەیانـدووە ... تێیگەیـاند کچـە گەورەکـەی شووی کردووە بە بەڕێوەبەری کارگەیەكو ماڵێکی وای هـەیە نەبێتەوە ! .... خانمێکی شاریی وای لێدەرچووە کە پار هاتبووە بۆ لایو بەگوندەکەدا گەڕابوو نەیان ناسیبووە ، تەنها پێڵاوە

نووك تیژەكانی ، كە پاژنە بەرزەكانی ئەتوت بزمارە ، بایی چل ڕوبل بوو ! .... بە هەركوێیەكدا ئەڕویشت پاژنەكەی زەوی كون كون ئەكردو نیشانەی جێ ئەهێشت ... ئەوەیە كچ ! ... بیست ڕوبلی دابوو بەدایكی و نەستەلەشی بۆ هێنابوو كە ئەم ناوە سەیرەی هەبوو : « ئادەی پڕی پیاكە ! » ...

هـەتا ئێستـاش ئەو نـەستەلانـەی‌نەخـواردوەو بۆ كـوڕەكەی هەڵگرتووە ، كونی جێ پاژنەكانیشی تەنها پایز باران شتنیەوە ! لە پڕ ئەو ناوە شلەژا ... سەرۆكی بەشی گواستنەوەی ئێستگە هات تەماتە بكڕێ . وادیاربوو بڕیاریان دابوو بخۆنەوە . لەبەر ئەوەی تەماتەكانی سیمێونوڤنا گەورەو پتەو بـوون یەكسـەر كۆمەڵەیەكی لێ هەڵبژارد ، بەڵام كە بۆ بەد بەختی لەژێـرەوە دوانی سەوزی بینی تووڕە بوو ، و هەرچـەندە سیمیـونوڤنـا هی‌تری دایە قایل نەبوو ولە « فـرۆشگا » زمـان خسی كڕی ! بێگومان زۆری پێ ناخۆش بوو كە ئەمەی لە كیس چوو ، بەڵام گوێ مەدەرێ ، ئێستا شەمەندەفەرێكی‌تر دێت .

لەگەڵ ئۆلگادا بەشانازیی‌یەوە لەسەر قسە كردنـەكەی ڕۆیشت‌و ووتی :

ـ « كوڕە بچووكەكەشم ئێستا پیاوێكی ناسراوەو لاوان پەروەردە ئەكات ، لەگەڵ ئەوەشدا بیری نەچوومەتەوەو نامەم لێ نابڕێ ! بەڵام كچەكە , تاقەتی نامە نووسینی نی‌یـە . ئەو لەقوتابخانەشدا هەر تەمەڵ بوو بەڵام ئەمیـان ڕێبازی زانیـاری گرتوەو پیاوێكی تێكەیشتووە بۆیە كردوویانە بە بەڕێوەبەر ئۆلگا بەگومانەوە تێ ی ڕوانی‌و ووتی :

ـ « كەواتە بۆچی ناتبەنە لای خۆیان ؟ »

وەرامی دایەوە :

ـ « كچەكەم حەزی ئەكرد بمبات ... بەڵام بۆكوێم بەرێ ؟ ئەوخەرێكی خێزانی خۆیـەتی‌و خەسـوو ، و خەزووری لەگەڵدایە كوڕەكەشم ئەیبردمە لای خۆی بەڵام بۆچی لێیان تێك بدەم ؟ بـاخویـان چۆنیـان ئەوێ وابـژین ، ئێمە پێكـە، ناگونجین پیریژنێكی وەك من بۆچی لێیان بشێوێنم ؟

ئۆلگا بەسەرسامی‌یەوە لێ‌ی پرسی :

ـ « بۆچی پێكەوە ناگونجێن ؟ »

« سیمیونوڤنا » هەندێك منگە منگی كرد بەڵام لەدواییدا كەمێك دەنگی نرم كردەوەو ووتی

ـ « بەقوربان ، كە پارهات بۆ لام ئەوڕۆژەمان بەخۆشی بەسەر برد بەڵام ڕۆژی دوایی پێ‌ی ووتم : « دایە ، بۆمن زۆر شوورەیی‌یەو تەریق ئەبمەوە .. من پیاوێكی گەورەم ، كەچی تۆ نوێژ ئەكەی ! » .

بۆیە ئەڵێم ئەگەر لای ئەو بژیم لەبەر چاوی برادەرەكانی تەریق ئەبێتەوە ، لەبەر ئەوە نەچم باشترە ! »

ـ « ئەی پارەت بۆ ئەنێرێ ؟ »

بەسەرسامی‌یەوە وەرامی دایەوە :

ـ « پارەی‌چی ؟ ... ئەو بەشی خۆی ناكات ... من بەشی خۆم هەیەو پێویستم بەو نی‌یە ! »

ئۆلگا بەتووڕەیی‌یەوە ووتی :

ـ «بەخوا مندالەكانت هیچ‌و پووچن ! »

« سیمیونوڤنا » بەقووڵی تێ‌ی ڕوانی ، دەستی‌لێ ڕاوەشانـدو پێ‌ی ووت :

ـ « ئـەوە ئەڵێ‌ی چی ؟ قسـەی وامـەكـە ، گـونـاهت ئەگات ! »

ـ « لەجێگـای تۆ بـوومایـە شكاتم لێ ئـەكردن‌و مـانگـانـەم پێ‌ئەبڕینەوە ! »

سیمیونوڤنا ئیتر خۆی پێ نەگیراو قیژاندی :

ـ « مانگا ! ... تۆ شكات لە مندالەكانی خۆت بكە ! ... شێتە ... بێ‌ئـەقڵ ... چـۆن شكات لە منـداڵی خۆم بكـەم ؟ ئـەوە تـۆ ئەڵێ‌ی‌چی ... تف ! ... »

پاش ئەمە بەشانازی‌یەوە بۆی ڕوون كردەوەكە ئێستـا كوڕەكەی ئەگاتە ئێرە ، هەر چەندە لەبەر ئەوەی ئەم ڕێگـایە دوورە زۆر جار بەشەمەندەفەر بەڕێگایـەكی تردا ئـەچێت بۆ مۆسكۆ بەڵام ئەمجارە بەتایبەتی بلیتی ئەم ڕێگایەی بڕیوە . بۆیە تەماتەی هێناوە بۆ فرۆشتن كە بوتڵێك ڤودگای پێ‌بكڕی ، بەڵام ئـەمانـە نەچـوون بەگـوێ‌ی ئۆلگـاداو وەك عـەلەشیش بـە سەرسامی‌یەوە ملی بائەدا . خەفەتی ئەوەی ئەخوارد كەئەم ژنە بەم جۆرە قسەی لەگەڵ ئەكات .

كە رادیۆی ئیستگە بڵاوی كـردەوە شەمـەندەفـەرێك ئـەگات پیرێژنەكان جووڵان . چاودێریكەری ئێستگەو چەند ڕێبوارێك‌و « ڤاسیا » ی پۆلیسیش پەیدابوون پیریژنەكان لەمنـداڵی‌یەوە ئـەم پۆلیسـەیان ئـەناسی‌و ئـەویش ئەمـانی ئەنـاسی‌و جورە پەیوەندی‌یەك لە ناویاندا پەیدابوو بوو . بەپێ‌ی یاسا ئەیتوانی نە هێڵێ كـرین‌و فرۆشتن لێـرەدا بكرێ .... لێـرەش نەبـوایە

حتو نرا هیچ بفروشریٰ چونکه شەمەندەفەرەکە ئەوەندە
حیتەوەو ڕێبوارەکان تەنها ئەوەندە فریا ئەکەون مل بێننە
دەمومو بپرسن ئەمە کام ئیستگەیە ، ئیتر چۆن ئەتوانن بگەنە
ـ ڕەکەی دەرەوەی ئێستگەو شت بکڕن ؟ بۆیە پیرێژنەکان
بۆ ترس خۆیان گەیاندە بەر پەنجەرەکانی شەمەندەفەرەکە .

ئەگەر « ڤاسیا » لەم سەری شەمەندەفەرەکەوە
وەستایە ئەوان لەو سەرەوە پیا ئەهاتن ، ئەو لەو سەرەوە
دەستی پێبکردایە ئەمان لەم سەرەوە شتیان ئەفرۆشت ،
ئەچی ئەم جارە « ڤاسیا » ناوەڕاستی هەڵبژارد ، بۆیە
پیرێژنەکان پڕیان کرد بەشتەکانیانداو بەرەو عەمارەکان رایان
کردو سیمیونۆڤناش بەدوایانداو خۆیان گەیاندە یەکەم فارگۆنی
شەمەندەفەرەکەو هاواریان کرد : « تەماتە گێلاس ...
گەنمەشامی ! ... »

زۆرکەس گەنمە شامییان کڕی ، بەلام کەس خۆی لە
تەماتە نەگەیاند . « ڤاسیا » خۆی وا پیشان دابوو کە لە
ناوەڕاستدا ئەمینێتەوە بەلام لەپڕ خۆی گەیاندە فارگۆنی
پێشەوە ، پیرێژنەکان شلەژان و خۆیان شاردەوە .
« سیمیونۆڤنا » فێڵبازانە بەژێر شەمەندەفەرەکەدا چووە
ئەو دیوو بەڕاکردن خۆی گەیاندە ئەو سەرو هاواری کرد

- « تەماتەی جوان ... تەماتەی گەییو ... »

... ی ئەکردو تەنوورە ڕەشەکەی لە دەوری قاچە
... عەماراوییەکانیدا بووبوو بەچەتر . ماوە کەم بوو ، و نە ئەبوایە
... وەستایە .

... فارگۆنی « پلەی یەکەم » دوە بێجامە لەبەرێك پرسی نرخی
چەندە ، بەلام لەوە نە ئەچوو مەبەستی کڕین بێ ، لە فارگۆنێکی
ترەوەو لاوێك بانگی کرد : « تەماتە ، وەرە ! »

- « چەندت ئەوێ ؟ »

- « دەدانە »

- « بگرە »

بەلام لەبەر ئەوەی شەمەندەفەرەکە جوولاو کوڕەکە
پارەی وردەی ئامادە نەکردبوو تەماتەکانی دایەوە دەست و بە
پێکەنینەوە ووتی : « ئاخ ... فریا نەکەوتم ، لە ئێستگەی
... هاتوو ئەیکڕم ! »

« سیمیونۆڤنا » لە شەمەندەرەکە دوور کەوتەوەو کە
... رگۆنێکی « پلەی یەکەم » بەلایدا تێپەڕی لە پەنجەرەکەوە

« کۆلای » کوڕی بینی ! لەلای ئەفسەرێکەوە وەستابوو
پەنجەی بۆ دەشتەکەی ئەو دیوەوە ڕائەکێشا « سیمیونۆڤنا »
چاوەکانی کەوتنە ڕەشکەو پێشکە کردن ، وای زانی کوڕەکەی
بەقسە کردنەوە خەریك بووە بۆیە نەیتوانی دابەزێ . بەدوای
شەمەندەفەرەکەدا ڕایکردو هاواری کرد : « کۆلا ... کۆلا ... »
لەوە ئەچوو کۆلا بەدی کردبێ بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕووی لە
پەنجەرەکە وەرگێڕا سیمیونۆڤنا لە تاودا لەو شوێنە تەختاییەدا
قاچی تەتەڵەی کردو ڕەتێکی بردو خەریك بوو بکەوێ .
تەماتەکانی کەوتنە خوارەوەو بەو ناوەدا بڵاو بوونەوە . خەمی
بۆ ئەوە نەخوارد کە هەموویان خۆڵاوی بوون ، خەمی بۆ ئەوە
خوارد کە شکان ... کە دەستی کرد بە کۆ کردنەوە یان
« ڤاسیا » ی پۆلیسیش لەگەڵیدا کۆکردەوەو چەند
هەڕەشەیەکیشی لێکرد . بەلام چونکە شەمەندەفەرەکە
ڕۆیشتبوو ئیتر لە ڤاسیانە ئەترسا لەگەڵ ئەوەشدا هەر بۆ ڕێز
گرتن پیی ووت « باشە ڤاسیا » جارێکی تر لێرە هیچ
نافرۆشم »

تەماتەکانی بەخاولییەکە سڕییەوەو چووە وە
شوێنەکەی خۆی لای ئۆلگاوە ئەمەندە ماندوو بوو بە هەزار
حاڵ گەیشتەوە ئەوێ ... بیری کردەوە : « چاوم کزبووەو ڕەنگە
ئەو نەبووبێ ئەگینا دائەبەزی ! »

شەمەندەفەری داهاتوو پاش سەعات و نیوێك ئەهات و
پیرێژنەکان دووبارە دەستیان کردەوە بەقسە کردن .

دنیا گەرم بووو ئەوەندە چۆڵ و بێ دەنگ بوو چرکەی
سەعاتە گەورەکەی ئێستگەکە ئەبیسترا . « ڤاسیا » لە بۆفیکە
سێ شووشە شەربەتی کڕی و خستنیە کیسەکەیەوەو ڕۆیشتەوە
ماڵی نان بخوات . زۆر جار کە ئەڕۆیشتەوە دوا ئەکەوت و فریای
شەمەندەفەری داهاتوو نەئەکەوت ، بەم ڕۆژە گەرمەش ڕەنگە
دوابکەوێ « سیمیونۆڤنا » وردە وردە هاتەوە سەر خۆی و دڵی
خۆش بووەو . بیری کردەوە : ئەم تەماتانە ئەفرۆشێ و تەماتە
سەوزەکانی ماڵەوەش پێ ئەگەن و ئەوانیش ئەفرۆشێ ،
ئەوساش پیوی بەرازو میوەی وشك کراوی پێ ئەکڕێ و سواری
شەمەندەفەر ئەبێ و ئەچێت بۆ لای کوڕەکەی . بەخۆشی ووت :

- « بێ گومان کۆلانەبوو ، و یەکێکی تربوو ، بۆچی لەم
جیهانەدا دووکەس نییە لەیەك بچن ؟ ... زۆر کەس هەن لەیەك
ئەچن ! »

چیرۆکی : ئەلیکساندەر پۆشکین



# نیشانگە

سوێندم خواردووە بەهەقی تەقەی بەرانبەری

بیکوژم . (هێشتا تەقەیەکم قەرزارە .)

* شەوێك لە بیڤۆ واك *

1

لە شــارۆچکەی (س) جێگــیر بوو بــووین . هەمــووتان دەزانن ژیانی ئەفســەری سوپــا چۆنــە : بەیــانیان مــەشق و ســواری ، قاوەڵتی لەمــاڵی سەرکــردەی فەوج یــا لە ئوتێــلی جوولەکەیەك ، و شەوانیش خواردنەوەو قومار . دەرگای دوا مــاڵی شارۆچکــەکەمــان لێ داخرابــوو ، کچی عازەبیش خــوا بڕیبووی . بۆیە ناچار لە مەڵبەندی یەکتریدا کۆ دەبووینەوەو هەر لە بەرگی یەکتری ورد دەبووینەوە .

لە کۆمەڵەکەماندا تەنیا کابرایەك هەبوو سوپایی نەبوو . ئەم کابرایە گەرچی تەمەنی سی و پێنج ساڵێك دەبوو بەلام لەچاو ئێمەدا پیر بوو . بەحوکمی شارەزایی فــەزڵی بەســەرمانــەوە هەبوو ، جگە لەوەش لەبەرئەوەی زۆربەی کات خەمبارو گرژو زمان پیس بوو کاریگەری یەکی زۆری لەسەر ئــەقڵی ئێمــەی هەرزەکار هەبوو . ئەمە کاتی خۆی لەڕیزی هێزی ســوارەدا بــووەو تابــلۆی لێهاتــووش بووە کــەس نەیدەزانی چی وای لێکردبوو واز لە سوپا بێنێ و لەشارۆ چکەیــەکی بێ بایــەخی ئاوادا پاڵی لێبداتەوەو ژیانێکی سادەو لەهەمان کاتدا دەست بڵاوانە بەسەر بــەرێت . بە پــاڵتۆیــەکی ڕەشی دڕاوەوە بەپێ دەهات و دەچوو ، کەچی دەرگای بــۆ هەمــوو ئەفســەرەکانی فەوجەکە لەسەر پشت بوو . گەرچی قاوەڵتییەکەی لەدووسێ

ﺶﺘ زیاتر نەبوو کە لەلایەن کۆنە سەربازێکەوە ئامادە دەکرا ، بەڵام شەمپانیا پەیتاپەیتا دەبەشرایەوە . مەگەر خوا بزانێ سەرچاوەی سامان و دەستهاتی چی‌بوو ، خۆ کەسیش زاتی نەدەکرد ئەو پرسیارەی لێ‌بکات . ژمارەیەکی باش کتێبی هەبوو کە هەمووی بریتی بوو لە ڕۆمان و کتێبی سوپایی ، هەمووکەس حەزی هەبوو بێ‌پەلەکردن لەگێڕانەوەیاندا بیان خوازێت . ئیشی سەرەکی ئەم کابرایە دەمانچە تەقاندن بوو . هەموو دیواری ژوورەکەی بە فیشەك وا دابێژابوو ، دەتوت شانەی هەنگە . کوخە بچکۆلە قوڕینەکەی جگە لە هەندێ دەمانچە ، هیچی تری تێدا نەبوو شایانی باس بێ . سەلیقەیەکی بێ‌پایانی هەبوو لە تەقەکردندا . ئەگەر بیویستایە هەرمێیەك بکات بە نیشان ، هەموو ئەندامانی فەوجەکە ئامادە بوون بێ‌سێ ودوو هەرمێکەی لەسەر شەپقەکەیان بۆ بنێنەوە . زۆرجار باس دەهاتە سەرباسی تەقەی بەرامبەری ، بەڵام سیلڤیۆ (با ئەوە بکەین بەناوی) هەرگیز بەشداری نەدەکرد . ئەگەر لێیان بپرسیایە ئاخۆ قەت تەقەی بەرامبەری‌ی کردووە ، ئەوا بە بێ‌زەوقی یەکەوە دەیوت : کردوومەو ئیتر درێژەی پێ‌نەدەدا . دیاربوو بەوجۆرە پرسیارە قارس‌بوو . ئێمەش هاتبووینە سەر ئەو بڕوایەی ئەم‌کابرایە دەبێ‌بەهۆی دەست‌ومشتی بێ‌وێنەیەوە ویژدانی تووشی گوناهێك بووبێت . ئەوەش بڵێم هەرگیز گومانی ترسنۆکیمان لێ‌نەدەکرد ، زەلامی وامەیە هەر تەنیا سەرو ڕووخساری پیاو دڵنیا دەکات . ماوەیەك لەوەو دوا شتێك ڕووی‌دا کەبووە مایەی سەرسامی هەمووان .

ڕۆژێکیان دەوروبەری دەکەس لە ئەفسەرەکان لەماڵی سیلڤیۆ قاوەڵتیمان دەکرد وەك هەموو جارێك بڕێکی باشمان خواردەوە . دوای قاوەڵتی داوامان لە خانەخوێ کرد بانقمان بۆدابنێ . زۆر نارەزایی دەربڕی چونکە بەدەگمەن قوماری دەکرد ، بەڵام سەرەنجام داوای کرد کاغەزبێنن ، نزیکی پەنجا دە ڕۆبڵ‌یەکی لەسەر مێزەکە خڕکردەوەو دەستی‌کرد بەوەرەقە دابەش‌کردن . هەموو دەورەمان داو یاری دەستی پێ‌کرد . سیلڤیۆ عادەتی وابوو لەکاتی یاریدا ئەوپەڕی بێ‌دەنگ بێ‌و هیچ قسەو باس نەکات . ئەگەر بهاتایەو یاریکەرێك غەڵەتێکی بکردایە ، سیلڤیۆ یەکسەر هەموو پارەکەی بۆ دەگێڕایەوە یان زیادەکەی دەخستە لاوە . ئێمە هەموو شارەزای ئەمە بووین‌و وازمان لێ دەهێنا بەکەیفی خۆی بجووڵێتەوە . بەڵام ئەمجارە ئەفسەرێکمان لەگەڵدا بوو تازە بۆ فەوجەکەمان ڕاگوێزرابۆوە ، بەدەم یاریەوە ، لەخۆیەوە بانقەکەی زیاد کرد . سیلڤیۆ تەباشیرێکی هەڵ‌گرت‌و وەك هەموو جارێك ڕاستی‌کردەوە . ئەفسەرەکە کەلای وابوو سیلڤیۆ بەهەڵەدا چووە ، ویستی مەسەلەکە ڕوون بکاتەوە ، بەڵام سیلڤیۆ بێ‌دەنگ درێژەی بەیاری‌دا . ئەفسەرەکە لەحەوسەڵەیدا نەما ، فلچەیەکی هەڵگرت‌و ئەوەی بەهەڵەی دەزانی سڕیەوە . سیلڤیۆش تەباشیرەکەی هەڵگرت‌و دووبارە ژمارەکانی نووسیەوە . ئەفسەرەکە کە شەراب‌و قومارو قاقای هاوڕێکانی سەری گەرم کردبوو ، ئەوەی سووکایەتی دانا ، شەمعدانێکی زیوینی لەسەر مێزەکە هەڵگرت‌و هاویشتیە سیلڤیۆ ، باش بوو ئەم لەدواساتدا خۆی لێ‌لادا . ئێمەزۆر دڵگران بووین ، سیلڤیوش لەرقدا سپی هەڵگەڕابوو ، چاوی ئاگری لێ‌دەباری ، هەستایە سەرپێ‌و وتی : «قوربان پیاوی چاك‌بە بڕۆو سوپاسی خوابکە کەئەمە لەماڵەکەمدا ڕووی‌دا .»

ئیتر ئێمە سەرەنجامی مەسەلەکەمان لاڕوون بوو ، هاوڕێ تازەکەمان لەڕیزی مردووان دادەنا . هاوڕێ چووە دەرەوەو وتیشی . کەی کابرای سەر بانق پێی خۆشە ئەو ئامادەیە بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی تۆڵەی ئەو سووکایەتی‌یە . تۆزێکی تریش درێژەمان بەیاری دا ، بەڵام دیمان خانەخوێکەمان هیچ ئاگای لەیاری نیە . بۆیە یەکە یەکە ماڵ ئاواییمان کرد ، هەر کەس بۆ مەڵبەندی خۆی ، بەدەم ڕێشەوە باسی ئەو فرمانە شاغیرەمان دەکرد کە وا بەڕێوەیە .

بۆ ڕۆژی دوایی لەمەشقی سواریدا لەیەکتریمان دەپرسی : تۆبڵێی ئەوئەفسەرە بەستەزمانە ئێستا زیندووبێ ، کەچی ئەوەندەمان زانی خۆی دەرکەوت . هەمان پرسیارمان لێ‌کرد ، لەوەڵامدا وتی هێشتا هیچی لەسیلڤیۆوە پێ نەگەیشتووە . ئەمەش ئێمەی سەرسام‌کرد . کاتێ چووین‌بۆ ماڵەوە بۆلای ، دەبینین کاغەزێکی ئاسی بەدەرگاکەیەوە هەڵواسیوەو فیشەك لەدوای فیشەك نیشانی لێ‌دەگرێ . وەك هەموو جارێك بێ‌ئەوەی وشەیەك لەبارەی بەسەرهاتی ڕۆژی پێشووەوە بدرکێنێ ، بەخێرهاتنی کردین . سێ‌ڕۆژی تریش تێپەڕی کەچی ئەفسەرەکە هێشتا زیندوو بوو . بەسەرسامی‌یەوە لەیەکتریمان دەپرسی : تۆبڵێی سیلڤیۆ بەتەمای شەڕ نەبێ ؟ . لەڕاستیدا سیلڤیۆ شەڕی نەکرد ،

بیانوویەکی بچکۆلەی بۆ خۆی هێنایەوەو لەگەڵ ئەفسەرەکەدا ئاشت بووە .

ڕەنگە ئەمە تا ڕادەیـەکی باش پلەی کـابرای لەچـاوی لاوەکاندا کەم کردبێتەوە ، چونکە بەلای گەنجانەوە کە لایان وایە ئازایەتی بەرزترین سیفەتەو بۆی هەیە زۆر کەمایەتی پیاو بپۆشێت ، ترسنـۆکی دواشتە پیـاو ڕێبەخـۆی بدات چـاوی لێبپۆشێت . بەهەر حاڵ مەسەلەکە وردە وردە بەتەواوی لەبیر چووەو سیلفیۆ کاریگەری پێشووی بەدەست هێنایەوە .

تەنیا من نەهاتمەوە سەرخۆم ، لەبەر ئەوەی سروشت خەیاڵێکی ڕۆمانتیکی پێ بەخشیبووم و لەوەو پێشیش لەهەموان زیاتر ڕێزی ئەم کابرایەم دەگرت کەژیانی مەتەڵێك بوو بۆخۆی و بەپاڵەوانی چیرۆکێکی سەیـرم دەزانی . ئەویش هـەروا منی بەدڵ بوو . من تەنیا کەسێك بووم کەئەوکابرایە لەگەڵیدا لەکەلی شـەیتانی زمـان بەسـتـراوی دەهاتـە خوارەوەو لەسـەرخۆو بەزەوقێکی سەیـرو نائـاسایی یـەوە باسی جـۆرەها شتی بـۆ دەکرد . بەلام هەرگیز ئەو شەوەم لەیاد نەدەچووەوە کە کـابرا بـەئارەزووی خـۆی نەیـویست ئەو لەکـەیەی سـەر شەرەفی بسڕێتەوە . ئەم بیرەوەرییەش وای لێ کردبووم نەم دەتوانی وەك جاران لەگەڵی بجوولێمەوە . شەرمم دەکرد سەیری چاوی بکەم . سیلفیۆش خۆ لەوگەلحۆیانـە نەبـوو وەك هیچ نـەدیو تێبینی هەموو شتێك نەکات و پەی بە هۆیەکەی نەبات . دیار بوو پێشی دلگران دەبوو . ئەوەی ڕاستیش بێ جارێك نا دووجـار هەستم کرد کابرا دەیەوێ داخی دلیم بۆ هەڵبڕێژێت ، بەلام من خۆم لەو جۆرە هەلانە لادەداو سیلفیۆش ئەوەندە سوور نەبوو لەسەری . ئیتر لەوە بەدوا هەر لەناو برادەراندا دەم بینی ، گفتوگۆکانی جارانم لەگەڵیدا بڕایەوە .

دانیشتووانی تێرو تەسەلی شارەگەورەکان ئاگایان لەو هـەستو نـەستـانـە نیـە کـە بـەنیسبـەت خـەڵکی لادێو شارۆچکەکـانەوە شتێکی ئـاسایی یـە . ، بۆ نمـوونە وەکـوو چاوەڕوانیی ڕۆژی گەیشتنی پۆستە . ڕۆژانی سێشـەممەو هەینی مەلبەندی سەرکردایەتی فەوجـەکە لەبـەر ئەفسـەرو پلەداران بەر نەدەکەوت : هەندێکیان چاوەڕێی پارە بوون ، هەندێکیان نامەو ئەوانی تریش ڕۆژنامە . نامەکان لێرەو لەوێ دەکرانەوە ، دەنگوباس بۆیەکتری دەگێڕرایـەوەو بەم جـۆرە مـەلبەنـدەکە جـۆش و خرۆشی تێدەکـەوت . سیلفیـۆش کـە نامەکانی لەڕێگەی فەوجەکـەوە پێدەگەیشت سـەری لەوێ دەدا . ڕۆژێکیـان نامـەیەکی پێگـەیشت ، بـە پـەلە پـەلەو بێئارامی یەوە هەڵی پچڕی ، هەرکە چاوی بە نـامەکـە کەوت شلەژا . ئەفسەرەکان هەر یەکە مەشغووڵی نامەی خۆی بوو ، تێبینی هیچیان نەکرد .

«جەنتڵمانینە !» ... سیلفیۆ هاواری کرد ، «زرووف وا پێویست دەکات بـەزووترین کـات ئێرە بـەجێ بهێڵم . دەبێ ئـەمشەو بـڕۆم . لەو باوەڕەدانیم حـەز نەکـەن بـۆ دواجـار تەشریف بهێنن بۆ قاوەڵتی . چاوەڕێتان دەکەم .» ئینجا ڕووی کـردەمن و لەسەری ڕۆیشت : «تـۆش پێویستـە بێیت .» بەم قسانەوە بەپەلە مـەلبەنـدی سەرکـردایەتی بـەجێ هێشت و ئێمـەش دوای ئەوەی ڕێکـەوتین لەمـاڵی سیلفیـۆ یـەکتـری ببینینەوە هەریەکەمان ڕۆیشت بەڕێی خۆیەوە .

من لەکـاتی دیاریکـراودا گەیشتمـە ماڵی سیلفیـۆودیم نزیکەی هەموو فەوجەکە لەوێن . کابـرا هەمـوو شت و مەکی پێچـابۆوە ، هـەر دیوارە ڕووتـە گوللە ئـاژنەکـان دەستی لێ نەدرابوو ، دەوری سفرەماندا ، خانەخۆی تابلێی بەکـەیف بوو ، زۆری نەبرد ئەم بەکەیفی یە هەموو میوانەکانی تەنیەوە . لەگەڵ هیوای سـەفەری سـەلامەت و خـۆش بەختی کـابرای سەفەر لەبەردا ، هەر شووشە شەراب بوو هەڵ دەپچڕاو مەی بوو کەف دەکـردو پێك بـوو چزەی دەهـات ، تا شـەو درەنگ مابنەوە . دوایی شەپقەکانمان هەڵگرت و سیلفیۆ یەکـە یەکـە خـواحافیـزی لێکردین . پێش ئـەوەی بچمە دەرەوە دەستی گرتم ، وەستاندمی و بەدەنگێکی نـزم وتی : «دەمەوێ چـەند قسەیەکت بۆ بکەم .» منیش مامەوە .

میوانەکان هەموو ڕۆیشتبوون ، هەر هەردووکمان بەجێ مابووین . بەرامبەری یەك دانیشتین و بێ دەنگ سەبیلەکانمان داگیرسان . سیلفیۆ خەیاڵی ڕۆیبوو ، هیچ کەیفەکەی تـۆزێك لەوەو پێشی نەمابوو . ڕەنگی زەردو چاوی ئاگرین و ئەو دووکەلە خەستەی لەدەمی بـەرز دەبۆوە ، وای لێکـردبوو لەدێـوێکی ڕاستی بچێ . دوای چەند دەقەیەك سیلفیۆ پەردەی بێدەنگی دڕاند .

«لەوانەیە ئیتر هەرگیز یەکتری نەبینینەوە ، پێش ئەوەی بڕۆم حەزدەکەم چەند قسەیەکت بۆبکەم . ڕەنگە خۆشت بزانی

ـ گوێ نادەمە ئەوەی ئەوانی تر چۆنم تێ دەگەن ، بەلام تۆم حـۆش دەوێو پێم ناخـۆشە بـەو ئینتیباعـە هەڵەیـەوە کەلە ـرەمەوە وەرت گـرتووە ، بـەجێت بهێڵم .» . ئینجا وەستـاو ـمستی کرد بەپڕ کردنەوەی سەبیلەکـەی . من سەرم شـۆڕ کرـبووەو چرکەم لەخۆم بڕیبوو .

«بەلاتەوە سـەیر بـوو ؟» .. لەسەری ڕۆیشت .. «کـە ـ خی خۆم بەو کابرا سەرخۆشە (ڕ) نەڕشت ؟ ! . تۆش لەو ـوەرەدایت کە مادام هەڵبژاردنی چەك بەدەستمن بوو یانی ژیانیشی لەژێر ڕەحمەتی دەستی منداببوو ، بەلام ژیانی خۆم بێ مەترسی بووە . تۆ حەز دەکەی ئەو لەسەرخۆیی‌یەم بگێڕەرەوە ـو دلگەورەییم ، کەیفی خۆتە ، بەلام حەز ناکەم درۆت لەگەڵ بکەم ، ئەگەر بمتوانیایە تـۆڵە لە ـ ڕ ـ بکەمـەوە ، بێ‌ئەوەی بەهیچ جۆرێك ژیانی خۆم بخەمە مەترسی‌یەوە ئەوا هەرگیز لێی خۆش نەدەبووم» .

بەسەر سامی‌یەوە سەیرێکم کرد ، ئەم دان پێدانانەی تەواو ڕای چڵەکاندم . سیلفیۆ لەسەری ڕۆیشت .

«بەلێ ، هەقی ئەوەم نیە ژیانم بخەمـە مەتـرسی‌یەوە . شەش سال لەمەو بەر شەپازللەیەکم خواردووەو دوژمنەکەشم هێشتا زرتو زیندووە» . زۆر حەزم‌دەکرد مـەسەلەکـە ڕوون ببێتەوە .

«ئـەی بۆ شـەڕت لەگەڵ نـەکـرد ؟» . پـرسی ، «دەبێ زرووف لێکی دابڕیبن !» .

«شەڕم لەگەڵ کرد .» سیلفیۆ وەلامی دایەوە ، «ئێستاش یادگاری شەڕەکەمانم لایە» .

هەستایە سەرپێو شەپقەیەکی سووری نەخش کراوی لەمقەبایەك دەرهێنا . شەپقەکە قەیتانی زەرکەشی پێوە بوو ، لەو جۆرەی فەرەنسایی‌یەکان پێی دەڵێن (بۆنێ دو پۆلیس) . کاتێ شەپقەکەی لەسەرکرد دیم هـەریەك ئینـچ لە ژوور ناو چاوانیەوە کونی گوللەیەکی تێدایە .

«ئاگات لەوەیە ...» . سیلفیۆ لەسـەری ڕۆیشت .. «کە منکاتی خۆی لە فـەوجی سوارەی ـ ن ـ دا بـووم . خۆشت مەیلو میزاجم دەناسی . دەزانی ڕاهاتووم لەهەموو شتێـك‌دا یەکەم . بەلام لە سەردەمی لاوێتیمدا ئەوە هەوەسو ئارەزووم ـوو کاتی ئێمە باوی شەڕ فرۆشتن بوو ، منیش یەکەم سەر ـەگوبەندی سویابووم . زۆر شانـازیمان بـەسەرخـۆشی‌یەوە دەکرد . تەنانەت جارێك بەخۆشی بـۆرتسۆڤی بـەناوبـانگەوە مەستبووم کە دێنیس داڤیدۆڤی شاعیر ناوی خستۆتـە ڕیزی نـەمرانـەوە . هەر سـات ناسـاتێك تـەقەیـەکی بەرامبـەری لەفەوجەکەماندا ڕووی دەداو منیش لەزۆربەیاندا یان‌دووەم بووم یان بەشدارێکی چالاكبووم . هاوڕێکانم زۆر پێم سەرسام بوون . بەلام سەرکردەکـانی فەوجـەکە کـەیەك لەسـەریەك دەگۆڕان بەپیاو خراپێکی بێ‌چەندو چوونیان دادەنام .

«منیش بـەئـاسـوودەیی (یـا ڕەنگـە ئـەوەنـدەش بەئاسوودەیی نەبووبێ) کەیفم بە ناوبانگم دەهات . تا کوڕێکی گەنجی دەولەمەند کەبۆنی پلەو پایـەیەکی دیـاری کراوی لێ دەهات ، هاتە فەوجەکە مانەوە . لە ژیـانمدا کـەسی وەك ئەو کـەشخەو بـەختەوەرم نـەدیوە . بیهێنـە بەر چـاوی خۆت : لاوێتی ، ئەقل ، قۆزی ، هەڵەشەیی ، ئازایـەتی‌ی بێ‌وێنە ، ناوبانگ ، پارە کە بەهەر چوار لادا پەرشی دەکردەوەو تـەواو بوونی نەبوو . ئینجا هەوڵ بدە بزانە دەبێ چ ئینتباعێك لەسەر ئێمە دروست دەکات ! . نازناوی پـاڵەوانێتیم کەوتـە لێژی . لەسەرەتاوە کە ناوبانگمی بیستبوو ، هەوڵی دا خۆی بکات بە هـاوڕێم . بەلام من بـەساردی وەلامم دایـەوەو ئـەویش بێ دڵگـرانی وازی هێنا . هـەستم کرد زۆر ڕقم لێیـەتی . ئـەو ناوبانگەی لە فەوجەکەو لە ناو ئافرەتاندا هەیبوو ، ئیمانیـان لەکەللەمدا نەهێشتبوو . هەولم دا شەڕی پێبفـرۆشم بەلام هەمیشە ڕێی لەفڕوفێڵەکانم دەبەستەوەو بـەو فڕوفێـلانەی خۆی کەهەمیشە بەلامەوە لەوانەی‌من زیرەکانەترو لەڕاستیدا تابلێی لەوانەی من چاکتربوون . ئەو هەموو شتێکی بـەگاڵتـە دەگرت . بـەلام نیازم ژەهـراوی بوو . سـەرەنجام شەوێکیان لە ئاهەنگێکدا لەماڵی خاوەن مولکێکی پۆلۆنیایی بینیم بووەبە گوڵی مەجلیسی هەموو خانمەکان ، بەتایبەتیش خانمی ماڵەکە کە ئەوکاتە من مەسەلەیەکم لەگەڵیدا هەبوو . هەندێ قسەی ناشیرینم چرپاند بە گوێیدا سوور بووەو شەپازللەیەکی لێدام . هەردووکمان پەلاماری دەسکی شمشێرەکانمان دا . ئافرەت لەوناوەدا بوورانەوەو خەڵکـەکە بـەزۆر لێکیان جیـا کردینەوە . بڕیارمان دا هەر ئـەو شەوە تـەقەی بـەرامبەری بکەین .

«شەبەقی دابـوو . من لەشوێنی دیـاریکراوی خـۆمدا لەگەڵ سێ دوو هەمەکەمدا وەستابـووم و بەبێ ئـارامی‌یەکی

لەباس نەهاتووەوە چاوەڕوانی دوژمنەکەمم دەکرد . کات بەهار بوو ، خۆر زوو هەڵات و دنیا گەرمی کرد . لە دوورەوە دیم چاکەتەکەی داوە بەسەر شمشێرەکەیدا و لەگەڵ یەك تاقە دووهەمدا بە پێ بەرەو لامان دێ . بەرەو پیری چووین . نزیك بووە ، شەپقەکەی پڕکردبوو لەهەڵووژەو گرتبوویە دەستیەوە ، دووهەمەکان دوازدە هەنگاو لێمان دوور کەوتنەوە . بڕیار بوو من یەکەمجار تەقەبکەم ، بەڵام ئەوەندە تووڕە بووبووم باوەڕم بە ڕاستی و جێگیری دەستم نەدەکرد . بۆیە یەکەم تەقەم بەخشی بەو ، بەڵام دوژمنەکەم بەمە ڕازی نەبوو . جا بڕیار درا یانسیبی بۆ بکەین . ئەو بۆی دەرچوو ، بەخت چۆن هەمیشە پشتی دەگرێ ! . نیشانەی لێ گرتم و شەپقەکەمی پێکا . ئینجا سەرەی من بوو ، سەرەنجام ژیانی کەوتە بەر دەستم . بەوردی تێم ڕوانی تا کەمترین نیشانەی نیگەرانی لەدەموچاویدا بەدی بکەم . بەرامبەر دەمانچەکەم وەستابوو ، هەڵووژەی گەیوی لە شەپقەکەی دەردەهێناو ناوکەکەی تف دەکردەوە بەرەو لای من . ئەم ساردییەی کەللەیی کردم . لە دڵی خۆمدا وتم : جێی چی دەگرێ لەو ژیانە بێ بەشی بکەم کە بەلایەوە هیچ نیە ! . خەیاڵێکی شەیتانی بەمێشکمدا ڕەت بوو . ئەو دەستەم نزم کردەوەکە دەمانچەکەم پێ گرتبوو .

«وابزانم کاتی ئەوەت نیە بیر لەمردن بکەیتەوە .» . من پێم وت ، «زۆرحەز دەکەی بەرچایی بکەیت بۆیە نامەوێ لێت تێك بدەم .» .

«بەهیچ جۆرێك لێم تێك نادەیت» . وەڵامی دایەوە ، پیاوی چاك بە پەنجەی پێدا بنێ . بەهەر حاڵ خۆت چۆنت پێ خۆشە با وابێ . تەقەیەکت قەرزارم و هەمیشە لە خزمەتتدام» .

ئاوڕم دایەوە بەلای دووهەمەکانمدا و پێم وتن ئێستا نیازی تەقاندنم نیە . بەم جۆرە تەقە بەرامبەرییەکەمان دوایی هات .

«سوپام بەجێ هێشت و لەم شوێنە بچووکەدا دامەزرام ئیتر لەوساوە ڕۆژنەبووە خەیاڵم لای تۆڵەسەندنەوە نەبێ ، وا ئێستاش کاتی هاتووە» .

سیلفیۆ ئەو نامەیەی لەباخەڵی دەرهێنا کە ئەم بەیانییە پێی گەیشتبوو ، دای پێم بیخوێنمەوە . کابرایەك (دەبێ پارێزەرەکەی بێ) لەمۆسکۆوە بۆی نووسیبوو گوایە فلان زەلام بەم زووانە زەماوەندی مارەکردنی کچۆلەیەکی جوان دەگێرێ .

«هەلت هێنا ،» سیلفیۆ وتی ، «ئەم فلان زەلامە کێیە ؟ . وادەچم بۆ مۆسکۆ تابزانم ئەمجارەش لەدەمەدەمی زەماوەندیدا بەهەمان ئەو بێباکییەوە ڕووبەڕووی مردن دەبێتەوە وەك ئەو کاتەی شەپقە هەڵووژەکەی پێ بوو ؟ !» .
دوای ئەوە سیلفیۆ هەستایە سەرپێ و شەپقەکەی فڕێ دایە سەر زەوی و وەك پڵنگی بەند کراو بە ژوورەکەدا کەوتە هات و چۆکردن . من چزکەم لەخۆم بڕیبوو ، ئاگام لێ بوو چۆن جۆرەها هەستو نەستی ناکۆك ناکۆك وروژاند بووی .
خزمەتکارەکەی هاتە ژوورەوەو وتی ئەسپەکان ئامادەن . سیلفیۆ بەگەرمی دەستی گوشیم ، باوەشمان کرد بەیەکدا . سواری عارەبانەکەی بوو . دوو سندووق لەعارەبانەکەدا بوو ، یەکێکیان دەمانچەی تێدابوو ، ئەوی تریان شتومەکی خۆی . جارێکی تریش خواحافیزیمان کردو ئەسپەکان دایانە غار .

## 2

چەند ساڵێك تێ پەڕی . زرووف ماڵەوە ناچاری کردم لەگوندێکی هەژاری ناوچەی (س)دا جێگیرببم . هەمیشە بەدەست سەرۆکاریی مولکەکانمەوە شپرزە بووم و داخم بۆ ژیانی پێشووی پڕ ئاشووب و بێخەمم دەخوارد . زەحمەتترین شتکە ڕاهاتن لەگەڵیدا ئەستەم بوو ، شەوانی تەنیایی پایزو زستان بوو . هەولم دەدا تاکاتی قاوەڵتی هەر چۆنێك بووە کات بەسەر ببەم ، قسەم لەگەڵ موختاری دێ دەکرد ، لێم دەخوڕی بۆ لای مولکەکانم تا سەیرێکی ئیش و فرمان بکەم ، یان سەرم لە پڕۆژەی تازە دەست پێ کراو دەدا . بەڵام کە تاریك دادەهات نەم دەزانی خۆم بەچییەوە خەریك بکەم . ئەو چەند کتێبە کەمەی لەسندووقی ئەم ئەولاو ژووری گەنجینەدا پەیدام کردبوو ، ئەوەندەم خوێندبوونەوە لەبەرم کردبوون . کیریلۆفنای ماڵ بەڕێوەبەریش چەندەها جار هەگبەی چیرۆکەکانی بۆ خاڵی کردبوومەوە . گۆرانیی ئافرەتان تەواو پەستیان دەکردم ئەگەر مەی سەری نەهێنامایەتە ژان ،

ـەونەبوو خووم بە خواردنەوەوە ، بگرتایە ، جگە لەوەش پیاو
ـو راست نەلێ ، دەترسام بەهۆی ئەمبێزاری‌یەوە ببم بە
ـەرخۆشێکی هەمیشەیی ، یانی سەرخۆ شێکی بێمانا ،
ـەوانەی لەناوچەکەماندا لەژمارە نایەن . دراوسێکانیشم تەنیا
ـوو سێ زەلامی وابوون لەو بەخت ڕەشانە کە نزگەرەو هەنسك
ـ ن زیاتر هیچیان لێ نەدەبیسترا . تەنیایی لە هاوڕێ‌یەتی
ئەوانە ئاسوودەترە .

چوار ڤێرست لەولامانەوە مولکە گرانبەهاکانی کۆنتێس
ـب) بوو ، بەلام لە پاسەوانێك بەولاوە کەسی تری لێ نەدەژیا .
کۆنتێس یەکجار ، لەیەکەم مانگی شوو کردنیدا دیدەنی
کردبوو ، مانگێك کەمتر لەوێ مابۆوە . لەدووەم سالی
تەنیاییمدا دەنگ بلاو بۆوە گوایە کۆنتێس و مێردەکەی نیازیان
وایە هاوین سەر لە مۆلکەکانیان بدەن . ئەوەبوو سەرەتای
حوزەیران گەیشتن .

دیدەنی دراوسێ‌یەکی دەولەمەند شتێکی گرنگە لە ژیانی
دانیشتووانی دێهاتدا . خاوەن مولك و دەست و بەرەیان
دوومانگ لەپێش و سێ سال لەدوای دیدەنی یەکەوە باسی
دەکەن . بەنیسبەت منیشەوە ، پیاو بۆ ڕاست نەڕوات ، هەللا
هەللای گەیشتنی دراوسێ‌یەکی جوان و جەهێل کارێکی زۆری
تێکردم . سووتاوی چاوەڕوانی بینینی بووم . دوای قاوەلتی
یەکەم یەکشەممەی دوای گەیشتنیان کەوتمەرێ بۆ گوندی
(س) تا خۆم بەو خاوەن شکۆیانە بناسێنم وەك نزیکترین
دراوسێ و ملکەچترین خزمەتکاریان .

خزمەتکارێك ڕێی نووسینگەی کۆنتی پیشان دام و خۆی
چوو ناوم بگەیەنێ . نووسینگەیەکی گەورەو تابلۆی جوان
ڕازاوە بوو ، دیوارەکانی بەڕەفەی پڕکتێب تەنرابوو ، لەسەر
هەر ڕەفەیەش نیوە پەیکەرێکی برنجە دانرابوو . لەسەر
ئاگردانێکی مەڕ مەڕ ئاوێنەیەکی گەورە قیت بووبۆوە ،
ئەرزەکەی بە قوماشێکی سەوز داپۆشرا بوو ، لەسەر
ئەوەشەوە فەرش ڕاخرابوو .

لەبەر ئەوەی لەمالی خۆم شتی‌وا نایابم نەدی بوو ،
دەمێکیش بوو ئاگام لە دەولەمەندی کەسانی تر نەبوو ، شەرم
دایگرتم و بە نیگەرانی و بێ ئارامی‌یەوە چاوەڕوانی کۆنتم کرد ،
وەك چۆن خاوەن داوایەك لە ناوچەیەکەوە چاوەڕوانی هاتنی
وەزیر دەکات . دەرگا کرایەوەو کابرایەکی لێ‌هاتووی سی و دوو
سالان خۆی کرد بەژووردا . کۆنت زۆر گەرم و دۆستانە لێم هاتە
پێشێ . دوای ئەوەی هەولمدا بەسەر حەپەسانمدا زال ببم ،
خەریك بوو خۆمی پێ بناسێنم ، بەلام ئەو دەست پێشکەری
کرد . دانیشتین گفتوگۆی لەسەر خۆو بەماریفەتی ، زۆری
نەبرد بەسەر شەرمی تەنیایی دوورو درێژمدا زال بوو .
ئەوەندەی نەمابوو تەواو بێمەوە سەرخۆم ، لەپڕ کۆنتێس خۆی
کرد بە ژووردا و یەکاویەك زیاتر لەپێشوو پەشۆکام . بەڕاستی
خولقاوێکی ناسك بوو . کۆنت پێ‌ی ناساندم ، منیش هەولمدا
خۆم هێمن پیشان بدەم . بەلام تازیاتر هەولم دەدا
هێمن ببمەوە ، زیاتر دەپەشۆکام . بۆئەوەی ماوەم بدەن بێمەوە
سەرخۆم و بەدانیشتنی ناوکۆڕی نەناسیاوان ڕابێم ، لەبەینی
خۆیاندا کەوتنە قسەو وەك دراوسێ‌یەکی دێرین منیان بێ زیادە
ماریفەت بەجێ‌هێشت . منیش بە ژوورەکەدا کەوتمە گەڕان و
سەیرکردنی کتێب و وێنەکان . گەرچی زۆر شارەزاییم لەبارەی
وێنەوە نەبوو ، بەلام وێنەیەکیان زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەویش
وێنەی دیمەنێکی دێهاتی‌ی سویسرەیی بوو ، بەلام وەنەبێ
وێنەکە خۆی لەخۆیدا سەرنجی ڕاکێشابم ، نەخێر ، بەلکوو دوو
کونی فیشەکی تێدابوو یەك ڕێك لەسەر ئەوی تر .

«نیشانچی یەکی چاك بووە .» ڕووم وەرگێڕا بۆ کۆنت و
وتم :

«بەلێ ، نیشانچی‌یەکی لێ هاتووە . تۆ نیشانچی‌یەکی
باش نیت ؟» .

«زۆر باش !» . وەلامم دایەوەو دلشاد بووم بەوەی
سەرەنجام قسەهاتە سەرباسێك کەمن زۆر حەزی لێ دەکەم .

«لەدووری سیی هەنگاوەوە کاغەزی قومار دەپێکم ، بە
دەمانچە ، چونکە دەستم بەدەمانچە ڕا هاتووە» .

«توخوا ؟ !» . کۆنتێس وەك زۆر حەزی لەباسەکە بێ
وەلامی دایەوە ، «ئەی گیانە تۆ دەتوانی لە دووری سی
هەنگاوەوە کاغەزی قومار بپێکی ؟» .

«ڕۆژێك تاقی‌ی دەکەینەوە .» . کۆنت وەلامی دایەوە .
«من کاتی خۆی نیشانچی‌یەکی خراپ نەبووم بەلام چوار سالە
دەمانچەم نەگرتووە بە دەستمەوە» .

«ئۆهۆو .» وتم ، «ئەگەر وابێ ، دلنیام ئێستا لە دووری
بیست هەنگاویشەوە لێ‌ی نادەیت . دەمانچە تەقاندن پێویستی
بە مەشقی ڕۆژانە هەیە من خۆم ئەوەم بەسەر هاتووە . کاتی

خۆی لەچاکترین نیشانچی‌یەکانی فەوجەکەمان بووم . بەلام جاریکیان یەك مانگی رەبەق دەستم لە دەمانچە نەدا ـ دەمانچەکەی خۆم لای وەستا بوو ـ ئینجا دەزانی چی خاوەن شکۆ ؟ . یەکەمجار نیشانی شووشەیەکم گرتەوە لەدووری بیست و پێنج هەنگاوەوە کەچی چوار جار لەسەر یەك لێم نەدا . کاپتنەکەمان کابرایەکی قۆشمەو قسە خۆش بوو، پێی وتم ـ هەمووکەس دەزانێ تۆ هی ئەوە نیت ئەو شووشەیە بپێکیت ! . ئاخ ، خاوەن شکۆ ، پێویستە مەشق پشت گوێ نەخەیت . ئەگینا ئەوەندەی پێناچێ هیچت بیر نامێنێ . چاکترین نیشانچی من ناسیبێتم هەموو رۆژێ مەشقی دەکرد ، بەلای کەمەوە رۆژی سێ فیشەکی پێش قاوەلتی دەتەقاند ، فەرز بوو لای ، وەك چۆن پێکێك فۆدکا پێش نان خواردن فەرزە» .

کۆنت و کۆنتێس زۆریان پێ خۆش بوو زمانم بەربوو .

«تۆزێکی تریش باسی دەستو مشتیم بۆ بکە» . کۆنت پرسی .

«دەزانی چی خاوەن شکۆ ، جاری واهەبوو دەی بینی مێشێك بەدیوارەکەوە نیشتوەتەوە ـ چی‌یە کۆنتێس دەبینم پێکەنینت دێ ، بەلام بەخوا راستت پێ دەڵێم ـ ئێ ئیتر مێشێکی .ەدی بە دیوارەکەوە یەکسەر هاواری دەکرد ـ (کوزا) دەمانچەکەم ! . کوزا دەمانچەی پری بۆ دەهێناو لەگەڵ ناڵەیەکدا مێشەکە بە دیوارەکەوە دەفلیقایەوە» .

«بەراستی بێ وێنەیە» . کۆنت هاواری کرد ، «ناوی چی بوو ؟» .

«سیلڤیۆ ، خاوەن شکۆ» .

«سیلڤیۆ ؟ !» کۆنت بازی دایە سەرپێ و هاواری کرد .

«تۆ سیلڤیۆت دەناسی ؟ !» .

«بێگومان خاوەن شکۆ . من و سیلڤیۆ دوو هاورێی گیانی بووین . لە فەوجەکەماندا وەك یەکێ لەخۆمان پێشوازیمان لێ کرد . بەلام واپێنج ساڵە هیچم لەبارەیەوە نەبیستووە . یانی خاوەن شکۆ جەنابیشتان دەتان ناسی ؟ !» .

«بەڵێ ، منیش چاك دەم ناسی . قەت باسی بۆ نەکردوویت ... بەلام نا ، رێی تێ ناچێ ... قەت باسی دیمەنێکی گرنگی ژیانی بۆ نەکردووی ؟» .

«خاوەن شکۆ .. جەنابتان مەبەستتان لەو کاتەیە کە گەنجێکی کەشخەچی شەپازللەیەکی لێ دابوو ؟» .

«باشە قەت ناوی ئەو کەشخەچی‌یەی بۆ نەووتووی ؟ » .

«نەخێر خاوەن شکۆ پێی نەوتووم» .

لەپڕ راستی‌ی شتەکەم بۆ دەرکەوت .

«ئۆ ، خاوەن شکۆ بم بوورە ! .. بیری ئەوەم نەبوو . ئەوە تۆ بووی ؟» .

«ئا ، من بووم» . کۆنت بە پەشۆکاوی یەکی زۆرەوە وەڵامی دایەوە .

«ئەو وێنەیەش کە دوو گوللەکە لێی داوە ، یادگاری دوا یەکتربینیمانە ...» .

«ئۆ خوایە ،» کۆنتێس وتی ، «تکات لێ دەکەم باسی ئەوە مەکە ، دەزانی چەندی لێ دەترسم ..» .

«دەزانم بەلام دەبێ هەمووی بگێرمەوە .» کۆنت وەلامی دایەوە . «ئەم دەزانێ چۆن سووکایەتیم بەسەر برادەرەکەی هێناوە ، دەبا بشزانێ چۆن سیلڤیۆ تۆڵەی لێ کردمەوە» . کۆنت کورسی‌یەکی قۆڵداری بۆ راکێشام و فنیش بەوپەڕی زەوقەوە گوێم بۆ ئەم بەسەرهاتەی خوارەوە شل کرد .

«پێنج ساڵ لەمەو بەر ژنم هێنا . یەکەم مانگ ، یانی مانگی هەنگوینم لێرە ، لەم گوندە بەسەر برد . من خۆشترین رۆژانی ژیان و یەکێك لەناخۆشترین یادگارەکانیشم لەم خانووەدا بەسەر بردووە .

ئێوارەیەکیان پێکەوە چووینە دەرەوە . ئەسپی خێزانەکەم بەلەسە بوو ، ژنەکەم نیگەران بوو ، رەشمەکەی دایە دەست من و خۆی بەپێ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ، منیش بەسواری . عارەبانەیەکی سەفەریم لەحەوشەکەماندا بەدی کرد و لەوێ پێیان وتم جەنتلمانێك لە نووسینگەکەمدا چاوەڕێمەو نایەوێ ناوی خۆی بڵێت ، دەڵێ گوایە ئیشم پێ‌یەتی . کە چوومە ژوورەوە بینیم لێرەدا ، لەبەردەم ئەم ئاگردانەدا ، کابرایەکی تەپ و تۆزاوی ریش درێژ وەستاوە . بەرەو رووی چووم و هەوڵمدا بیرم بێتەوە کێ‌یە .

«کۆنت ، چی‌یە نام ناسیتەوە ؟ !» . کابرا بە دەنگێکی لەرزیوەوە وتی .

«سیلڤیۆ !» . هاوارم کرد ، ئەوی راستی‌بێ هەستم کرد ترس دای گرتووم .

«خۆیەتی ،» کابرا وتی ، «ئێستا سەرەی منە بتەقێنم .

ستووم دەمانچەکەم خالی بکەمەوە . ئامادەیت ؟» .

دەمانچەکەی لە باخەلی سەر سنگیەوە دیاربوو . دوازدە هەنگاوم ژماردو لەو سووچەدا ڕاوەستامو داوام لێکرد خێرا بکات ، پێش ئەوەی ژنەکەم بێتەوە پەنجەی پێدابنێ . بەلام ئەو نووی ڕووناکی‌یەوە خۆی دواخست . مۆمیان بۆهێنا ، دەرگام داخستو داوام کرد ڕێ‌ی‌کەس نەدەن بێتە ژوورەوە . ئینجا داوام لێکرد تەقەم لێ بکات . دەمانچەکەی دەرهێناو نیشانی لێگرتم . دەستم کرد بە چرکە ژماردن ، بیرم لە خێزانەکەم کردەوە . دەقەیەك بێ ئارامی‌ی تال تێپەڕی . سیلڤیۆ دەستی بەر دایەوە .

«بەداخەوەم ،» سیلڤیۆ وتی ، «دەمانچەکەم ناوکە هەنووژەی تێدانیە ، گوللەش زۆر قورسە . ناتوانم ، ئەمە بە تەقەی بەرامبەری دانانێم ، بەلکوو بەپیاو کوشتنی دەزانم . فێرنیم پیاوی بێ چەك بکوژم . بالەسەرەوە دەست پێ بکەینەوە . با یانسیب بکەین بۆ یەکەم تەقاندن» .

سەرم لێ دەرنەدەکرد ، ئەوەندەی لەبیرم بێ ڕازی نەبووم . بەلام دواجار دەمانچەیەکی ترمان هێنا . دوو پارچە کاغەزیشمان هێناو پێچامانەوە ، ئەو خستیە شەپقەکەیەوە ، ئەو شەپقەیەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان کوناو دەرم کردبوو . ئەمجارەش بۆ من دەرچوو . بەزەردەخەنەیەکی واوە کە هەرگیز لەیادم ناچێ وتی «کۆنت .. شەیتانیش بەختی وەکوو تۆی نیە» . نازانم چیم لێ بەسەر هاتبوو ، نازانم چۆن ڕێم پێ‌دا ئەوەم پێ بکات . بەلام بەهەر حال پەنجەم نا بەپەلەپیتکەداو ئەو وێنەیەم پێکا . (کۆنت پەنجەی بۆ وێنە گوللە کون کردووەکە ڕاکێشا .) ڕوومەتی سوور هەلگەڕا کۆنتیس ڕەنگی بوو بەکاغەزی سپی . منیش نەم توانی سەرسامیم بخۆمەوە .

«تەقاندم» کۆنت لەسەری ڕۆیشت ، سوپاس بۆ خوا نەم پێکا . ئینجا سیلڤیۆ .. لەو ساتەدا دیمەنی زۆر ترسناك بوو ... نیشانی لێگرتم . لەپڕێکدا دەرگا کرایەوەو ماشا بەهاوارەوە خۆی کرد بە ژووردا و خۆی هەلدایە سەر شانم . کە ئەوم بینی هاتمەوە سەر خۆمو پێم‌وت :

«گیانەکەم ، ئەوەتا بە سوعبەتمانە ، بۆ وات لەخۆت کردووە ؟ . بڕۆ تۆزێ ئاو بخۆرەوە ، ئینجا وەرەوە بۆ لامان دەمەوێ هاو پلەو هاوڕێ‌ی دێرینمت پێ‌بناسێنم» . ماشا هێشتا باوەڕی نەدەکرد .

«پێم‌بلێ ئەوەی مێردەکەم دەیلێ ڕاستە ؟» . ڕووی کردە سیلڤیۆی ترسناكو لێ‌ی پرسی .

«ڕاستە تەنها ئێوە ، هەردووکتان بە سوعبەتتانە . کۆنتێس ، کۆنت هەمیشە بەسوعبەتیەتی» . سیلڤیۆ وەلامی دایەوە ، «جارێکیان بەسوعبەت شەپازللەیەکی لێدام ، تەقەی لێ کردمو دای لە شەپقەکەم هەر بەسوعبەت ، ئێستاش هەر بەسوعبەت تەقەی لێکردمو نەی پێکام ئێستا منیش دەمەوێ سوعبەتێك بکەم .»

دووبارە خۆی واپیشاندا نیشانم لێبگرێ لەبەردەم ماشادا . ماشا خۆی هەلدایە سەر پێلاوەکانی .

«ماشا ، هەستە ، حەیام مەبە !» . لە تواناما نەماوهاوارم کرد ، «تۆش قوربان بەس گالتە بەو ئافرەتە بەدبەختە بکە ! . دەتەوێ تەقەبکەی یان نا ؟» .

«نامەوێ» . سیلڤیۆ وەلامی دایەوە ، «ئێستا دلم ئاوی خواردەوە . بەنیگەرانی‌و بێ‌ئارامی بینیمیت . ناچارم کردیت تەقەم لێبکەی ، ئەوەندەش بەسە . وازت لێ دێنم بۆ خۆتو ویژدانت . لەبیرت نەچمەوە» .

ویستی بڕوات بەلام لەبەر دەرگاکەدا ڕاوەستا ، سەیرێکی ئەو وێنەیەی کرد کە من پێکابووم ، ئینجا بێ ئەوەی نیشانەی لێبگرێ ، پەنجەی نا بە بەلەپیتکەداو لێ‌ی‌دا ڕۆیشت . ژنەکەم بوورایەوە . خزمەتکارەکانم نەیان وێرابوو ڕێ‌ی لێبگرن ، بە ترسو لەرزەوە سەیریان دەکرد . هەنگاوی نایە هەیوانەکەوە ، بانگی عەرەبانچی‌یەکەی کردو بێ ئەوەی من مەسەلەکە تێ بگەم ڕۆیشت .

کۆنت هەر ئەوەندەی وت . بەو جۆرە کۆتایی ئەو چیرۆکەم بۆ دەرکەوت کە سەرەتاکەی ڕۆژێ لەڕۆژان ئەوەندە کاری تێکردبووم . ئیتر هەرگیزاو هەرگیز پالەوانەکەیم نەدیەوە . دەلێن گوایە ئەم سیلڤیۆیە لەکاتی ڕاپەڕینی ئەلێکساندەر ئیپسیلانتی‌دا سەرکردەی هێزێك بووەو لە شەڕی سکولیانی‌دا کوژراوە .

**لەم کتێبەوە وەرگێڕراوە :**

Alexander Pushkin, Selected Works, Vol. 2PP.13—25 Progress Publishers, Moscow, 1974

# مێژووی لاستیك و پێکهاتنی کیمیایی

دوکتۆر : ذەنوون پیریادی
کۆلیجی زانست ـ بەشی کیمیا ـ زانکۆی بەغدا ..

**سەرەتا**

گومان لەوەدا نی‌یە کە لاستیك ماددەیەکی زۆر گرینگە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی لەم چەرخەماندا ، بۆ وێنە هەموو رۆژێك ملیۆنەها « تایەی » ئۆتومبێل‌و پایسکیل‌و فرۆکە لە جیهاندا بەکار دەهێنرێت‌و هەموویشی لە ماددەی لاستیك دروست دەکرێت ، گەلێ جار وە بە تایبەتی لە وولاتانی ئەوروپاو لە ئەمەریکادا لاستیکی رەق‌و ئەستوور لە جیاتی کاشی‌و مەرمەر بەکار دەهێنن بۆ فەرش‌کردنی نێو ماڵ‌و خانووەکانیان ، بەکارهێنانی لاستیکیش دوو خاسیەتی سەرەکی هەیە کە لەگەڵ خاسیەتی کاشی‌و مەرمەردا جیاوازە .. یەکەمیان : لاستیك لەبەر نەرمی‌یەکەی کە بە سەریا دەرۆی دەنگی پێڵاوەکەت گوێ لێ نابێت .

دووەمیان : لاستیك ماددەیەکی دابڕکەرە[1] ، واتە گەرمی‌و ساردی ژوورەکە دەپارێزێت .. جگە لەمانەی باسیشمان کرد لاستیك سوودی تری هەیەو لە پێکهێنانی زۆر ئامێرو کەرەستەی تردا بەکاردێ ، بۆ نموونە گەر سرنجی هەر ماشێنێك بدەیت ئەوە بە ئاشکرا دەبینی کە لاستیك بەشدارە لە پێك هاتنیا جا کەم یا زۆر ..

● **لاستیك لە مێژوودا : ـ**

ئادەمیزاد هەر لە زووەوە لاستیکی ناسیوەو بەکاری هێناوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی رۆژانەی خۆی ، جا با بزانین لاستیك لەچی پەیدا دەبێت‌و چۆنیش پوختە دەکرێت ؟ ..

وەکو ئاشکرایە لە وڵاتی بەرازیل‌و سیلان‌و ئەندەنووسیا جۆرە دارێك هەیە پێی دەڵێن « داری لاستیك » وەیا « داری هەیڤا » و بە ئینگلیزیش پێی دەگوترێ « Hevea brasiliensis » ئەم دارە کە گەورەبووو پێ گەیشت شلاویکی سپی لەناو قەدیا دروست دەبێت کە بە دیمەن لە شیر دەچێت .. جووتیارەکان لەو ناوچانەدا بە چەقۆ قەدی دارەکە زامدار دەکەن بۆ ئەوەی شلاوی لاستیکەکە بێتە دەرو ئینجا کۆی دەکەنەوەو پاش ماوەیەك شلاوەکە خەست دەبێت‌و توندو چڕ دەبێت وەکو لاستیکی لێ دێت ..

خەڵکی بەرازیل‌و مەلایوو سیلان (150) ساڵ لەمەوبەر فێری ئەوە بوون کە نەختێ ترشی بەسەر شلاوەکەدا بکەن بۆ ئەوەی لاستیکەکە بەهێزو پتەوتر بێت ، ئەم جۆرە لاستیکەش کە لە درەخت دروست دەکرێ پێی دەڵێن « لاستیکی سرووشتی[2] » .

لە ساڵی 1826 بۆ یەکەم جار مایکل فارادای لاستیکی سرووشتی شیکردەوە ل ئەزموونگەیەکدا[3] ، لە ئەنجامدا شێوە کیمیایی‌یەکەی « فورمیولای[4] » مولیوکیولەکانی[5] دۆزیەوە کە گوایە بریتی‌یە لە « $C_5H^8$ » وە لە ساڵی 1860 دا س . گریڤل ولیام توانی ماددەی ئایسۆپرین ئامادە بکات ئەویش لە ئەنجامی دلۆپاندنی[6] لاستیکی سرووشتی .. شێوەی ماددە دلۆپاوەکە هەمیشە « $C_5H_8$ » بوکە بریتی‌یە لە بەشەکانی ئایسۆپرین :

$$CH^2=c^1-cH-cH^2$$

« ئایسۆپرین » Isoprene

گریڤل ولیام بەردەوام لەبیری ئەوەدا بووکە ئەگەر گازی ئۆکسجین بەناو شلاوی ئایسۆپریندا رەت بکات بۆ ماوەیەك شلاوەکە خەست دەبێت‌و دەمەیەت‌و دەبێتە ماددەیەکی جیرکە زۆر لە لاستیکی سرووشتی دەکات ..

نە ساڵی 1879 دا گوستاف بوچاردات لە کارتێکردنی نێوان
ـیسوپرین و ترشی هـایدرۆکلۆریـکدا « Hcl » بۆ پێکهێنـانی
ـستیکی سرووشتی سەرکەوتێکی چاکی وەدەست هێنا ..

ئۆکسجین

←

ئیسوپرین = لاستیکی سروشتی

←

ترشی هایدرۆکلۆریک

ئەوەی شایانی باسە لە وولاتی ئەمەریکای ناوەراستدا
جـۆرە درەختێکیتر دەروێت ، وەك « پـەنەمـاو مەلایـۆ » کە
ئەویش هەر بە « درەختی لاستیك » ناسراوە چونکە وەکو داری
« هـەیڤا » شـلاوی سپی دروست دەکات بـە هۆی هـەواوە
ـدەمەیەت و دەبێتە لاستیك ، بەلام ئەم لاستیکە سرووشتی‌یە لە
رووی پێك هاتنی کیمیایی‌یەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ لاستیکی
ـ ری « هەیڤا » دا ..

● **بەهێزکردنی لاستیکی سرووشتی :**

شلاوی ئەو لاستیکەی کە لە داری هەیڤادا پەیدا دەبێت
ـوای خەست‌بوونەوەی لاستیکێکی زۆر بێ‌هێزو بی چیری لێ
پەیدا دەبێت ، هەربۆیەشە کە خەڵکی بەرازیل و مەلایۆ هەر لە
زووەوە هەوڵیان‌دا کە ماددەیەکی کیمیایی وا بدۆزنەوە کە کار
بکاتە سەر شلاوو ماددەکە بۆ بەهێزکردنی لاستیکـەکە .. لە
هەموو تاقیکردنەوەکانیش بـەسوودتـر ئەوەبـووە کە گـوگرد
گەرماتوو بە رێژەیەکی[7] کەم لەگەڵ شلاوی لاستیك‌دا گـەرم
بکرێت لە ئەنجامدا لاستیکێکی رەقو بەهێزی لێ پێك دێت ، ئەم
لاستیکەش پێی دەڵێن لاستیکی بەهێزکراو




لاستیکی سرووشتی « نەرم »

لاستیکی سرووووشتی بەهێزکراو « رەق »

● **لاستیکی دەستکرد** ● Industrial Rubber

هەتا ساڵی 1860 هیچ شتێك لەبارەی پێك‌هاتووی کیمیایی
لاستیك نەزانرابوو ، پاش ئەم سـاڵە هەروەکـو باسمـان کرد
لاستیکی سرووشتی شی کرایـەوەو دەرکەوت کـە لە ماددەی
ئایسوپرین پێك‌هاتووە ، بـەلام چۆن بـەشەکـانی رێکخراوەو
بەچی جۆری ئایسۆپـرین بەشـدار دەبێت لە دروست کردنی
بەشە گەورەکانی لاستیکدا ؛ ئەمەیان هێشتا هیچی لەبارەیەوە
نەزانرابوو ..

جا بۆ ئەوەی خوێندەواران بە شێوەیەکی کورت و هاسان
لە چـۆنیەت پێکهـاتنی لاستیکدا تێ بگـەیەنـین ، لە رێگـەی
کـارتێکـردنی کیمیـاییـەوە ئـەوە پیـویستمـان بـە هـۆی
روون‌کردنەوە هەیە بۆ ئەوەی ئەم کارە کیمیاییانـە بە چـاکی
نیشان بدەین و بـە ووردیش تێ‌ی بگەین ، وای دادەنێـین کە
مولیکیۆلی ئـایسۆپـرین قەوارەو شێـوەی خشتی هەیـەو دوو
ئەلقەی « چەنگاڵی » بچوکی لەم‌لاو لەولاوە پێوە چەسپ‌کراوە
وەکو ئەم وێنەیەی خوارەوە :



شێوەی مولیکیۆلی ئایسۆپرین .

ئەوە هەردوو مولیکیۆلی ئایسۆپرین کار لە یەکتری دەکەن
بە یارمەتی جۆرە ماددەیەکی کیمیایی وەکو ئۆکسجین یا ترشی
هـایدرۆکلۆریـك بـۆ پێـك هێنـانی مـولیکیـۆلێکی دوو خشتـە
« Dimer » . هەروەها دووبارە ئەم مـولیکیۆلە دوو خشتـەیە
لەگەڵ مولیکیۆلێکی تردا کار لەیەکتری دەکەن و یەکتری دەگرن
« بەند[8] دەبەستن » بۆ پێـك‌هێنانی مـولیکیۆلێکی سێ‌خشتـە
« Trimer » ـ بەم جۆرە مولیکیۆلی سێ خشتە زیاد دەکات و دەبێتە
مولیکیۆلێکی چوار خشتە .. پێنج خشتە ... هتد ..

هاوکێشە کیمیایی‌یەکـانی خوارەوەش بـە شێوەیـەکی
هاسان ئەم چەشنە کارە کیمیایی‌یەمان بۆ روون دەکاتەوە ..




مولیکیۆلی ئایسۆپرینی
دوو خشتە



مولیکیوڵی ئایسوپرینی
سێ خشتە



مولیکیوڵی ئایسوپرینی
چوار خشتە

بەم جۆرە صەدەها مولیکیوڵی ئایسوپرین بەند دروست دەکەن بەیەکەوەو مولیکیوڵی هەرە گەورە دروست دەکەن :



ئەوەی شایانی باسە مولیکیوڵی گەورەی پێکهاتوو بەم جۆرە لە زانستی کیمیادا پێی دەڵێن « پولیمەر[9] ـ Polymer » ـ وە بۆ زیاتر روونکردنەوەیش وا کێشەی کیمیایی پولیمەربونی[10] ئایسوپرین بە شێوەیەکی زانیارانە دەنووسینەوە :

$$M\,CH_2 = \overset{CH_3}{\overset{|}{C}} - CH = CH_2 \rightarrow \left(CH_2 - \overset{CH_3}{\overset{|}{C}} = CH - CH_2\right)_M$$

فورمیولای لاستیك    $M > 100$ ئایسوپرین

لە راستیدا لە سەرەتای صەدەی بیستەمدا لاستیك ئەو گرنگیەی ئیستای نەبووو بە نرخێکی هەرزان دەکراو دەفرۆشراو هەر تەنها بۆ دابرکردنی تەلی کارەباو تەلەفۆن بەکار دەهێنرا ، چونکە ئۆتومبیل هێشتا بەو شێوە فرەوانە دروست نەکرابوو ، ئیتر هەرکە پیشەسازی ئۆتومبیل پەرەی سەندو فرەوانبوو پێویستی لاستیك زۆربووو نرخیشی لە بازاری پیشە سازیدا بەرز بووەوە .. لە ساڵی 1950 دا کارگەکانی لاستیك « 2 » ملیۆن تەن لاستیکیان دروست کرد ، زوربەی بۆ « تایەی » ئۆتۆمبێل بەکار هێنرا .. وە لە ساڵی « 1950 » ش بەملاوە تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە لە ئەزموونگەکاندا پەرەی سەندو گرینگی پێدرا بۆ ئەوەی لاستیکی چاك و بەهێز دروست بکەن . وە لە نێوان ساڵەکانی 1960 — 1980 زۆر چەشنە لاستیکی تازە دروستکراو تا دەهات چاکترو بەهێزتریش دەبوو ئیمرۆکەیش زانیاری پۆلیمەر زۆر فرەوانو قوڵە دەربارەی کیمیای لاستیك ، ئەمەی کە بۆم روونکردنەوە تەنها کورتە باسێکە دەربارەی لاستیك ، جا گەر یەکێ بیەوێ چاکتر لەم پیشەسازییە بگات و باشتر لەگەڵیا ئاشنابێت بۆیان هەیە سەرچاوەکانی ژمارە (6,4) ی ئەم باسەمان بە وەردی دەوربکەنەوە بۆ ئەوەی سوودی چاکتر وەدەست بهێنن ..

پەراوێزەکان :

1 — دابڕکەر = Isolater = عازل
2 — لاستیکی سروشتی = Natural Rubber = المطاط الطبیعي .
3 — ئەزموونگە = لابور = مختبر = Laboratory
4 — فورمیولا = الصیغة الکیمیائیة = Chemical Formula
5 — مولیوکیول = جزیئە = Molecule
6 — دڵۆپاندن = تقطیر = Distillation
7 — رێژە = نسبة = rate
8 — بەند = آصرة کیمیائیة = Bond
9 — پولیمەر = بریتیە لە دوو ووشە : ووشەی « poly » بە مانای « زۆر » و ووشەی « mer » بە مانای « یەکە » « = » « unit » = وحدة . واتە ووشەی پولیمەر = « زۆرەیەکە » وەیا « فرمیەکە » ..
10 — پولیمەربوون = بلمرە = Polymerization


سەرچاوەکان :

— H.F Mark — Polymer Chemistry — The Past 100 Years Chemical and Engineering News April 6 (1976) Page 176 .
— G . Odian (Principles of Polymerization) J . Wiley Interasceince , 1981 , Page 581 .
— A . Sehmidt and C . A . Marlies , (PrinciplesoF High Polymer Theory and Practice , ) Mc Grow Hill Camp New yourk , 1948 , Page 510 .
— C . E . Davis , and J . T . Blake , (Chemistry and Technology of Rubber , ) Reinhold Publishing Corporation .
5 — کیمیاء الجزیئات الکبیرة ـ تالیف الدکتور ذنون محمد بیریادی والدکتور کورکیس عبدآل آدم مطبعة الکویت / 1983 ..

**بەبۆنەی دەرچوونی کتێبی**
**ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە»وە:**

# مەسەلەیەکی مەزنەو هەوڵێکی کەم

**رشيد محمد علي**

لە زۆر دەمێك لەمەپێشەوە بەهۆی نیشتەجێ‌بیمەوە لەو ناوچانەدا کە سۆفی‌و مریدەکانی «بزووتنەوەی هەقە» یان تیادا بلاوبوونەتەوە، هەندێکم لێ ناسیون‌و، بەهۆی پاکی‌و چاکـەو خـۆشەویستیشیـانەوە بـۆ خەڵکی تێکـەلاویم لەگەڵ پـەیـدا کردوون. هەر لەو سەردەمەوە بیرێکی سەرەتایی لەبارەیانەوە لە مێشکمدا پەیدا بوو، بەلام ئەم بیرە لە جێگای خۆیدا وەستاو نەش‌ونومای نەکرد، تا وا ڕێکەوت لەگەڵ هەندێکیش لە برایانی شێخانی ڕێبازی «هەقە» ناسیاویم پەیدا کردو ئەوە بووە هۆی جووڵاندنەوەی بیرە سەرەتایی‌یەکەم‌و لەوە گـەیشتم کە ئـەو پـاکی‌و چاکـەو خـۆشـەویستی‌یـەی مـریـدو سـۆفی‌یـەکـان ڕەنگدانەوەی ئەو سیفەتانەیە کە لە شێخەکانیاندا هەن. ئەمە زیاتر هـانی‌دام لە مەسـەلەکە نـزیکتر ببمـەوەو بەدوای زۆر شتی‌تردا بگەڕێم کە تا ئەوکاتـە لە گۆشـەی نیگای منـەوە لە تاریکیدا مابوونەوە. زیاتـریش ئەو درۆو بـوختانـەی لەلایەن کەسانی دوور لە بزووتنەکەوە ئەکران، بەتـایبەتی‌یش دوای ئەوەی کاك «حەمەسووری کلاوقوت»م ناسی‌و ماوەیەکی باشم بوو بۆ دووان‌و گفتوگۆ لەگەڵ کردنی‌و، بۆم ڕوونبووەوە کەوا «حەمەسوور» یەکێکە لەوانەی لە «بزووتنەوەی هەقە»دا قاڵ بوون، تا بووە بە یەکێك لەوانەی ڕابەرایەتیی بەشێك لە سۆفی‌و مریدەکانی بزووتنەوەکە ئەکەن «هەرچەندە بە ژمـارەش کەم بن»و، گەلیك شتی تازەی داهێناوە کە لە هەمـوویان گـرنگتر مەسەلەی منال نەبوونە.. بەمجۆرە تا ئەهات زانیاریم لەبارەی ئەم مەسەلە مەزنەوە زیادی ئەکرد، بەلام لەبەر کەمدەرفەتی‌و بۆنەگونجان، نەمتوانی ئەو زانیاری‌یانەم تۆمار بکەم.

دوای ئەوەی «ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە»ی کـاك مستەفـا عـەسکـەری دەرچـوو و کـەوتـە بـەردەستی خوێندەواران، منیش وەکو خوێندەوارێك‌و ئـارەزوومەنـدێکی زانینی پتر لەم مەسەلەیە، خوێندمـەوەو، ئەنجـام ئەوە بـوو لەئاستی هەندێ کە لەبەری پڕنەکراوەدا وەستام‌و نەمتـوانی بەپێی ئەوزانیاری‌یانەی لەمبارەیەوە هەمە بێ‌دەنگ بم، چونکە بەلای منەوە وایە ئەم بابەتە بابەتێکی خەست‌و لق‌و پۆپ‌دارەو گرنگی‌یەکی مێژوویی هەیە، لەبەرئەوە بە یەك دو چپە کۆتایی پێ نایەت، چونکە بەشێکی زۆری لە بیرو هۆشی کەسانی سەر بەم مەسەلەیەو ئاگادارانی مەسەلەکە داگیر کردووە. جا لەبەر تیشکی ڕووناکیی ئەو زانیاری‌یانەو لەسەر داوای کاك مستەفا عەسکەری خۆیشی، وا ئەو شتانەی بـە کەلین‌و کـەلەبەریـان ئەزانم ڕوونیان ئەکەمەوەو، چیی‌تری زیـاتریش بـە پێویست

بزانم ئەیخەمە پێش چاو.

× × ×

کاک مستەفا عەسکەری لە پەراوێزی (6)ی لاپەرە (10)دا ئەڵێ: «حاجی شێخ مستەفا... لە جەنگی یەکەمی جیهاندا، بۆ بەربەرەکانێی ئینگلیز چووە بۆ باشووری عێراق...». ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کەوا کورد، لەملایەنەشەوە بەشداریی لە بەربەرەکانێ کردنی ئینگلیزەکانا کردووە بۆئەوەی خاکی عێراق داگیر نەکەن «کە بەشێکە لە خاکی ئیسلام». ئەمەش ئەبێ بە نیشانەیەکی گرنگ بۆ بەشداری کردنی کورد لە بەربەرەکانێی ئیمپریالیزمدا. بەڵام نووسەری بەرێز بۆی ئاشکرا نەکردووین ئاخۆ حاجی شێخ مستەفا تێکەڵاوی چ دەستەیەك بووە، دەستەی نیشتمانپەروەران بۆ نەهێشتنی داگیرکردنی نیشتمان، یان وەکو موسوڵمانانی تر بۆ غەزا چووە؟

ئەوەی گومانی تێدا نی یە ئەوەیە کە حاجی شێخ مستەفا چووە بۆ بەغداو وەك ئایینپەروەرێك تێکەڵاوی تاقمی ئایینپەروەران بووە. خۆشی چەکدار نەبوە، بەڵام خزمانی ـ واتە سەیید ئەحمەدی خانەقاو ئەوانی تر ـ چەکدار بوون.

هەروەها نووسەری بەرێز بۆی روون نەکردووینەتەوە کە بۆچی تەرمی حاجی شێخ مستەفا لە گۆڕستانی شێخ مەعرووفی کەرخی یەوە گوێزراوەتەوە بۆ گۆڕستانی شێخ جونەیدی بەغدایی؟ ئەمە لەڕاستیدا لەبەرئەوە بووە بەشێك لە گۆڕستانی شێخ مەعرووف تێکدراوەو کراوە بە شەقام، گۆڕەکەی شێخیش بەر ئەو بەشە کەوتووە، جا بۆئەوەی گۆڕەکەی ون نەبێ، گوێزراوەتەوە، هیچ هۆیەکی تر لەئارادا نەبوە.

هەروەها کاک مستەفا لە پەراوێزی (17)ی لاپەرە (16)دا لە باسی کۆچکردنی شێخ عەبدولکەریمدا ئەڵێت بەوە بووە کە «شەوێکیان پاش نوێژی خەوتنان لە مزگەوتەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، لە دالانی دەرگای حەوشی ماڵدا بەردێکی تێ ئەگرن ئەدا لە قاچی، ئێسکی ئەشکێنێ و، هەر بەوە پاش چل شەو کۆچی دوایی ئەکا».

ڕاستە، شێخ عەبدولکەریم بەهۆی برینەکەی قاچیەوە کۆچی دوایی کردووە، بەڵام لەناو سۆفی و مریدەکانا، باسی تەندروستیی شێخ هەر بە نەخۆشی کراوەو، کەم وابووە بڵێن بەهۆی برینی قاچیەوە مردووە. ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ مەلا سەلامی تریخۆر لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، هەر باسی نەخۆشیی شێخی کردووە. نووسەری بەڕێزیش هیچ شتێکی لەبارەی ئەوەوە بۆ ڕوون نەکردووینەتەوە کە ئەبێ کێ بێ بەدزی‌یەوە لە دالانی دەرگای حەوشی ماڵدا، بەردێکی و کوشندە بە شێخدا بکێشێت؟ ئەبێ کێ ئەوەندە زیانی لە بزووتنەوەکە پێ گەیشتبێت، یان شێخ خۆی ئەوەندە زیانی پێ گەیاندبێ تا بگاتە تینی و بی‌یەوێ شێخ لەناوبەرێ، تە بزووتنەوەکەش لەناوبچێ؟ تۆ بڵێی فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمە نەیانتوانیبێ شێخ بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، بۆئەوەی بزووتنەوەکەی بۆ سوودی خۆیان بەکاربهێنن، ویستبێتیان تۆڵەی لێ بکەنەوە؟ چونکە بە تەگەرەی سەر ڕێگای بەجێ‌هێنانی مەرامەکانی خۆیانیان زانیوە؟ یان دەسەڵاتدارانی‌تری ناوچەکە بە مایەی مەترسی‌یان داناوە بۆ دەسەڵاتی خۆیان؟ نووسەری بەڕێز ئەیتوانی، ئەگەر شتێکی ڕوون و ئاشکرای لابووبێ، نەهێڵێ ئەم بۆچوون و پرسیارانە لەبارەی کۆچی دوایی شێخەوە بێنە کایەوە. هەرچۆن بێ، لەبارەی ئەوکەسەوە بەردەکەی بە شێخدا داوە، ڕوون نەبوەتەوە ئاخۆ ئەو بەردە بە دەستی ناحەز خۆی، یان زەلامێکی ڕاسپێرراو وەشێنراوە، یان کەسێك بەردەکەی بۆ شتێك یان کەسێکی‌تر هاویشتووەو، بەڕێکەوت لە قاچی شێخی داوە؟ هەرچەندە زۆربەی کۆمەڵەی «هەقە» وای بۆ ئەچن ئەوکەسە ڕاسپێرراو بووە، بەڵام لەلایەن کێوە؟ فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمە، دەسەڵاتدارانی‌تری ناوچەکە، ناحەزانی موتەعەصیب؟ ئەوە هیچی دیار نی‌یە.

کاک مستەفا، لە لاپەرە 30ی کتێبەکەیا، مریدەکان پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم ئەکا بە سێ بەشەوە:

1 ـ ئەو بەشەی بوون بە کۆمەڵە سۆفی‌یەکی بەدیمەن ئایینی وەکو هەموو سۆفی و دەروێشەکانی‌تر لە کوردستانا.

2 ـ ئەو ژمارەیە کە دوای (حەمەسوور) کەوتن و لە (کلاوقوت) نیشتەجێ بوون.

3 ـ بەشی زۆریان کە دوای (مامەڕەزا)ی برای شێخ عەبدولکەریم کەوتن و بە سەرۆکی خۆیانیان دانا.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر لەبارەی ئەم سێ بەشەوە ئەڵێم:

بەشی یەکەمیان کە لە هاوبەشی‌کردنی کۆمەڵە کە یان دوورکەوتوونەتەوە، بەئاشکرا بە دڵسۆزی بۆ ڕێبازەکەو پێشڕەوەکانی ماونەتەوەو هەمووکات هەر ڕوویان لەوان بووەو،

ـە خاوەن مافێکی تایبەتی یان ئەزانن بەسەر خۆیانەوەو ەمیشە خۆیان بەو شێخانەوە بەستووەتەوە، هەموو سامان و - ـ بیی خۆیان بە هیی ئەوان ئەزانن. بەدرێژاییی ماوەی ـێکە لاوی یەکی زۆرما، نەمدیوەو نەمبیستووە پێوەیستی یەکی ـەو شێخانە لای یەکێك لەو مریدانە دەست کەوتبێت و مریدەکە تو ـای بەسەر ئەو شتەدا بووبێت، دەستی هێنابێتە ڕێی ـێخەکەو بێگوێیی کردبێ. هەر کێشەو ناخۆشی یەکیش ـەنێوان ئەو مریدانەو هەر کەس و تایەفەیەکی تردا، ـووی دابێ، چاویان هەر لەو ڕێکاو شوێن و چارەکردنە بووە کە ـێخەکان بۆیان داناون و ئەوەیان جێبەجێ کردووەو لە قسەیان دەرنەچوون و، بەهۆی پیاوچاکیی ئەو شێخانەو ـیزیانەوە لای هەموو دانیشتووان، کێشەکە چارەسەر کراوەو ـەمە زۆر جار ڕووی داوە. ئەمە هەموی ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو مریدانە تائێستاش دەستیان لە ڕێبازەکە بەرنەداوەو هەر پێوەی ـەندن.

بەشی دووەمیان کە دوای حەمەسوور کەوتوون، ئەمانە هەرچەند بە ژمارە کەمن، گەلێ پێویستیان بە لەسەر نووسینی زیاتر هەبوو لەلایەن نووسەری بەڕێزەوە، نەك بەو شێوە کورتەی کە کردوویەتی کۆتایی بە باسیان بێنێ. خۆ ئەگەر کاك مستەفا عەسکەری بلێ من باسی مەسەلەی «هەقە» ئەکەم و ئەوان لە مەسەلەکە لایان داوە، ئەڵێم ئەمانیش لە سەرەتاوە «هەقە» بوون و حەمەسوور خۆی لەدوای شێخ عەبدولکەریم بە خاوەن هەق ئەزانێ لە ڕابەرایەتیی بزووتنەوەکەداو، خۆی زۆر جار وتوویە: «کەس وکاری شێخ غەدریان لێ کردم، چونکە من بێکەس بووم، ئەوان داگیریان کرد بۆ خۆیان، ئەگینا دوای شێخ بۆ من دانرابوو».

حەمەسووری یەکان گەلێ بابەتی تازەیان هێناوەتە ئاراوە، لەبەئەوە حەزئەکەم هەندێك لەبارەیانەوە بدوێم:

ئەم ژمارە کەمەی دوای حەمەسوور کەوتن، بە شێوەیەکی توند، پابەندی حەمەسوور بوون و خۆیان و ژیانیان بەوەوە بەستەوە. بەلێ ئەمانە خوویان دایە بەهێزکردنی دارایی یان و وازیان لەو شتانە هێنا کە بە مەسرەفی زیادیان ئەزانی چ لە خواردن و چ لە جل و بەرگدا. لەبارەی واز هێنانیانەوە لە چاخواردنەوە، کاك مستەفا لە لاپەڕە (30)دا ئەلێ وازیان لێ هێناوە. مەبەستی ئەوەیە دوای ئەوەی کە بوون بە حەمەسووری وازیان لە چاخواردنەوە هێناوە. بە بۆچوونی کاك مستەفا زیاتر بۆئەوەی ئەم مەسرەفەشیان لەکۆڵ بکەوێت و دارایی یان بەوە بەهێزتر ببێت. بەلام حەمەسوور خۆی لە باسی چانەخواردنەوەکەیاندا ئەلێ: «ڕۆژێکیان کۆمەڵێکی زۆری سۆفی و شێخان لە تەکیە کۆبووبوونەوە، منیش چوومە ژوورەوە، گوێم لێبوو شێخ ئەیفەرموو: مریدی من نابێ چا بخواتەوە». منیش ـ واتە حەمەسوور ـ بە دەنگێکی بەرز قیژاندم و وتم: «من دەیخۆمەوە». شێخیش فەرمووی: «شێتە! لەگەڵ تۆم نی یە». کەواتە بەپێیی ئەم قسەیەی حەمەسوور، چاخواردنەوە هەر لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریم خۆیدا قەدەغە کراوە. بە ڕای حەمەسوور ئەوانەی چا دەخۆنەوە، لە پەیرەوی کەرانی ڕێبازی هەقە، سەرپێچی لە فەرمانەکەی شێخ دەکەن. حەمەسووری یەکان ئێستاش هیچ کامیان چا ناخۆنەوە، هەرچەندە هەمووکات چا لە مالیاندا بۆ میوان ئامادەیە. تەنیا حەمەسوور خۆی لەگەڵ میوانەکانیا چا ئەخواتەوە. ئەویش لە چاکەی بەردەمی لە نیوەی زیاتر ناخواتەوە، نیوەکەی تری ئەدا بە یەکێك لە میوانەکان بە ئارەزووی خۆی. ئەم مەسەلەی چانەخواردنەوەیە کە لای حەمەسووری یەکان هەیە، لای هیچ کەسی تر لە شێخان و سۆفی و مریدەکانی بزووتنەوەی هەقە نەمدیوەو نەمزانیوە کەسیان هەبێ چا نەخواتەوە. کەواتە بۆ ئەبێ بە تاقی تەنیا حەمەسوور لە هەموو ئەوانی تر دلسۆزتر بێت بۆ شێخ، ئەگەر مەسەلە مەسەلەی ئەو فەرمانە بێت؟ چونکە ڕەنگە زۆری تری وەکوو حەمەسوور، دلسۆز بۆ شێخ و ملکەچ بۆ فەرمانەکانی، بووبن ئامادە بووبن ئەو شتەی بەقسە بکەن و ئەبوو جگە لە حەمەسوورو حەمەسووری یەکان، کەسێکی تریش ببوایە چا نەخواتەوە، چونکە حەمەسوور ئەلێ کۆمەڵێکی زۆر لە سۆفی یەکان و لە شێخان ئاگایان لەو قسەیەی شێخ بوو. لەوانەیە حەمەسوور بۆیە ئەو فەرمانە بە ناوی شێخەوە بگەیەنێ تا لای تاقمەکەی چاکتر جێبەجێ بکرێ. ئەمەش بەلای منەوە ڕاکەی، کاك مستەفا عەسکەری ئەچەسپێنێ کە ئەلێ: حەمەسووری یەکان بۆ پتەوکردنی ڕادەی دارایی یان وازیان لە چاخواردنەوە هێنا، بەتایبەتی کە لەو سەردەمەدا چاخواردنەوە مەسرەفێکی قورس بووەو شەکرو چا بە گران دەستکەوتووەو ئێستاش بووە بە شتێکی ئاسایی لایان و بە نەخواردنەوەی ڕاهاتوون.

حەمەسووری‌یەکانی کلاوقوت، بە ژن و پیاوەوە، هەموو لە یەك ماڵا ئەژین و بەیەکەوە کارو کاسبی ئەکەن. هەرچی شتێکیان هەیە، لە ئامێری کشت‌وکاڵ و ئۆتۆمۆبیل و زەوی و مەڕو ماڵات، هەمووی وەك هیی هەموویان وایە. دەرامەتێکی باشیان هەیەو بەیەکەوە پەیدای ئەکەن و بەیەکەوە ئەیخۆن. مەسرەفی تەکیەش لە دەستکەوتی گشتی دەرئەچێت و، حەمەسووریش لەبارەی جل و بەرگ و خواردن و ئیش‌کردنەوە هیچی لەوانی‌تر جیا نی‌یەو، ژیانێکی یەکسانی ئەژین.

بۆ مەسەلەی نوێژ کردن و نەکردنیش، ئەوەندەی من لەوێ ئاگام لێ بوو نوێژیان نەئەکرد. خەڵکی دێی کلاوقوت ئەیانوت تا ماوەیەکی زۆر نوێژیان ئەکردو ڕۆژوویشیان ئەگرت و هەموو ڕۆژانێکی هەینێ بەشداریی نوێژی هەینی‌یان ئەکرد. زۆر جار لە بەری باخەکانی خۆیان میوەیان ئەهێنا بۆئەوەی خەڵکەکە دوای نوێژ بیخۆن. بەلام ئێستا حەمەسوور نوێژ ناکات. لێم‌پرسی: بۆ نوێژ ناکەیت؟ لە وەلامدا وتی: «من ئەزانم بۆ نوێژ ناکەم، بەلام ئەوانەی نوێژ ئەکەن، ئەزانن بۆچی ئەیکەن؟».

مەسەلەیەکی‌تری گرنگ ماوە کە لای حەمەسووری‌یەکان هەیەو کاك مستەفا عەسکەری نەك هەر بەکورتی و تەنها جارێکیش باسی نەکردووە، بەڵکو هەر بەلایشیدا گوزەری نەکردووە. ئەویش مەسەلەی (منال نەبوون)ە. ئەم مەسەلەیە کە لای ئەمان هەیە، لای هیچ‌کام لە بەشەکانی‌تری هەقەو هیچ تاقم و کۆمەڵ و تایەفەیەك لە وڵاتی خۆمان نەم‌بیستووە هەبێت. ئەو کۆمەڵەی بەیەکەوە ئەژین، کە بریتین لە پیاو و ژن، منداڵیان نابێت. لە حەمەسوورم پرسی کە هۆی چی‌یە منالیان نابێت؟ وتی: ئێمە خۆمان ناهێڵین منالمان ببێت، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت: «واعلموا إنما اموالكم وأولادكم فتنة 28/8». هەر لەبەر ئەمەشە لە خزمەت‌کردنی خەڵقیدا دەست بە ماڵەوە ناگرن. بە ماڵی خۆیان خزمەتی هەر کەسێك ئەکەن کە ڕوویان تێ‌بکات.

بە ڕای من ئەم مەسەلەی منال‌نەبوونە داهێنانی حەمەسوور خۆیەتی، چونکە ئەگەر شێخ عەبدولکەریم هیچ پێوەندی‌یەکی بەم‌کارەوە هەبوایە، حەمەسوور ئەیوت و ئاشکرای ئەکرد. حەمەسووری‌یەکان، هەروەك خۆیان منالیان نابێ، حەزیش ناکەن منالی کەسی‌تریان لە ماڵ لێ نزیك ببێتەوەو لەگەڵیان بژی، گوایە چونکە ژن عاتیفی‌یەو لەوانەیە ئەگەر منالی خەڵکی دی خۆیشی حەز لە منال بکات.

لە مەیدانی ناسینی باشتری حەمەسووری‌یەکانا ئەبێ ئەوەشمان لەیادنەچێ کە حەمەسووری‌یەکان هیچ باوەڕیان بەشەڕو بە بەکارهێنانی هێز نی‌یە لە چارکردنی هیچ گیروگرفتێکدا. تا ئەوەندەی من ئاگام لێ بێ هیچ جۆرە چەکێك لە مالیانا نەبوو.

کاك مستەفا عەسکەری‌بە هیچ جۆرێ باسی ئەوەشی بۆ نەکردووین حەمەسوور لەکوێوە هاتووەو خەڵکی کوێ‌یە، کە ئەبوو زیاتر گرنگی بە پیاوێکی‌وا بدا کە توانیویەتی ئاوا جێگای خۆی لەناو بزووتنەوەی هەقەدا بکاتەوەو، لە ژیانی شێخ عەبدولکەریم خۆیدا لەسەر هەندێ بۆچوون و بیرکردنەوە بەربەرەکانێی کردووەو گوێڕایەڵی نەبوەو، لەدواییشدا توانیویە هەندێ لە مریدو سۆفی‌یەکانی ڕێبازەکە بۆ خۆی ڕابکێشێ و ببێتە پێشەوایان و، وەکوو لایەك لە بزووتنەوەکەدا دەربکەوێ و بە شێوەیەك قەناعەت بە کۆمەڵەکەی خۆی بکات کە واز لە هەندێ شتی باوی ناو کۆمەڵ بهێنن وەك چا خواردنەوەو جگەرە کێشان و، لەمانەش گرنگتر توانیویە قەناعەت بە ژن و پیاوی کۆمەڵەکەی بکا کە منالیان نەبێ.

بەڵێ، ئەبوو کاك مستەفا گرنگی‌یەکی زیاتر بەم مەسەلەیە بداو ڕێی ئەوە نەدا کەس بڵێ چونکە حەمەسوور لە بنەماڵەی شێخەکان نی‌یە، بۆیە مستەفا عەسکەری خۆی پێوە ماندوو نەکردووە، چونکە وەك من کاك مستەفا بناسم لەم‌جۆرە جیاوازی‌کردنەوە دوورە.

حەمەسوور خۆی ئەڵێ خەڵکی دەوروپشتی ماوەتم. چەند لە (کلاوقوت) پرسیم نەیانتوانی بڵێن وایە یا وا نی‌یە، ئەوەندە نەبێ ئەیانوت یەك دوو جار پیاوێك هاتووە بۆلای بە میوانی، ئەیوت: ئامۆزای حەمەسوورم و خەڵکی ناوچەی ماوەتم.

شتێکی‌تر ماوە لەبارەی ئەو دوورەپەرێزی‌یەوە کە کاك محمدی مەلا کریم لە پەراوێزی (34)ی لاپەرە (32)دا باسی ئەکاو ئەڵێ: «لام دوور نی‌یە ئەم دوورەپەرێزی‌یەی تاقمەکەی حەمەسوور لەوەوە هاتبێ کە حەمەسوور خۆی، وەك گوتمان، ڕەشە مسکێن بووەو، تێکەلاوی کردنیش چوونە ناو کاروباری

نەرێو، ئەوەش ئەبێ پشت بە زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیی پتەو ـەستێ.. تاد». بە ڕای من ئەم دوورەپەرێزییەی حەمەسووری‌یەکان، یان دوور وەستانی خەڵك لەوان، بۆ ئەو چەند شتە نامۆو ناتەبیعی‌یانە ئەگەڕێتەوە کە ئەوان ڕەچاویان ئەکەن‌و لەپێش هەموویانەوە منداڵ نەبوونەکەیە کە لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا شتێکی ئاسایی نی‌یە، یان بەشێوەیەکی‌تر ـو مەسەلەکە بچین ئەگەر بڵێین مامەڕەزای برای شێخ عەبدولکەریم نەهاتایەو سەرپەرشتیی بزووتنەوەکەی ـەکردایەو بە هەنگاوانی ڕێك‌وپێك مەسەلەکەی بەرەوپێش ـەبردایەو، ڕێگا بۆ حەمەسوور چۆڵ بوایەو خۆی بەتەنیا ببوایە ـە تاکە سواری مەیدانی مەسەلەکە، ئایا مریدو سۆفی‌یەکان هەروا بەئاسانی وازیان لە مەسەلەکە ئەهێناو لەدەوری حەمەسوور کۆئەبوونەوەو لێی دوورەپەرێز ئەوەستان چونکە (ڕەشە مسکێنە)، یان بەپێچەوانەوە ئەبوو و لە حەمەسوور کۆئەبوونەوەو وازیان لە مەسەلەکە نەئەهێنا؟ ڕەنگە کاك محمد زۆر شارەزای ئەو پێوەندە ڕۆحی‌یەی ناو سۆفی‌و مریدە (ڕەشە مسکێنە)کانی ناو ڕێبازەکە نەبێ کە چۆن بەشێوەیەکی ئەڵقاوئەڵق هەموویان خۆیان بە یەکترەوە بەستووەتەوە، چونکە لە مەسەلەکەیاندا گەورەو بچووکی‌و ئاغایەتی‌و مەلازادەیی‌و شێخزادەیی‌و بەگزادەیی‌و هیچ جۆرە زادەیی‌یەکی‌تر نی‌یە. کێ زیاتر خزمەتی مەسەلەکە بکا، ئەوە زیاتر لەپێشەوەیە با ڕەشە مسکین زادەش بێ. ئەو ڕێزو ئیحتیرامەی هەقەکان بەرامبەر شێخەکانی خۆیان هەیانە، ڕێزو ئیحتیرامی جیاوازیی چینایەتی‌و کۆمەلایەتی نی‌یە، بەڵکو ڕێزو ئیحتیرامی خزمەتکردنی ڕێبازەکەیە. لەوانەیە کاك محمد لەگەڵ ئەو سۆفی‌و مریدانە نەژیابێ، ئەگینا ئەیزانی لەناو سۆفی‌و مریدو شێخەکانی هەموو ئەوانەدا کە سەر بە بزووتنەوەی هەقەن، مەسەلەی جیاوازیی چینایەتی لەبەینا نی‌یە. هەموویان، بە شێخەکانیشەوە، خۆیان لە ڕیزی چینی هەقەدا ئەبینن. با کاك محمد ئەوەش بزانێ ئەگەر بێتو یەکێك لە بنەماڵەی شێخان خۆی بە شتێکی جیاو بەرزتر لە کۆمەڵەی هەقەکان تەماشا بکا، لای ئەوان وەکو (هەقە) قوبووڵ نی‌یەو بە لە ڕێباز دەرچووی ئەزانن‌و هیچ حیسابێکی هەقەیەتیی بۆ ناکەن، بەڵام وەکو خزم‌و هاوڕێ‌و دۆست‌و برادەر، ئەوە شتێکی‌ترە.

بەشی سێیەمیان بەشی هەرە زۆریانە کە مامەڕەزای برای شێخ عەبدولکەریمیان کردووە بە ڕابەرو سەرۆکی خۆیان.

بەڕاستی مامەڕەزا، وەك نووسەری بەڕێز بۆی چووە، پیاوێ بوو توانی مەسەلەکە بە بارێکی ڕێك‌و پێکدا بەرێ‌و ڕێبازێکی ڕوون‌و ئاشکرای بۆ دابنێ‌و زوربەی هەرە زۆری هەقەکان لە خۆی کۆبکاتەوە. ئەو بەرنامەیەی مامەڕەزا بۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵەکەی دانا، هەموو بەندو خاڵەکانی بەتەواوی‌و لە هەموو ڕوویەکەوە لەلایەن هەموو مریدو سۆفی‌و کەسانی‌تری سەر بە هەقەوە جێ‌بەجێ ئەکران، جا ئەوکەسانە لە زوربەی جووتیاران بووبن یان لە ئاغاو دەسەلاتدارو مەلاو حاجی‌و... بە بێ‌جیاوازی لەئاستی چینایەتیدا، لە ڕیزی مەسەلەکەدا وەکو یەك کاریان کردووە. بەلام کاك مستەفا عەسکەری لەکاتی ناوهێنانی ئەو ئاغاو دەسەلاتدارانەدا کە هاتبوونە ڕیزی هەقەوە، پیاوێکی بەڕێزی وەك (کوێخا سمایلی مەلاسەفی)ی لەیادکردووە کە یەکێکە لە سەرەکەکانی تایەفەی کوێخای عەشیرەتی (شیلانە)و، بەڕاستی بە هەموو دڵ‌و دەروونێکیەوە بووبوو بە هەقەو وازی لە هەموو بیرکردنەوەیەکی (عەشایەری)ی خۆی هێنابوو. ئەم شەخسە شوێنی دانیشتنی خۆی بەجێ‌هێشت‌و چوو لە دێیەکی هەقەکاندا کە دێی (مەلاسەفی)یە، وەك هەموو هەقەکانی‌تر، دانیشت. سەرەڕای ئەو هەموو سەرزەنشت‌و گاڵتەیەی پیاوانی دەسەلاتداری عەشیرەتەکەی بەرانبەری ئەیانکرد، هەموو پێوەندی‌یەکی خۆی بە مەسەلەی هەقەوە بەستەوە کە باوەڕی پێی کردبوو. بەڕای من ئەو جمم‌وجووڵە بەهێزەی کەوتە ناو بزووتنەوەی هەقەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ کارامەیی‌و لێهاتوویی مامەڕەزا خۆی‌و خۆ جیانەکردنەوەی لە مریدەکانی بە هیچ جۆرە جیاوازی‌یەکی چینایەتی‌و کۆمەلایەتی، هەروا بۆ ئەو ڕەفتارە چاکەی کە ئێستاش لە نەوەکانی مامەڕەزادا بەئاشکراو ڕوون دیارە، کە خۆیان لە مریدو سۆفی‌یەکان جیاناکەوەو هەرچی سامان‌و دارایی خۆیان هەیە بە هی هەموو هەقەکانی ئەزانن‌و دائەنێن. هیچ جۆرە تەماعێکیان لە سامان‌و دارایی ئەوانی‌تردا نی‌یە. تا ئەوەندەی من شارەزاییم لەم شێخانە هەبێت هیچ جۆرە خەیانەتێکیان لێ نەکردوون، بەڵکو ئەمە نەك هەر بەرامبەر مریدو سۆفی‌یەکانی خۆیان، لە تێکەلاویی کۆمەلایەتیدا لەگەڵ خەڵکی‌تریش کە سەر بە کۆمەڵەکەیان نین، هەر وان. تائێستا نەبیستراوە بنەماڵەی مامەڕەزا بە دەست یا

بە زمان زیانیان بە یەکێك گەیاندبێ‌و، هەرکەسێکیش چووبێتە ژێر سێبەری ماڵی ئەوان تا دواپلەی ڕێزلێگرتن ڕێزی ئەو چوونە ژێر سێبەرەیان گرتوە. هەروەها ئەوانیش چووبنە ژێر سێبەری ماڵی هەرکەسێك ڕێزی ئەو سێبەرەیان گرتووە کە لەژێریدا بوون. ئێستاش هەریەکێ لەو بنەماڵەیە ڕوویکاتە هەر جێگایەك‌و هەر دێیەك کە هەقەی تیا هەبێ، پێشەکی ڕووئەکاتە ماڵی یەکێك لە هەقەکان. جا ئەم هەقەیە دەوڵەمەند بێ یا هەژارو باری کۆمەڵایەتیی‌و چینایەتیی هەر چۆنێك بێ، لە هەموو جێگایەکی‌تر لای مەبەست‌ترە.

مەسەلەیەکی گرنگی‌تر ماوە ئەویش مەسەلەی سەربەستیی ئافرەت‌و ئەو درۆو بوختانی ئیباحی‌یەتەیە لەبەر تیشکی ئەم سەربەستیی ئافرەتەدا بۆ هەقەکان ئەکرا.

ئەوەندەی من ئاگاداری مەسەلەی هەقە بم‌و، چەند لە دانیشتووانی دێیەکانی تێکەڵاو بە هەقەم پرسیوە، بە هیچ جۆرێك نە ئەو باسە کراوەو بە بەرگوێمدا هەڵدراوەو، هیچ‌کەس لەوانەی دیومن‌و لێم پرسیون، باوەڕیان بەوجۆرە درۆو بوختانانە نەبوە. تەنانەت کەسانی‌واش کە لە ڕێبازی هەقە ڕازی نەبوون ئەم شتەیان بەدرۆ خستۆتەوە. ئەوەی لێرەدا مرۆڤ سەرسام ئەکا ئەو وتەیەیە کە بە زمانی کاك شێخ ستارەوە لە پەراوێزی (٤٥)ی لاپەڕە (٤٥)دا نووسراوەو گوایە ئەویش، لە دەمی ئافرەتێکی ڕێداری‌یەوە ئەیگێڕێتەوە. نازانم چۆن ئەو قسەیە لە توێی ئەم کتێبەدا جێی خۆی کردووەتەوەو کاك مستەفا عەسکەری‌یش ڕاستەوخۆ وەڵام‌و بەرپێچیی نەداوەتەوە. تو بڵێی بێ‌دەنگی‌یەکەی کاك مستەفا نیشانەی ڕازی‌بوون بێت، یا چی؟ من باوەڕ ناکەم کاك مستەفا ئەمە بەڕاست بزانێ ، چونکە ئەو لە هەموو کەس باشتر ئەزانێ ئەوجۆرە پێوەندی‌یە لەپێناوی هیچ شتێکدا لەنێوان دوو هەقەدا (وەکوو هەقە) بە هیچ جۆرێ نی‌یەو نەشبووە. من ناڵێم کوڕو کۆمەڵێ هەقە، وەك کۆمەڵە ئادەمیزادێك، ئەو غەریزەیەی تێدا نی‌یە، بەلام ئەم جۆرە شتە ئەگەر ڕووش‌بدات لەناو کۆمەڵێکی زۆری وەك کۆمەڵی هەقەدا ، وەك شتێکی ئاساییی نێوان دوو مرۆڤی دوور لە هەستی خاوێنی کۆمەڵایەتی‌یەوە ڕووئەداو لایەنی تایبەتی‌و شەخسیی خۆیانەو هیچی‌تر، چونکە کاری‌وا لە بیروباوەڕی هەقەدا شتێکی نەفرەت‌لێکراوەو زۆر لە مەسەلەکەوە دوورە. دووریش نی‌یە ئەو ئافرەتە ڕێداری‌یە کە

باسمان‌کرد، بەهۆی ڕەفتاری نالەباری خۆیەوە لە ڕیزەکانی هەقە دەرکرابێ ، چونکە لە ژیانی بزووتنەوەی هەقەدا سەردەمێك چاودێریی ئەوکەسانە کراوە کە نیاز بووە لە ڕیزی بزووتنەوەکەدا وەربگیرێن، تا ئەگەر دەرکەوت شایانی وەرگرتنن وەرئەگیران‌و ئەگینا وازیان لێ ئەهێنرا، وەك چۆن ئەوانەش کە لە ڕیزدا بوون ئەگەر بێ‌ڕەوشتی‌یەکیان لێ ڕوویبدایە بۆ ماوەیەك (تەجمید) ئەکران یان جەزایان لێ ئەسێنرا.

هەرچۆنێك بێت، ئەوەی زانراوە لەو شوێنانەی نزیك بە مەسەلەکەن، (خوشك‌و برا) دواپلەی پێگەیشتنە لەم مەسەلەیەداو، ئەمانە لەگەڵ یەکدا وائەزانن حەوت کێویان لە بەیندایە ئەمەش بۆ مەعلوومیی دڵپاکی‌و دواوێن‌پاکی‌یە نەك یەك کێو، وەك ژنە ڕێداری‌یەکە وتوویە.

لەڕاستیدا پیاوو ژنی هەقە، وەکوو خوشك‌و برای دایك‌و باوکی، هەڵس‌وکەوت‌و ڕەفتار لەگەڵ یەکتری ئەکەن‌و، واش تەماشای یەکتر ئەکەن‌و، هەر واشەو نەبیسراوە خوشك‌و برا هیچ جۆرە تێکەڵاوی‌یەکی جینسی‌یان لەنێواندا بووبێ. ئەم خوشك‌و برایەتی‌یەش لای ئەوان، بە ڕای من، بۆ پیاوی ژندارو ژنی مێرددار بووەو ئەوان وەك خوشك‌و برا تەماشای یەکتری‌یان کردووە، بەلام لە مەسەلەی کوڕو کچدا باری تێکەڵاویی کۆمەڵایەتی ئاسایی بووە، کە بریتی بووە لە ڕێزلێگرتن‌و داوێن‌پاکی‌و یارمەتی‌دانی یەکتر، چونکە ئەگەر کوڕو کچیش وەکوو خوشك‌و برا سەیری یەکتری‌یان بکردایە، ئەوا بەگوێرەی شەرع‌و داب‌و نەریتی کۆمەڵایەتی‌و ڕاستی‌یش نەیانئەتوانی ببن بە هاوسەری یەکتر. لەگەڵ ئەوەشدا کچ‌و کوڕ ئەوپەڕی ڕێزو داوێن‌پاکی لەبەینیانا هەبوەو ئەگەر یەکتری‌یان خۆش‌ویستبێت بە ڕێبازی شەرعی بەیەك‌گەیشتوون. جا کەوابوو ئەم مەسەلەی خوشك‌و برایەتی‌یە بەوە بووە کە هەموو ژنێکی خاوەن مێردی هەقە، هەموو مریدو سۆفی‌یەکی هەقەی بە برای خۆی زانیوە، جگە لە مێردەکەی خۆی. هەروەها هەموو پیاوێکی خاوەن ژنی هەقە، هەموو ئافرەمێکی ناوکۆمەڵی هەقەی بە خوشکی خۆی زانیوە جگە لە خێزانەکەی خۆی.

کاك مستەفا عەسکەری لە لاپەڕە (48)دا لە بابەتی (بانگ ڕاهێڵەکانی هەقەیەتی)دا لە باسی (برا سەیارەکان)دا برا سەیارێکی لەیادکردووە کە زۆر ژیرو بەسەلیقە بووەو یەکێك

ـووه لەوانەی هـەموو سیفـەتەکـانی هەقـەیەتی یـان تێـدا ـەتووەتەدی، ئەویش (مـام سمایـل)بوو کـە بە (سمـە زیتە) ـەوبانگی دەرکردبوو. ئەم پیاوە وازی لە ماڵو خێزان هێنابوو. ـێـی خۆی بۆ خزمەتکردنی مەسەلەی هەقەیـەتی تەرخـان کردبوو و ئەگەر لە برا سەیارەکانی تر لەپێشتر نەبووبێ وەکوو ـەوان بـووە. ئـەم مـام سمـایلە رەوشتێکی زۆر بـەرزی خۆنەویستنی تێدا بوو و ئەگەر تۆ بتویستایە هەر پارچەیەك لە ـەکانی بەری لێ بستێنی [هەموو دارایی و سەروەتی جلەکانی ـەری بوو] و قەناعەتت پێ بکردایە کە تۆ لەو زیاتر پێویستت بەو ـارچە جلە هەیە، پارچە جلەکەی لە بەری خۆی بۆ دائەکەندی و ـەیدایتێ، تەنانەت ئەگەر یەکێکیش بوایە لە پارچەکانی ژێرەوە. ـن چەند جارێك ئەم مام سمایلەم دیوە شەرواڵ یان دەرپێکەی ـاکەندووەو بەخشیویەتی بە خەڵك. جا بەلای منەوە پێویست بوو هەقەیەکیوا خۆنەویستو خۆ بۆ مەسەلەیـەکیوا مەزن تەرخان کردوو، ناوێکی لەگەڵ (برا سەیارەکان)دا هەر بهاتایە. هەرچەندە من ئەوانیترم نەدیون، بەلام رەنگە هەر وەك مام سمایل بووبن.

مـاوەتەوە شتێکی تـر: بـە لای منـەوە کـاك مستـەفـا عەسکەری ئەبوو بیکردایە ، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە سۆفیو مـریـدەکـانی لەدوای کـۆچی دوایی شێـخ عـەبـدولکـەریم دابـەشکرد بـە سێ کۆمـەڵی سەرەکی یـەوە، وەك لەپێشـەوە باسکران و هەر کۆمەڵە رێگای تایبەتی خۆی گرتـەبەر. ئـەو شتەش هەڵوێستی شێخەکانی هەقەیە بەرامبـەر مەسـەلەکە دوا ی کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریمو بەگوێرەی هـەڵسو کەوتیان لەگەڵ مەسەلەکەو دەوروبەریاندا کە بەپێی بۆچوونی من بەم شێوەیەی لێ هات .

(1) هەندێ لە بنەماڵەی شێخان بەگوێرەی رەفتاریان لەگەڵ سـۆفیو مـریـدەکـانو تـەئسیـری دەرەبـەگـایـەتیو دەسەلاتداریی دەوروپشتیـان وایان لێهـات دەورێکی گرنگیان لە مەسەلەکەدا نەما ، چونکە زیاتر روویان کردە رەوشتی دەرەبـەگایـەتیو بەگـوێـرەی کـارتێکـردنی دەوروپشتو بـۆچوونی تـایبـەتیی خـۆیـان دەمـاری عەشایەرییان تێدا جوولاو، تارادەیەك لە مەسەلەکـە دوور کـەوتنەوەو، تـەنیـا ئـەو پێـوەنـدییـە کـە بـە مەسەلەکەوەو بە مریدو سـۆفییەکـانیەوە هێشتبنـەوە ئەوەبوو کە لە بنەماڵەی شێخ عەبدولکەریمن و پێویستە رێزیان لێ بگیرێ .

(2) هەندێکیتریان کە بەتـوندی خـۆیان بـە مەسـەلەکەوە بەستەوەو سەرپەرشتییان کردو بەرەوپێشەوەیان بردو رێبازو هەڵو مەرجی زیادبوونیان بۆ ئامادەکردو خۆیان لە سوودی تایبەتیی خۆیان دوورخستەوەو هـەموو کـاتی خۆیانیان بۆ مەزنترکردنی مەسەلەکە تەرخانکرد .

(3) هەندێکیـتریان لە نـاوەراستدا مـانەوەو ئـەیانـویست هـەردوولایـا هـەبێتو بـە دیپلۆمـاسییـەتێکی زۆر شارەزایانـەوە هەرلایـەنێك سـوودبەخشتـر بوایـە بۆ پێشخستنی لایەنەکەیتر بەکاریان ئەهێنا .

لە کۆتاییدا ئەمەوێ ئەوەش بڵێم کە لەکاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا چەند هەڵەیەك سـەرنجیان راکێشـام . یەکێ لەو هەلانە نووسینەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزە بوو بە هەڵە کە لە دێری (1)ی لاپەرە (68)دا بەمجۆرە نووسـراوەتەوە «واسجـد لربك حتي يأتيك اليقين»و راستەکەی بەمجۆرەیە : «واعبد ربك حتى يأتيك اليقين 99/15» . یەکێکیتریان نووسینەوەی نـاوی (مەلا رەشیدی ئۆمەرگومەتی)یە بە (مەلا شەریفی ئۆمەرگومـەتی). یـەکێکیکەیـان پەرانـدنی ناوی (شێـخ سولەیمـان)و (شێخ عەبدوڵلای کۆسە)یە لە پەراوێزی ژمارە (6)ی لاپەرە (10)دا. دواییشیان نووسینی ناوی (مەلا حامیدی مـۆرد)ە بە (مـەلا حامیدی سەرمۆرد) .

ئـەمە بـوون بـەگشتی تێبینیو رایـەکـانم بـەرانبـەر کتێبەکەی کاك مستەفا عەسکەری. هیوادارم بە دڵێکی فراوانو هەقپەرستانەوە وەریانبگرێت، ئەو هەقپەرستییەی کـە بە رای من لە دڵو دەروونی هەر یەکێك لەو بنەماڵەیەدا جێگای خۆی کردووەتەوەو بووەتـە نیشانـەیەکی تـایبەتییـانو لێی لانادەن .

زۆر سـوپاسی مـاندووبـوونـەکـەشی ئـەکـەم کـە بـە زیندووکردنەوەی باسی ئەو مەسەلە مەزنە توانی جوولانەوەیەك بخاتە ناو ، ئەگەرچی بە مـاندووبـوونێکی کەمیش بـووبێ ، چونکە مەسەلەکە زۆر لەوە زیاتری شایانە کـە کاك مستـەفا کردوویەو ، ئەبوو ئەم ـ وەك کەسێکی شارەزاو ئاگادار ـ زیاتر بە ناخو دەروونیدا بچێتە خوارو روونی بکردایەتەوە ، بەلام هەرچۆنێش بێت خۆ مەسەلەکەی بە زۆر کەس ناساند .



# دەستنووسی بەهەنسا

● عبدالرقیب یوسف ●

هاوینی ساڵی 1978 کە بەشەوقەوە ، دەگەڕام بۆدانـەکانی = نسخەکانی ، دەستـنـووسی (سیسەبـان) ی کوردی بـەزاری کـرمـانجی خـواروو ، چـوومـە شـاری ڕانیـەو لەسـەر « کوێرەکـانی » یە جـوانەکـەی حەوشی مـزگەوتی گـەورەی ڕانیەدا ، کەلەژێرگردی ـ قەلاتە کۆنەکەیدا ـ هەڵدەقوڵێت ، بۆ یەکەمین جار ناوی هێندێـک کتێبی دەستنووسی تـری کوردیم لەدەمی ( مەلا موحەمەدی ) بیست ، ئەوی بە « مەلا لوکس » ناسراوە کەبانگ هەڵدەری مزگەوتەکەیە ، ئەم مەلایە چـونکە نیمچە خوێندەواری یەکی هـەیە ، لەکـاتی خۆیـەوە بایـەخی بەخوێندنەوەی ئـەوجۆرە کتێبـە ئایینی یـە کوردییـانە داوەو شتێکیشی بەنیوە هەڵەوە لەوانە لەبەر کردووە .

یەکێک لەو دەستنووسانە « بەهنەسا » بـوو ئیتر لەو هـاوینە گەرمەدا ، بەلاقی شکاوەوەو بەشەلە شەل کەوتمە گەڕانێکی زۆر لەناوچەی ـ ڕانیەو ـ قەلادزە ـ و ـ بنگرد ـ وکۆیسنجق هـەروەها هـەولێر ـ بۆ دۆزینـەوەو پـەیـداکـردنی هێنـدێـگ لەدانەکانی ئەم دەستنووسانە ، بەتایبەتی کەزا نیشم هێشتا شتێك دەربارەی ئەوانەو دانەرەکانیـان نەنـووسراوە چـونکە لەوباوەرە دام [ پێویستە بایـەخ بە هـەموو دەستـنـووسێکی کەلەپووری کوردی و هەولی چاپکردن و بلاوکردنەوەیان بدری لەسەر هەربـابەتێـك دانرابێ ] بـۆ وێنە دەبینـین ڕۆژهەلات ناسەکانیش بایەخ بەپەیدا کردن و بلاوکـردنەوەی ئـەم جۆرە دەستنووسانە ، ئەدەن ئـەگەرچی هیـچ پەیـوەندی یـەکیان بەزمان و ئایین نەتەوەکەیانەوە نی یە هـەروەکو [ رودینکـو ] کەدەستنووسی ( شێخی صنعانی ) و ( لەیلاو مەجنوون ) ی کوردیی بلاو کردۆتەوە ، ئیتر لەوهاوینەدا وهەروەها لەگەڕانی هاوینی ساڵی « 1979 » شدا حەوت دانەم لە دەستنووسی « بە هنەسا » کۆکردەوە جگە لەوانەش هەندێك دانەی دەستنووسی تریش وەکو ( رأس الغول ) و توانیشم زانیـاری یەکی بـاش لەژیانی دانەرەکانیش یان کۆ بکەمەوە ، هیوادارم لەم چـەند مانگەی داهاتوودا لێکۆلینەوەی « بـە هنەسـا » لەسەر ئـەو حـەوت دانەیـە کـۆتـایی پێ بێنـین و بـلاویکـەینـەوە ، ئـەم دەستنووسە کوردی یە نزیکەی (4000) دێرە شیعرەو لەسەدەی نـۆزدەهـەمـدا کـەلای [ مـەلاسـەعیدی هیـرانی یـەوە ] هـۆنراوەتـەوە . ئەمـەیش باسی هـەر حەوت دانـەکانی ئـەو دەستنووسەیە .

**1 ـ دانەی کووپە قران : ـ**

ڕۆژی ( 24 ی تەموزی 1979 ) چووم بۆدێی کـووپەقـران ـ دەشتی هەولێر بۆوەرگرتنی زانیاری ی دەربارەی ( شێخ نوری شێخ هادی گردەشینی ی )[1] لە شێخ محەمەدی کوری کەلەوەو پێش تر بیستم ئەو ـ شێخ نوری ـ دانەری (رأس الغول) ی کوردی یە ، ڕاستیش ئەو دانەیـەم هەر لەنێـو پاشمـاوەکانی نامەخانەی ئەودا دیتەوە . پێوانی ئەم دانەیە ( 22 × 18 سم ) سـەدو (88) لاپـەڕەیـەو زۆربـەی لاپـەڕەکـانیشی (48) دێـڕەو



شێوەی ڕاستەو چەپە نووسراوە تەوە کە جاران مەلاو
تی یەکان لەناو چەی سۆران و کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا
جار پەیرەوی ئەم شێوەیەیان بەنووسینە وەکانیان پەیداکرد
یوەی خەتی ئەم دانەیە لەبەینی ( شکستەی نستعلیق و
کستەی تعلیق ) دایەو لەسەر لاپەڕەی یەکەمدا نووسراوە :

« ینست فتح بهنسا »

ەرەتاکەی تەواوە ، بەم دەست پێ دەکا : ـ

**و دلیم ربنا　　لایقته حمدو ثنا**
**کرو بازارت دنا　　لعالمت کر بنا**

ەنیایەك پەڕەکاغەز لە کۆتاییکەدا کەوتووەو دوادێری
ئەمەیە : ـ

« نرمرو پیروزی　　استوندکیان چاکرد »

ینی (93) دێری کەوتووە بەگوێرەی بەرامبەر کردنی لەگەڵ
ـ نەکەی [ میرزا عبدورەحمان ]

بەرێز شێخ محەمەدی شێخ نوری کەتەمەنی (85) ساڵ بوو
ئەوکاتە بەمنی ووت ، ئەم دانە دەستووخەتی دانەرەکەیەتی
[ مەلا سەعید ] مکە کورە کەیشی [ مەلا محەمەد ئەمین ]
بەخشیویەتی بەباوکم کەزاوای مەلا سەعید بووو مێردی ـ
هەمین ـ ی کچی بوو زۆر هەوڵمدا لەو دوو هاوینەدا کە
دانەکەی مەلا سە عید ببینم ، ویان هێندێك كەس دیتوویانە یان
چی بەسەر هاتووە یەکێك لە کویسنجق دا بەمنی گووت دانەی
دەسخەتی دانەر بەشێوەی فارسی هەبووەو لەلای باوکم بوو کە
قوتابی مەلا سەعید بوو پاش مردنی باوکم من فەوتاندم یەك دوو
کەسی تریش لەوێدا لەمزگەوتی گەورەی کۆیە دانیشتبوون و
گوتیان ڕاست دەکات هەروەها [ حاجی مستەفای
نالبەند ] یش لەکۆیەدا ووتی : من دانەیەکم بەخەتی خاوەنی
هەبووەو [ بەلام نەیدەزانی خاوەنی یانی دانەرەکەی کێ
بووە ] حاجی زیاتر گووتی : لەپێش سی ی چل ساڵ ولەو کاتەی
کەرێگای ئۆتۆمۆبیل لەبەینی کۆیەو هەولێردا نەبوو ، پۆستە
چی یەکی هەولێری لەمنی وەرگرت نەیهێنایەوە ئیتر منیش
لەهەولێردا زۆر لەم پۆستەچی یە گەڕام و چووممەماڵی کورەکانی
چەند پۆستەچی یەکی ئەوکاتەو هیچ شتێکم دەستگیر نەبوو
جادوور نی یە مەلا سەعید دوو سێ دانەی وەیازیاتر لە
[ بهنسا ] بەخەتی خۆی نووسی بێ . بەرێز شێخ محەمەد
کەچەند جارێك بۆمنی سەلماند کەئەمە دانەیی مەلا سەعیدەو
بیری دێ کەمەلا محەمەد ئەمین داویەتی بەباوکی ، ئیتر
بەپێویستم زانی لەئەمە بکۆڵەوە .

لەبەر ڕۆشنایی و بەراورد کردنی خەتی دانەکەو نموونەیەك
لەخەتی مەلا سەعید کەچەند نموونەیەکم لەلا هەبوو . وەناوی
لەسەریان بوو .

ئیتر ڕۆژی دوایی دانەکەم هەڵگرت و چووم بۆ (موصل)
بۆئەوەی بەرێز مامۆستا « یوسف ذالنون » کەباشترین
شارەزای خەتی عەرەبی یە لەعێراقدا تا هەردوو خەت بەراورد
بکاو ڕابگرێت بەگوێرەی دەستووری خەت بیروڕای خۆی
دەرببڕێ ، ئەم شارەزایە کم لە نامەخانەی مۆزەخانەی
(موصل) دا دیت و پاش بەراورد کردنی هەردوو خەت مامۆستا
یوسف ذالنون ڕاپۆرتی خۆی بۆمن نارد تێیدائەڵێ : هەردوو
دەستخەتەکە هی یەك مرۆڤن کە (محەمەد سەعیدە ) زیاتر
ئەڵێ کەلە نووسینی « بهنسا » دا پەلەی کردووە . بەلام لەبەر
ئەوەی کەهەردوو خەت لەجووانیدا بەریەکتر ناچن هەر دڵنیا
نەبووم و جارێکی تر کاغەزێکم لەدەستنوسەکە لەگەڵ نموونەی
خەتی دانەرم بۆ ئەم شارەزایە ناردەوە کە جارێکی تر لێی
بکۆڵێتەوە دیسان لەڕاپۆرتی دووەمیدا هەر ئەوبیروڕایەی
پێشووی دەربڕیوە ، ئیستا هەردوو ڕاپۆرتم لەلایەو بڵاویان
دەکەین لەگەڵ دەستنووسەکەدا کەچاپمان کرد بەلام چونکە
گومانم کردووە بەپەیرەو لەلێکۆڵینەوەکانی خۆمدا ،
ئەوانموونەیی خەتیدانەر لەگەڵ لاپەڕەی (63 ، 64) لە
دەستنووسەکەم ناردبۆ [ مۆزەخانەی بەریتانیی ] بۆ
لێکۆڵینەوەی ، بەلام موخابن لەپۆستەدا بزرکراون مۆزەخانەکە
لەنامەیەکدا [ 6 نوفمبر 1980 ] دەڵێ بەدەستمان نەگەیشتووە .

پاش ئەوەی کەلەم دوواییەدا من باشتر تەماشای ئەم
دانەیەم کرد بەدووری نازانم کەبەخەتی دانەرەکەی بێ چونکە
ئەگەر لەدانەکانی تر باشتر نەبێ کەم ترنییە لەڕاست و
دروستیدا هەروەها لەبەر ئەمەی کەئەوکەسەی نووسیویەتی
هێندێك ووشەی گۆڕیوە بەهێندێکیترو خەتی بەسەر ئەوی
پێشوودا هێناوە هەروەکو لەم لاپەڕانەی دا :



[ 25 ، 30 ، 31 ، 43 ] بەمەدا زیاتر پێدەچێ کەدانەر ئەم هەوڵەی دابێ بۆ جوان کردنی کتێبەکەی‌و ئەم دەستکاری یە لەلای ئەوەوبێ نەك لەلای مرۆڤێکی تر .

دانەرەکان کاتێ کتێبەکانی خۆیان بۆ جاری دووەم یان زیاتر دەنووسن هەوڵ ئەدەن جوانتری بکەن بەگۆڕینی وە یان بە زیادکردنی هەندێك ووشە بەهەندێکی ترو رەش کردنی هێندێك (عبارة) ئەمەش دەبێتە یەکێك لەهۆیەکانی جیاوازی .

لەبەینی دانەکاندا هەروەکو ( ابن درید ) لەکتێبی (جمهرة) دا وەهای کردووەو هەروەها جاحظ لە [ البیان‌و التبیین ] داو هەروەها (الفداء) لە هێندێك کتێبەکانی‌دا تەمەشای عبدالسلام هارون بکەلە [ تحقیق النصوص‌و نشرها ص 31 — 33 ] .

ئەگەر ئەم دانەیە بەخەتی دانەر ( مەلاسەعیدی هیرانی‌یش ) بێ دیارە پەلەی لەنووسیندا کردووە وەکو بەرێز مامۆستا [ یوسف ذالنون ] ئەڵێ‌و لەشێوەی خەتی ئەم تێبینی‌یەی وەرگرتووە بەلام ئێمە لەوهەلانەی کەتێیدایە هەیە وەکو پەڕینی هێندێك پیتەکان ئەم تێبینی‌یە وەرئەگرین‌و دیارە جارێکی تریش بەسەریدا نەچووتەوە تائەو هەلانە بکەونەبەر چاوی‌و راستیان بکاتەوە هەروەها فڕێ دانی هێندێك ناونیشانەکانی بابەتەکان هەرلەبەر ئەم هۆیە بووە وەیان لەبەر کەم بوونی کاغەز ئەگەرچی ئەم دووە مەش لاوازە . لەم دواییەدا پەرەیەك لەم دانەیە و نموونەیەکی خەتی مەلا سەعیدم ناردووە بۆ [ دار الکتب والوثائق القومیة ] لەقاهیرە هەروەها بۆ [ معهد المخطوطات العربیة ] لەکوێت بۆ لێکۆڵینەوەی خەتی دا نەرەکە تابەتەواوی بۆمان روون ببێ ئەگەر بەخەتی دانەربێ یان نا :

2 — دانەی عبدالرحمن کفش دوز پێوانی 17 × 11 سم هێندێك لە سەرەتاکەی کەوتووەو (332) لاپەرەیە هەر لاپەرەیەکی (11)دێرە پێدەچێ کەمێکی لێ‌کەوتبێ بەلام لەکۆتایی یەکەیدا تەواوەو بەم دوودێرە کۆتایی‌پێ دێ کە کتێبی (بەهنەسا) بەم جۆرەدێ :

**خاکی غریب ی ناشی**
**دربدر ناچارت**
**شەهیدکی لری‌خۆت**
**شکری کاهزار جارت**

ئەم دانەیە لەسالی 1325 ك ( = 1907 / 1908 ) زاینی‌دا نووسراوەو ئەم (عبارە) تە هەر لەکۆتایی دانەکەدا بەم‌جۆرە نووسراوە [ تمت شد الکتاب المسما بترجمة الواقدی وسلام علیٰ من اتبع الهدیٰ ]

پاش‌ئەمە چوواردێر شیعری‌کوردیی پارانەوەی لەخوا هەیە دوای‌ئەوە ئەم‌نووسینەی خوارەوەی هەیە :

[ وسلام تمت شد کتاب اهنساو بهنسا وسلام علیٰ من اتبع الهدی یارب . عبدالرحمن پسری استاد محمد کفش دوز نمانده است في 8 محرم سنة 1325 ]

نوسەری حاجی عبدالرحمن ـ ی کەفش دوز = (کەوش دوز) لەپاڵ بەهنەسادا هەربەو مێژووە « عقیدە نامەی کوردی » نووسیوە کە « 14 » لاپەرەیەو لاپەرەکانی لەبەینی (12 ، 13) دێردایە تەنیالاپەرە « 14 » دوودێرەوە هێندێك لەسەرەتاکەی کەوتووە وناوی دانەرەکەی نەنووسیوە هەر وەکو ناوی دانەری بەهنەسا » یشی نەنووسیوە حاجی عبدالرحمان خەڵکی کۆیسنجق بووە وزۆر ژیاوە هەروەکو کورەکەی مامۆستا « رەفیق » بەمنی گووت کەئەم‌دانەیە لەلای‌بووە جادووڕنی‌یە حاجی عبدالرحمن لەلای‌دانەری بەهنەسا خوێندبێ لەوکاتەی مودەرریس بووە [ لەمزگەوتی بایزئاغا ](*) لەشاری کۆیەدا یان دانەرەکەی دیتبێ ، هەروەها دووڕنی‌یە ئەم‌دانەیە لەبەردانەی مەلا سەعیدی نووسی‌بێ‌و ئەگەرواش بێ هەڵەکانی کەم‌نین ، چونکە خوێندەوارێکی زۆر باش نەبووە . وەکو ( موستەعید ) یان‌مەلایەکی باش ، خەتیشی شێوەی (نستعلیق) ە .

3 — دانەی مەلا ئەحمەدی : سولتانەدێ پێوانی [ 22 × 16 سم ] . « 186 » لاپەرەی لێ‌ماوەو لاپەرەی لەبەینی « 14 — 22 » دێردایە (59) دێر لەپێشەکی یەکەی کەوتووە . بەگوێرەی دانەی میرزا عبدالرحمان‌و لەم دێرەشەوە



هەیە :

**جند امراو جند اعلام**

**جند امرای جوهردار**

(93) دێر لەکۆتایی کەشی کەوتووە هەروەکو دانەی (کووپەقران) - بێکەم‌وزیاد دووا دێریان کەماوەیەکە [ تـەماشـای دانەی کووپە قران بکە ] تابیرم‌کرد گووتم نەکا یەك لەهەردووان لەبەر ئەوی‌تر نووسرابێتەوە بەلام پـاش بەراورد کـردنی هێندێـك لەهەردووکیان دیتم کەجیاوازی لەبەینیان داهەیە . ئەم‌دانەیە هەمووی بەخەتی‌یەك کەسی نی‌یە بەلام نووسینی ڕوون‌ودیارە بەلکو لەجوانی‌یدا بـەشێوەی گشتی نـاوە نجی‌یەو بـەشێوە (تعلیق) ە ئەم دانەیە چونکە هی بەڕێز مەلا ئەحمەدی خەلکی دێی (سـولتانـەدێ) بووە کـە لەباشـووری (سەنگـەسەر) ە وچونکە ناوی نووسەرمان لێ‌دیارنی‌یە ئیتر بەناوی ئەوەوە ناوم بردووە ، مەلا ئەحمەد خوێندنی کەم بووەو تەمەنی دەوری (80) ساڵ بووە . پێ دەچێ ئەم‌دانەیەش کۆن بێ .

4 — دانەی محمد رشید جلیزادە پێوانی [ 20 × 13/5 سم ] « 165 » لاپەڕەی لێ‌ماوە لاپەڕەکانی لەبەینی (14 ، 15) دێردایـە دەوری «13» لاپەڕە لەسەرەتاکەی کەوتووەو ئەوی ماوەتەوە بەم دێرە دەست پێ ئەکا : -

**صادر کر امرو فرمان**

**صاحب آلابینه میدان**

(23) دێر لەکۆتایی‌یەکەی کەوتووەو دوادێری ئەمەیە :

**شیریان حمائل کردبون**

**لباسیان صد رنگ‌دەدا**

ئەم دانەیە کەلەناو دەستنووسە پەڕپـووتەکـانی (مزگـەوتی منارە) بوو لەکۆیسنجق کە(3) - بەخەتی (موحەمەد ڕەشیدە ) و لە نـازناوی « جلیـزادە » شەوە دەزانـرێ کـەلەبنـەمـاڵەی جلیزادەی کۆیسنجەقە . ونـاوی لەسەر لاپـەڕەی [ 19 ، 36 ] داهەیەو خەتی مەیلەو شکستە (نستعلیق) ە وناونیشانەکانیش بەمەرەکەبی سوور نووسراوە ، پێ‌دەچێ ئەم‌دانەیەش کۆن بێ . چونکە موحەمـە مەد ڕەشید لەبیر کە و میردا نە بووەکەمن پرسم لێ‌کردوون وەکو عەلادین حاجی ئاغا مستەفا کەتەمەنی (84) ساڵەو مرۆڤێکی خوێندەوارەو زۆرشـارەزایی بەتـایبەتی شارەکەیەتی وبۆیە ئەم دانەیەم نیشان‌داوە .

هەروەها پرسیشمان بەمامۆستا مەسعود موحەمـەد کردووەو ئەویش لەنامەیەکی‌دا دەڵێ : -

[ ئەم ناوەمان لائاشنا نی‌یە کەمامۆستای ناوبراو لەبنە ماڵەی جەلی‌زادەیە ]

**[ 5 - دانەی مەلا ئەبوبەکرو مەلا محەمەد سەلیم هیرانی** پێوانی [ 20 × 16 سم ] 98 ل

لاپەڕەکانی وەکوشێوەی پەخشان نـووسراوە بـەینی نەدراوە نێوبەیتی دێرەکان تەنیا بەنیشانەیەکی بچکـۆلە نەبێ وەکـو سەرە (هێ) .

ئـەم‌دانەیـە لەلایەن دوکـەس لەنەوەکـانی مەلا سـەعیـدی هیرانی‌یەوە ، نووسراوەتەوە کەئەمانەن :

مەلا ئەبوبەکـرو مەلا مـوحەمـەد سەلیمی کـوڕی موحەمـەد ئەمین . مەلا ئەبوبەکر کەکـۆچی دووایی کردووە بـرای مەلا موحە سەلیم کەلەڕۆژی 12 مانگی ڕەمەزانی 1362 (ك = 1943 زاینی ) دا تـەواوی کردووەو خـەتی هەردووبـرا لەلاپەڕەی (36) دا تێکەڵاو بووەو لەکۆتایی‌دا نووسراوە :

اشهد ان لا اله إلا الله واشهد أنّ محمداً رسول الله تمت كتابة نسخة بهنسا (...) الحقـير المذنب العـاصي محمد سليم الايـراني(4) رب اغفـر لی ولوالدي ولجميـع تعليقـاتي ولجميـع المسلمين آمين .

[ كتبت في 12 رمضان سنة 1362 ] خەتەکەشی مەیلەو (رقعه) یە ڕێتووبەت لەهەندێك لاپەڕەی‌داوە .

ئەم دانەیە لەنێو نامەخانەی بنەماڵەی مەلا سەعیدا بوو کە لای بەڕێز مەلا موحەمەدئەمین کوڕی مەلاموحەمەد سەلیمە .

**6 — دانەی مەلا ئەبوبەکری قەلادزەیی** پێوانی ( 22/5 × 18 سم ) 73 ل

بەشێوەی چـووار مالك (حقـل) لاپەڕەکـانی نووسـراوە یانی هەرخەتێـك دوو دێرە شیعـرە هەتـا (20) دێر لەلاپـەڕەیەکـدا

نووسراوەتەوە .

خەتی شێوەی (تعلیق) ەو خوێندنەوەی زۆر خۆشە ئەمدانەیە لەبەشی دووەمی کتێبەکە دەست پێدەکا کە دەربارەی داگیرکردنی شاری (بەهنەسا) یە وەلەم ناونیشانەیە دەست پێ دەکا : ـ

[ روانەکردنی حضرت خالد ابن الولید عساکر إسلامیە وتعیین کردن سالاران برسرولایت بهنساو جنگ دعوای ایشان و شهید شدن سلیمان فرزندش مردیا نجم الدین ][5]

بەشی یەکەمی کتێبەکە ، کەئامادە بوونی لەشکری عەرەبە موسلمانەکانە موسلمان بەرەو « بەهنەسا » و داگیرکردنی شاری ئەهناس « أهناس » ە لەم دانەیەدا نەنووسراوە .

ناوی نووسەر هەروەها مێژوش پێدەچێ لەکەمەوە تەمەنی ئەمدانەیە سی ی چل ساڵێك بێ .

یەكێك بەخەتێكی نوێ لەسەر دووا لاپەڕەی نووسیویەتی : « ترجمە مولانە ملا سعید ایرانی خوشناوەتی رحمت خوای لێبێ هزار جاران آمین »

وابزانم ئەمەخەتی میرزا عبدورەحمانی سەعاتچی یە وابزانم خۆیشی بەمنی گووت : ئەمن ئەم عبارەتەم نووسیوە ئەم دانەیە لەلای بەڕێز مجەوری مزگەوتی گەورەی قەلادزی بووە کەهی بەڕێز مەلائیبراهیمی ئاسنگەر بووە لەبەر ئەوەی ناوی نووسەر وەیان شارێك وەیان ئەوجێگایەی کەلێی نووسراوە لەسەر نی یە ئیتر بەناوی مەلا ئەبوبەکرەوەم نووسیوە .

**7 ـ دانەی میرزا عەبدولڕەحمانی سەعاتچی پێوانی**

( 20 × 16 سم ) 243 لاپەڕەیە لاپەڕەکانی لەبەینی (15 ـ 18) دێردایە ئەمدانەیە تەواوەو لەهەموو دانەکانی ترنوێ ترە خەتی جوان و خۆشە لەسەرپشتی نووسراوە « هذا کتاب اهناس و بهناس کردی » و لەسەر لاپەڕەی یەکەمیشدا نووسراوە هذا کتاب اهنساس وبهناس وفتح او در زمان حضرت عمر رضي الله عنە آمین ]

ئەم دانەیە لەلایەن عبدو رەحمان یانی میرزا عبدالرحمانی سەعاتچی قەلادزەیی یەوە نووسراوە ناویشی لەکۆتایی کەیدا هەیە لەگەڵ مێژووی تەواو بوونی [ 18 جمادی الأولی 1374 ] بەلام لەسەر پشتی نووسراوە (لە ذی الحجة و [ 1945/11/27 ] ئەم دوو مێژوەدا بەسەرنج دانیش ماوەیەکی نارێك لەبەینی هەیە جانازانین بەئەودەساڵە نووسینەکە تەواو بووە یان مێژووی سەرپشتی دانەکە لەدانە یەکی پێشتری وەرگرتووە لەکۆتایی ، دانەکەدا لەسەر قەراغی نووسراوە :

[ ترجمەی مولانەمەلا سەعید ایرانی عراق رحمة الله علیە آمین ] لەچەند جێگایەکدا « بسم الله الرحمن الرحیم » نووسراوەو دەربارەی نووسینەوەی « بسم الله الرحمن الرحیم » لەچەند ناونیشانێکدا میرزا بەمنی گوت ئەمن ئەم « بسم الله » یانەم زیادکردووە هەروەها گووتی : من دەستکاری هێندێك ناونیشانی ناو کتێبەکەم کردووە . وابزانم هەر میرزا دەستکاری برێك لە ووشەکانیشی کردووەو لەشێوەی خۆشناوەتی یەوە هێناوەیەتە سەر ناوچەی قەلادزێ . هەروەها بە منی گووت کەچەند دانەیەکی لە (بەهنەسا) ی نووسیوە .

لەڕۆژی ( 25 تەمووزی 1979 ) دا ئەمدا دانەیەم لە میرزا عبدالرحمان وەرگرت .

### ناوی کتێبەکە

ناوی کتێبەکە لەسەر هێندێك لەم هەفت دانەیەدا هاتووە بەلام بەچەند شێوەیەك : ـ

1 ـ « فتح بهنسا »

لەدانەی کووپە قراندا ئەمەلە سەر لاپەڕەی یەکەی یەکەمی هاتووە کەدووەرنی یە دانەی کەلەوەو پێش باسمان کرد ، دانەرەکەی بێ .

**2 ـ [ اهنساو بهنسا ]**

ئەمناوە لەکۆتایی دانەی عبدالرەحمان .کفش دوزدا هاتووە [ تەماشا باسی ئەم دانەیە بکە ] بێگومان « اهنسا » هەڵەیەو راستەکەی (اهناس) یە هەروەها لەکتێبی « کوردستان وئاینی ئیسلام » لاپەرە (5) داهاتووە [6]

**[ 3 ـ « فتح شهر اهناس و بهنسا »**

ئەم ناوە لەسەر یەکەم لاپەڕەی دانەی مەلا ئەبوبەکرو مەلا سەلیم هیرانی یە » .

**4 ـ « اهناس و بهناس »**

ئەم ناوە لە دوو جێگای هاتووە کەدانەکەی میرزا عبدورەحمانی سەعاتچی یە کەباسمان کرد .

بێگومان ووشەی دووەم « بهناس » هەڵەیە چونکە ناوی شارەکە ( بەهنەسا ) یە .

**5 ـ [ بهنسا ]**

ئەمناوەکەبەتەنیا لەووشەی (بهنسا) پێك هاتووە لەکۆتای دانەکەی مەلا ئەبوبەکرو مەلا سەلیمی هیرانی دا هاتووە کەباسکرا ، هەروەها ئەم ناوە لەکۆتایی دانەکەی [ ئەمین بێکەسە ] دابەم عبارتە هاتووە : ـ

تمت شد جلدی ثانی بهنسا از دست مذنب امین بی‌کەسە
ـەڕۆژی پێنج‌شەمە سعات دەهـو دەهـ دەقیقە 23 ربیع الأول
ســالی 1352 لە قریـە حاجی قـەلا ، ئەم دانـەیەم لەلای خـوا
ێخۆشبوو مامۆستا ( مەلا ڕۆوف سەلیم حەوێـزی ) دیتووە
ـەمەزگەوتی گەورەی کۆیسنجق کەنیازی چاپ کردنی هەبوو .
کتێبەکە بەم ناونیشانەی لەدوایی‌یەوە ناسراوە یان بڵێن زیاتر
ناسراوە لەنێو خەڵکدا .
ئەگەر بەتەواوی چەسپا کەدانەی ( کووپە قڕان ) بەخـەتی
دانەرەکەی مەلا سەعید هیرانی‌بێ ، ئەوا ناوی [ فتح بهنسا ]
ئەچەسپێ پێش (3 . 5) ددحری‌و ناوی (2 . 4) یش هەر لەخۆیدا
هەڵەیە وەکو گوتمان .

**دانەری کتێبەکە**

**دانەری ئەم کتێبە مەلا سەعیدی هیرانی‌یە [ موحەمـەد سەعید کوڕی بەکر بەگ کوڕی موحەمەد بەگ کوڕی خضر بـەگ ] ە لەسەدەی نـۆزدە هـەمـدا داینـاوەو تـا سـالی** [ 1301 ] کۆچی = [ 1883 — 1884 زا ] یش زێندوو بووە وەیان
تاساڵی [ 1303 ك = 1885 — 1886 زا ] یش
هـەروەکو بـەدرێژی لەگـۆتارێکی تـردا باسی ژیـانی ( مـەلا
سەعید ) دەکەین .
ناوی ( مەلاسـەعید ) (ئیـرانی) یانی (هیـرانی) کە لەسـەر
قەراغی لاپەڕەی کۆتایی دانەکەی میرزا عبدالرحمن نووسراوە
هەروەکو دەقی ئـەو نووسینـەمان لەبـاسی ئەم دانـە یەدا ،
ڕابوردووە (تەمـاشای بکـە ) هەر وەهـا ناوی دانـەر لەسەر
لاپەڕەی دوایی لەدانەکەی ( مەلا ئەبوبەکری قەلادزەیی ) ش
نوسراوە بەخەتێکی نوێ وەکو باسمان کرد ، دانەر ناوی خۆی
لەکتێبەکەدا نەهێناوە بـەلام ناز نـاوی خۆی بـە (خاکی) ی
لەسێیەم دێڕی کۆتایی کتێبەکەیدا بەم جۆرە هێناوە :

**خاکی غریب ناشی**
**دەربدر ناچارت**

ئەم دێڕە شعرە لەدانەی عبدالرحمن کفش دوزو مەلا ئەبوبەکرو
مـەلا سـەلیم ، مـەلا ئـەبـوبـەکـری قـەلادزەیی‌و میـرزا
عبدالرحمان‌دا هاتووە بەلام لەمدانەی دوایی‌یەدا دەبێتە دێڕی
چووارەم چونکە میرزا لەکۆتایی‌دا لەلای خۆیەوە دێڕێکی زیاد
کردووەو یان وەری گرتووە یانی نوسەری دانەیـەکی تر ئـەم
دێڕەی زیاد کردووە . هەروەها لەسەر دانەی [ ئەمین بێ‌کەسە
هەیە ] « خاکی » ش نازنـاوی ( مەلا سـەعیدە ) هـەروەکو
( مەلا موحەمەد ئەمین ) ی کوڕیشی ئەمەی گووتووەو بەخەتی
خویشی نووسیویەتی ، ئەمەش لەکـۆتای کتێبی [ الفـوائد
الحسنیـة في الربــع المجیب ] ی دانـراوی (مـەلاافنـدی)
**کەلەڕۆژی 22 ربیع الاول سالی** ( 1314 ك = 1896 — 1897 زا ]
لەدێ (خەتێ) کتێبەکەی ڕەونوسی کردووە ، لەوکاتەی دا خۆی
لەلای (مەلاعەبدول فەتـاحی ) خەتی دەیخـوێند بێجگـە لەم
بەڵگانەش لەدەمی چەند کەسێکی ترم بیستووە وەکو مامۆستا
مەلا ڕۆوف حەوێزی کەتەمەنی لەساڵی (1978) دا (84) ساڵ بوو ،
هەروەها مامۆستا مەلا مصطفی بێلنگی هەروەهـا مامـۆستا
[ مـەلا عـەزیـزی هیـرانی ] ش لەنـامـەیـەکیدا کـە لە
[ 1978/9/1 ] ە بۆمنی ناردووە ئەمەی گوتووە .

**احمد کامووسەکی**

قسەیەك هەیە کە ئەحمەد کامووسەکی یارمەتی مـەلا
سەعیدی داوە لەهۆنینەوەی (بـەهنەسـا) تەنـانەت لەسـەر
دانەکەی (امین بێ‌کەسە) نووسراوە کە (بەهنەسا) (ترجمەی
مەلا سعیدو شعری ئەحمە کامووسەکی ) یە ئەم دانەیە وەکو
لەپێشدا باسمان کرد لەلای خوا لێخۆشبوو مەلا ڕەؤوف سەلیم
حەوێزی بووە کە بەدەمیش ئەمەی بێ‌گووتم :
مامۆستا مەلا عەزیزی هیرانی ( کوڕی کاکەی هیران-ی
شـاعیرو سـۆفی شێخ مستـەفا هیـرانی ) یە کـە بەمێـژوی
1978/9/1 نامەی بۆمن نووسیوەو لەنامەکەیدا دەڵێ :
[ واما احمد کاموسەکی المشهور باحمد شایر کان معاصراً للا
سعید واعانه علی نظم بهنسا وکان تکلمات احمد في المحاورات
نظماً وکان أحمد صدیقا لعلي برد شانی‌و یطلبهمـا الناس من
اطرافهما في وقت العرس للغناء في الرقص حتیٰ لودام الرقص
ثلاثة أیام ماعطلوا ویقولان من غناء الرقص ما شاء الله ارتجالاً
... وفي حقي أحمد کاموسەکی‌و عـلی بردشـانی یحکی الناس
حکایات عجیباً لا اوثق لي بهما فلا اتقولها ]
ئەم قسەیەم لە بەڕێز مامۆستا ملامستەفـا بێلنگی یش
بیستووە کەمرۆڤێکی زاناو بەتەمەنە وەکو مامۆستا مەلا عەزیز
کە خەڵکی دێ (بێلنگە) یەو نێزیکی هیران‌و کامووسەکە ئەویش
بەمنی گووت جـارو بار احمـد هاتـووە تەلای مـەلا سەعیـد
لەهۆنینەوەی بەهنەسادا یارمەتی داوە . جادوورنی‌یە ئەحمەد
کامووسەکی یارمەتی مەلا سەعیدی دابێ بەلام نەك هەمووی
هۆنینەوەی ئەوبێ ، هەروەکو لەسەر دانەکەی ئەمین بێ‌کەسە
نـووسراوە ( تـرجمـەی مـەلا سـەعیـدو شعـری ئـەحمـەد
کامووسەکی ) یە ، بەڵکو هەموو شعری ئەونی‌یە چونکە مەلا
سەعید دەستی شعری هەبووە هەروەکو بەشعـری ئەوشتی

ترمان دیتوووەو لەباسی ژیانیدا باسی دەکەین . ئـەم شایـەرە گەورەیە خەلکی دێی (کامووسەك) بووەو کە لەهیرانەو نازەنین ە وەزۆر دوورنییـە ئیستـاش نـاووبـانگی لەکـویسنـجق وخـۆشناواتی یـدا هەرمـاوە بەلام مـوخـابن تـائیستـا هیـچ بـەرهەمێکی لەبـەندو گـۆرانی ئەو کـۆنەکـراوەتەوە چـونکە نەمتوانیوە خۆم بگەیەنمە دێی کامووسەكو هەر هەولێکم دابێ بۆ بەدەست هێنانی هێندێك لەبەر هەمەکانی سەرنەکەوتـوەو هیوادارم لەمەولا شتێك بەشتێك بکەین .

[ مەلا سەعید بەهنەسای لە (هیران) دا هۆنیوەتەوە ] لەپێش ئەوەی بچی بۆ (دیبەگە) و (کویسنجق) لەکۆتایی دانەی عبـدول رەحمان کفش دوزدا ئـاشکـرا کـراوە (بـەهنـەسـا) وەرگێڕراوی واقدی یـە ( تەمـاشا بـاسی ئەم دانـەیەبکـە ) لەسەردانەی مەلا ئەبوبەکری قەلادزەیی‌و ئەمین بێ کەسە و میرزا عبدول رەحمانی سەعاتچی‌دا نووسراوە « ترجمەی مەلا سەعید » بەلام ناوی (واقدی) وەیان کتێبەکەی (فتوح الشام) یان نەهێناوە . جگە لەمە ئەگەر بەهنەسا لەگەل (فتوح الشام) دەربارەی ئەم باسە بەراوورد بکەین کەدەزانین ئەمە لەوەوە وەرگیراوە .

## * ناوەڕۆکی کتێبەکە *

نـاوەڕکی ئەم کتێبـە داگیرکـردنی شاری (اهنـاس) و (بهنسا) یە لەلایەن لەشکری عەرەبە موسلمانەکانەوە .

ئەم دووشارە کەدەکەونە ڕۆژئاوایی ڕوبارە (نیل) ە وە لەدەستی ڕۆمانیەکاندا بووە ـ شاری بەهنەسا دەوری سێ سال بەسەر کردایەتی (بطلیموس) ی ڕۆمانی بەرگری زۆر سەختی کردووەکە ، کەم شار بەم شێوەیـە دەیتوانی بـەرهەلستیی عـەرەبە مـوسلمانـەکان بکـا وەیان هـەر نەبـووە بەدرێـژای (فتـوحـاتی ئیسـلامی) پـاش کـوژتنی پێنـج هـەزار کـەس لەموسلمانەکان ئەوجا شاری بەهنەسا خۆی دا بەدەستەوە .

ملاسەعیـد ئەم بـاسەی لە (فتـوح الشام) ی واقـدی (محمد کوڕی عمر) وەرگرتووە کەزۆر بەدرێژی لەسەری چووە و (97) لاپەڕەی لە [ فتوح الشام ل 213 ـ 310 ] چاپی دار الجیل ـ بیروت دەربارەی ئەم ناوەڕۆکی باسەیە .

### پەراوێز

(1) ـ شێخ نوری دەکتێبی ئایینی بەکوردیی هۆنیوەتەوە وەکو : فتح بدر ، معراج ، چل معجزات ، عقیدی ئیمان ، راس الغول . کتێبەکانی هەمووی بەخەتی خۆی هەبووە ، بەلام کرم و مشك پەڕپووتیان کردووەو زۆر لەکتێبەکانی نامە خانەکەی خۆی پەڕەیەك وەیان چەند پەڕەیەکی کەم‌و بەخەتی خۆی ماوە تەنیا «سیسـەبان» و «عقیـدە» نەبێ سیسەبان بەدەستخەتی خـۆی‌و (6 — 7) دانەی تـری (هاوتـای) ی هەروەهـا (راس الغول) یش (6 — 7) دانەی هاوتایم لێیان کۆکردوەتەوە بۆلێکۆلین‌و بـلاوکردنمـان وەه روەها توانیومە تەرجەمەی ژیانی شێخ نوریش ساخ بکەمەوە وەبەسەرهاتی ژیانیم باش سـاخ کـردووە کـەلەهـەشتی مـانگی (ربیـع الاول سـالی 1354 ) کـوچی‌یـدا ( = 1935 / 1936 ) زایندا کۆچی دوایی کردووە ، هەر وەکو شێخ موحەمەدی کوڕی لەنامەی خۆیدا بۆمنی نووسیوە ، پاش ئەوەی ئەو هەلەیەی دەربارەی مێژووی کۆچ کردنی نوری کرد بوومان .

لەم گـوتارە کـەمانـدا « ذخرة السـالکین الکتـاب الکردي الضـائع للشیـخ نور الدین البریفکانی » کە لە ڕۆژنامەی (العراق) 3 / 4 / 1980 ] دا بلاوبوە .

(2) ـ مزگەوتی بایز ئاغا دەکەوێتە گەڕەکی بایز ئاغاو جاران دەکەوتە سـەر شورەی شارەکەرا سەری باغەکانی کویسنجق لەسالی ( 1285 ك = 1868 — 1869 زا ) لەلای « حاجی حسین » ە وە تەعمیر کـراوەو وەستایـە کەش وەستـای زیرەك (عبـاس) ێ (قولەبەگی) یە هەر وەکو لەسەر ئەو بەردە مەر مەرەی کە لەسەر دەرگای جێگای نمێژ نوسراوەو حەوت دێرە شعری فارسی‌یش لەسەریەتی ئەم وەستایە کوردە ( مـزگەوتی شێخی چولی ) لە هەولێریش ئاواکـردووە بە (16) سـال پاش ئـەمە . تـەماشـای ئەم گوتارەمان بکە : [ دارتراثیة مزخرفة في کویسنجق معرضە للتهدیم ] ڕۆژنامەی االعراق 18 / 2 / 1982 .

(3) ـ مزگەوتی منارە مزگەوتێکی کونی کویسنجق دەکەوێتە گەڕەکی قەلات (یانی قەلاتە کۆنەکە) لەبەشی باکوری شارەکە لەسالی (1183) کۆچی = 1769 — 1770 زا ) نـوێ کراوەتەوە . هەروەکو لەسەر بەردێك لە هەیوانەکەیدا نووسراوەو پێنـج دێرە فـارسی لەسەریەتی لەگەل (بسم الله الرحمن الرحیم) کە لە ڕەسمی بالندەیـەکدا نـووسراوە، منارەیەکی گچکەو خارو خێچ لەگۆشەی ڕۆژئاواکەیدایە .

(4) ـ مەلا سەعید (الایرانی) یانی (هیرانی)

مەلا سەعیدش «ایران» لەباتی «هیران» دەنووسێ ، من لەو بڕوایـەدانیم کە ووشـەی «هیران» لەووشەی «ایران» هاتبێ

(5) ـ دوورنی‌یە « مددیا نجم الدین» لەگوفتاری دانەر نەبێ .

(6) ـ ئەم کتێبە لەسالی (1970) چاپکراوە بەناوی مەلا ڕۆوف سەلیم حەویزی‌یەوە بەلام کتێبی ئەونی‌یە بەلکو هەندێکترە کە = ئەلێن‌یێ ( مەلا عەزیزی سەردەستی ) یەکە تاسالی 1978 داش ئەلێن زێندوبوە ئەوی وەرگیراندوە بەشعرو پەخشانی کوردی لەکتێبێك کە تائیستا بۆم ڕون نەبوە چی کتێبەك بووە هندێك ئەلێن باسێکە لەکتێبی واقدی بەلام هیچ باسێك وەها لە (فتوح الشام) دانی‌یە . وەئەگەر لە (فتوح العراق) ی ابی مخنف بێ وەیان کتێبی تربێ نایزانم ئەلێن کتێبەکە لەلای (مەلاصمد) ی مەرگەیی بووەکەمرۆڤێکی یەکجار بەخیل‌و ئەنانی بووەو کتێبەکە پێشانی خەلك نەئەداو ئەگەر لەکاتی (جـاحظ) دابایە لاپەڕەیکی تایبەتی لە کتێبی (البخلاء) ی بۆ تەرخان ئەکرا ، بیستوومە کە (ملا صمد) قوتابی‌یێ مەلا سەعیدی هیرانیش بووە ئەمکتێبە زۆر بـەووردی داگیرکـردنی ناوچەی (ڕانیەو قەلادزە) ئەکات هەروەها باسی داگیرکردنی هەرێمی (اذربیجان) یش ئەکات لەلای عەرەبە موسلمانەکانەوە . چالەکاتی نووسینی ئەم ووتارەدا لەم کتێبەدا ، دیتم کە مەلا ڕوؤف ناوی « اهنسا و بهنسا » هیناوە و نەگوتوەیی مەلا سعیدە .



تەندروستی

# ئیفلیجی منداڵان

## هۆیەکانی و نیشانەکانی خۆپاراستن

احمد مصطفى احمد

ئیفلیجی منداڵان یەکێکە لە نەخۆشی یە فەوتێنەرەکان . بە شێوەی درمی ڕوودەدات . خێرا بڵاودەبێتەوەو زۆر جۆری جیاوازی هەیە . دەبێتە هۆی ئیفلیجی بە گشت جۆرەکانیەوە هەر لەچەشنی ساکاریەوە کەلەیەکێ لە ماسولکەکان یان بەشەکانی تری لەشدا ڕوو دەدات وەکو دەستو قاچو زمانو ڕووی نەخۆش بۆ ماسولکە کانی سكو قەفەزەی سنگو قورگوبۆڕی هەواو ناو پەنچك .. هەروەها جێگەی سەرنج دانە کەتووشی گەورانیش دەبێت لە نێوان تەمەنی ٢٠ ـ ٣٠ ساڵیدا لەوانەشە ژیانی منداڵەکە بخاتە مەترسیەوە ئەگەر خەمی لێ نەخوراو هەروا مایەوە ئەوا دەبێتە هۆی دڵتەنگیو بار بەسەرکەسو کاریو کۆمەڵەکەیدا ، کەگیرۆدەی چەندان تەگەرەو شێوانە زگماکیەکان (تشوهات خلقية) دێت ، سەرەڕای تەنگو چەڵەمە دەروونیەکان کەلەسەری کۆمەڵ دەبن هەرلەسەردەمی منداڵیو قۆناخەکانی تری قوتابخانەو ژیانیدا ..

هۆکاری تووشبوون بەم نەخۆشیە بریتی یە لە ڤایرۆسی ئیفلیجی منداڵان کەسێ جۆری هەن (١و ٢ و ٣) کە یەکەمیان زۆرترین پەیوەندی هەیە بە حاڵە تەکانی ئیفلیجیو لەوانەشە بگوازرێتەوە بۆ گیانلەبەرانی تر وەکو مەیمونو مشكو گوێدرێژ .. ئەم ڤایرۆسە دەچێتە کۆئەندامی هەرسو سەرووی کۆئەندامی هەناسەدانەوە وەکو دەمولووتو قورگ . زۆر بوونی ئەم ڤایرۆسەش لەناو کۆئەندامی هەرسدا بەردەوام دەبێت بۆ چەند هەفتەیەك یا چەند مانگێك دوای تووشهاتنی حاڵەتی کەم خایەنو توند (الحالة الحادة) ئەمەش کارێکی زۆر گرنگه له لایەنی خۆپارێستنەوە لە نەخۆشیەکە .

هەروەها دۆزراوەتەوە کە کۆتایی بە هارو سەرەتای هاوینو سەرەتای پایز گونجاوترین کاتن بۆ دەرکەوتنی نەخۆشیەکەو دەشتوانرێ بگوترێ کە مێشو مەگەز کاریگەرێکی گەورەیان هەیە لە گواستنەوەی ئەم نەخۆشیە . هێرشکردنە سەر کۆئەندامی دەمار ( الجهاز العصبي ) لە لایەن ئەم ڤایرۆسانەوە بەدرەنگیەوە ڕوودەدات لەڕێگەی گواستنەوەیەوە بەهەر هۆیەکەوە بێت لە کۆئەندامی هەرسەوە .

هەروەها چەند هۆکارێکی تری یارمەتیدەر هەن کە دەبنە هۆی تووشبوون بەم نەخۆشیە وەکو ڕێژەی بەرگری سروشتیو وەرگیراو لە لەشی منداڵەکەداو باری ناڵەباری نەخۆشیو هیلاکبوونو تەندروستی گشتی منداڵەکەو بەد خۆراکیو باری ئابووریو پاكو خاوێنی ڕانەگرتنی منداڵ دەورێکی کاریگەریان هەیە لە ڕێژەی تووشبوون بەم دەردە .

لە هۆکارە گرنگەکانی تری تووشبوون بریتی یە لەبڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە بە هۆی کەمی ڕادەی ڕۆشنبیری تەندروستی لە ناو خەڵکیدا وەبەکارهێنانی کەلو پەلو خۆراکی نەخۆش تیکەڵاوبوونی لەگەڵ منداڵانی لەش ساخداو نە کوتانی منداڵە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا وەیان هەندێ جاریش باش هەڵ نەگرتنی پێکوت ( لقاح ) ە کە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا لە نەخۆشخانەکانداو پاشان بەکارهێنانی بۆ منداڵ مەترسی لێ دەکرێت بۆ تووش هاتن بەم نەخۆشیە . هەروەها جێگەی داخو دڵتەنگیە کە ئەم نەخۆشیە لە وڵاتی ئێمەدا زۆر بڵاوە لەم سەردەمەدا کە کۆتای سەدەی بیستەمەو بە پێچەوانەی وڵاتە



پێشکەوتووەکان کە زۆر بە دەگمەن لە ناویاندا بەدی دەکرێت . بێگومان ئەمەش لە ئەنجامی کەمتەرخەمی کەس و کاری منداڵەوەیە کە نایبەنە خەستەخانە بۆکوتان . ئیفلیجی بە گوێرەی باری ڕوودانەکە دەتوانرێ دوو جۆری لێ جیابکرێتەوە یەکەمیان لە شێوەی سووکە دەرد (minor illness) دایەو چەند نیشانەیەك لە سەر نەخۆش دیاری دەدات وەکو : ژانەسەر، هەستکردن بە ناخۆشی و شپرزەی بریندار بوونی قورگ و ڕشانەوەو تاڵێهاتنێکی سووك دایدەگرێت . وە لە وانەیە دوای چەند ڕۆژێك ئەم نیشانانە لەناو بچن و پاشان بگەڕێنەوە بەڵام بە شێوەیەکی توندتر کە دەبێتە هۆی پەك کەوتنی نەخۆشەکە، شێوەی جۆری دووەم کەگرانە دەردە (major illness) و بە زۆری لە منداڵانی گەورەترو هەرزەکاراندا ڕوودەدات وەلە نیشانەکانیشی : تاڵێهاتن و ژانە سەرێکی توونـد نەخۆشەکە دادەگرێت . ڕەق بوونی ماسولکەکانی مل و پشتاو ژان کردنیان و نەخۆش ناتوانێ پشتی بچەمێنێتەوە . وە لاوازبوون یا نەمانی ئەرکی ماسولکە جۆراو جۆرەکان و، وەڵام نەدانەوەیان بۆ هەرکاریگەرێك کە دەکەوێتە سەریان .

**نیشانە گشتییەکانی ئیفلیجی منداڵان** : ئەو نیشانانەی کە لە سەر نەخۆشەکە دەردەکەون بریتین لە تاڵێهاتن، هەڵامەت، هەستکردن بە نارەحەتی و شپرزەیی، ژانەسەر، سكچوون، ڕشانەوە، کەم ئارەزووکردنی خواردن، ڕەق بوونی مل و پشت . هەروەها تەمەڵی و داهێزران و خێرا هەڵچوون و زووتووڕەبوون لەسەر نەخۆش دیاری دەدەن . لەگەڵ هەستکردن بە ئازارو بێداری و شەو نخونی کرژبوونی ماسولکەکانی پشت و دەستەکان دەچنەپاشەوە بە هۆی لاواز بوونی ئەرکی ماسولکەکانیان .

**سوورەکانی نەخۆشییەکە** : ئەو سوڕانەی نەخۆشەکەی پێدا دەڕوات کاتی تووشبوونی بەم دەردە، بریتین لە سێ سوور .

**سووری یەکەم** : بریتیە لە سوڕی پێش ئیفلیجی کە شێوەی زۆرترین لە نەخۆشیە هەوکردوە سوکەکان (التهابات خفیفة) دەکات . دیاری کردنی جۆری نەخۆشیەکەش زەحمەتەو پەرە دەسێنێ بۆئیفلیجیەکی نەگۆڕو هەمیشەیی . ئەو نیشانانەی لەم سوڕەدا دیاری دەدەن : ژانە سەرو گێژبوون و تاڵێهاتن و سك چوون و ژانە سك .

**دووەم سووری ئیفلیجی** : ئەمەش ڕاستەوخۆ دوای سوڕی یەکەم دێت، لەنیشانەکانی : لاوازی و هاتنە خوارەوەی پلەی گەرمی، ڕەق بوونی مل و ژان کردنی لەگەڵ مێزگیران . هەروەها ماسولکەکان تووشی هەستیاری (حساسیة) و لەرزۆکی و ئازارێکی بەتین دێن دوای کرژبوونیان کەهۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جوڵانەوەو بەرکەوتنی سەرما . کاتێ ئیفلیجی لە ماسولکەکاندا ڕوو دەدات زۆر بەتووندی دەبێت و گێڕانەوەی کاری ماسولکەکان لە هەفتەکانی داهاتوودا دەبێت .

**سووری سێیەم** : ئەمە ش بریتییەلە سوڕی چاك بوونەوە لە نەخۆشیەکەو زۆرترین بوژانەوەش کە دێتە دی لە مانگەکانی یەکەمی دوای ڕوودانی ئیفلیجیەکە دەبێ و کارەکە پێویستی بە نزیکەی دووساڵ هەیە .

**چارەکردن** : چارەی حاڵەتە کەم خایەن و توندەکان :
لەم حاڵەتەدا نەخۆشەکە دەبێ لەنەخۆشخانە بخەوێنرێ بۆئەوەی بحەسێتەوە چەند کارێکی سووك و گونجاوی بەگوێرەی بارەکەی بۆ ئەنجام دەدرێت . بۆ لابردنی ئازارو کرژبوونی ماسولکەکان پەڕۆی گەرم کراویان دەخرێتە سەر، بۆ گێڕانەوەی کاری ئاسای خۆیان ڕاهێنانی گونجاو بۆ ئەندامە تووشبووەکەئەنجام دەدرێت : دانانی نەخۆشەکە لەبارێکی گونجاو شوێنێکی وا کە هەواکەی پاك و سازگاربێت و هەناسە پێدانی لە کاتی پێویستیدا . بەکار هێنانی لانك بۆ گێڕانەوەی درێژی ئاسای ماسولکە تووشبووەکە . پەستان خستنە سەر مێزڵدان بە هێواشی و نەرمی بۆ چونە دەرەوەی مێزکاتی مێزگیرانی منداڵەکە .

چارەی حاڵەتە پێشکەوتوەکان : چاك بوونەوەی نەخۆشەکە دەگۆڕێ بە گۆڕانی شوێنەکەو چۆنیەتی هێرشە درمیەکان (الهجمات الوبائیە) . ناتوانرێ مەودای چاك بوونەوەی نەخۆشەکە هەڵبسەنگێندرێ لە یەکەمین ڕۆژەکانی دەردەکەدا بەڵام گەڕانەوەی کاری ماسولکەکان بەزووی و بە شێوەیەکی نادیار لە سەرەتادا نیشانەی بەکارکەوتنەوەی ماسولکەکان و خێراچاك بوونەوەی نەخۆشەکەیە . بە کۆتای



هتنی حالەتی کەم خایەن و توند لەوانەیە چەند شێوانێك یان پشما وەیەکی ئیفلیجی بمێنێ لەسەر ماسولکە تووش بوەکانی منداڵەکەو بۆ چارەکردنی ئەم حاڵەتەش ڕێنمای نەخۆش ـەکرێت بۆ هەستان بە چەند چالاکیەکی سوك و لەبار وەکو ڕاهێنانی ماسولکە توش هاتوەکان و شێلان و گەرم داپۆشین . ومبەکار هێنانی پاڵپشت بۆ ئەندامەتووش بوەکە کاتی کەمتر بوونەوەی دەردەکە . هەروەها پێویستە لە سەر پەرستاری کەزۆر هێمن و کارامە بێت هەردەم چاودێری نەخۆشەکە بکات و دلخۆشی خۆی وکەس و کاری بداتەوە .

**خۆ پاراستن** : خۆپاراستن لەم نەخۆشیە زۆر گرنگ و ئاسانە چونکە پێکوتی (لقاحی) ئفلیجی منداڵان لە گشت ناوەندەکانی تەندروستیدا هەیە پێویستە لە سەر هەموو دایکێك پێکوتەی دژی ئفلیجی منداڵان کەلە شێوەی قەترەدایە بداتە منداڵەکەی لە مانگی دوەم یا سێیەمی تەمەنیدا . بەبڕی سێ ژەم (الجرعة) لە ساڵی یەکەمدا و ژەمی چوارەم لە ساڵی دوەمدا و ژەمی پێنجەم لە ساڵی چوارەمدا . بەلام پێویستە تێبینی ئەوەش بکرێت کەئەگەر منداڵەکە تووشی تالێهاتن یان هەوکردن یان سك چوون بووبێت ئەوا کوتانەکەی بۆچەند ڕۆژێکی تر دوادەخرێت تا منداڵەکە چاك دەبێتەوە . هەروەها سەرەنجی ئەوەش بدرێ کەکاتێ منداڵەکە تووشی ئفلیجی هاتبێ نابێ پێکوتەی دژی وەناق (دفتریا) کۆکەڕەشە wooping cough بدرێتی چونکە ئەو پەلەی دەرزی‌یەکەی لێ دەدرێت زیاتر شیاوە بۆ پەك کەوتن و تووش بەئفلیجی . دڵنیابوون لە وەرگرتنی پێکوتەکان بۆ جارێکی تر ئەرکێکی پێویستە چونکە کوتانەکە بریتیە لە بەرهەلست بنەڕەتی نەخۆشیەکەو سەرەڕای گرنگی دان بە تەندروستی منداڵ و خۆراکەکەی بە شێوەیەکی دروست . هاندانی دایکان بۆ ئەوەی زیاتر شیری مەمکیان بدەنە کۆرپەکانیان لە مانگەکانی یەکەمی تەمەنی منداڵەکەدا . کەدەبێتە هۆی زیاتربوونی بەرگری ئاسای لە لەشیاندا دژی نەخۆشیە درمەکان . هەروەها دەبێ پارێزگاری پاك و خاوێنی ئاوو خۆراك و جل و بەرگ و لەشی منداڵ بکرێت هەر لە سەرەتای ژیانیەوە بە شێوەیەکی بەردەوام . لەگەڵ قەلاچۆکردنی مێش و مەگەز . ئاموژگاری کردنی دایکان بۆ ئەوەی سەر لە نەخۆشخانە بدەن بۆ کوتانی منداڵەکانیان لە کات و تەمەنی گونجاودا و جیا کردنەوەی منداڵە نەخۆشەکە لە شوێنی تایبەتی بۆ پاراستنی منداڵەکانی‌تر لە تووش بوون . هەروەها بلاو کردنەوەی ڕۆشنبیری تەندروستی لە ڕادیۆو تەلەفزیون و دەزگاکانی تری ڕاگەیاندندا لە بارەی سودەکانی کوتان و ڕێگەکانی خێرا بلاوبوونەوەی نەخۆشیە درمەکان بەناو خەلکیدا و چۆنیەتی خۆپاراستن لێیان و تێگەیاندنی دانشتوان کە خۆپاراستن باشترە لە چارەکردن .. ئەویش بە وەرگرتنی پێکوتەکان ئەنجام دەدرێت دژی زۆر لە نەخۆشیە درمەکان لە سالانی یەکەم و دوەمی‌تەمەنی منداڵەکەدا .

**دوای بوونی منداڵەکە یەکسەر پێکوتەی** BCG دژی سیل ی دەدرێتێ . لە تەمەنی سێ مانگیدا پێکوتەی سێینەی (اللقاح الثلاثی) (کە بریتی‌یە لە دژی وەناق و کۆکە ڕەشەو دەردەکۆپان tetanus و پێکوتەی ئفلیجی منداڵانی یەکەمی دەدرێتێ ئەمەش دووبارە دەکرێتەوە هەر لە نێوانی ٤ ـ ٦ هەفتە وە بۆ سێ جار .
لە تەمەنی ١٨ مانگیدا پێکوتەی سێیانەی و ئفلیجی منداڵانی دەدرێتێ . هەروەها پێش چوونە باخچەی ساوایانەوە دەیدرێتێ بۆ بەهێزکردنی دووەمیان .
لە تەمەنی یەك ساڵی و بە دواترەوە پێکوتەی دژی هەرکام لە نەخۆشیەکانی سووریژە ، ملەخرێ ، ئاوولەو سووریژەی ئەلمانی ) دەدرێتێ .
بێگومان ئەو ڕێگایانەی کەبۆ خۆپاراستن باسکران دەبنە هۆی کەمتر بوونەوەی زۆر لە گیروگرفتە دەرونی و گیانی و بیریە کان و زیاتر گەشەکردنی منداڵەکە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و جوان و مرۆڤێکی تەواوی لێ دەردەچێت ..


**سەرچاوەکان :**

**١ـ گۆڤاری (الام والطفل)ژمارە ٣٨٧ ئاداری ١٩٧٩**

**٢ـ گۆڤاری ( الام والطفل ) ٣٨٦ شباطی ١٩٧٩**

**٣ـ صحة الطفل ـ الطبعة الرابعة . ١٩٨٠**

4— Paediatric NursiNG

bY — Margaret Duncombe & Barbara F. Weller 5 th edition 1980 . London

5— The merck manual ,

Edited by :— Robert Berkow, M.D

— JohnH. Talbott M.D

Thirteenth Edition — 1977 U.S.A

# پشیلە

جلال ملا حسن خۆشناو
هەولێر

دایكم دەیگێرِایەوەو دەی ووت :
سالی 1914 ز.كە جەنگی جیهانی یەكەم دەستی پێكرد ، گرانیو رِشانەوەش بلاوببوەوە جەندرمەی میری عوسمانی لە لایەكی ترەوە كەوتنە تالان كـردنو كۆكـردنەوەی ئـازوقە لە خـەلكی كوردستان .
دانشتوانی لادێو شارەكان لەبەر بـرسیەتیو رِشـانەوە وەك گەلای پایـزان هەل دەوەرانو تـەرمی مردوەكـان ئەمـانەوە نەدەشاردرانـەوە . درِندەكـان وەكو سـەگ ، پشیلە ، گورگ دەمیان لە كەلاكی ئادەمیزاد دەناو دەیان خوارد .
كە جەنگی جیهانی یەكەم كۆتایی هات گرانیو رِشانەوە نەما ، درِندەكان پەكیان كەوت ئیدی كەوتنە پەلامارو هێرش هێنان بۆ سەر مرۆڤی زیندو بەتایبەتی پشیلەی مالیو كێویەكان پەلاماری منالانیان دەداو دەیان خواردن بـەم بۆنـەیەوە بـەیتی پشیلە ووتراوە .

**تێبینی : -**

1 — بەیتی پشیلەو بەسەرهاتەكە ئەگەرِێتەوە بۆ سالی 1914 ز.وە لە زۆر ناوچەكانی كوردستان ئەم بەیتە باوەو هەلپەرِكێی لەبەر دەكرێت ، بەلام گۆرِانی بەسەر داهاتوە لە پشتێ بۆ پشتێ وە لە زاری بۆ زاری بەپێی شوێنو جێگا .
2 — دەقی بەیتی (پشیلە ) م لە زاری ( طە خارو هەرشتەبرِ ) تۆماركردوە لە شەقلاوە لە سالی 1972 ز.كە تەمەنی (60) سالە.

## بەیتی
## پشیلەی كوێستانێ

هەی هەی لەبەر كتكێ[1] شین
كەس نەوێراین لۆی بچین
لێ بوو بە كورگی دەو خین
ئەو جارەش لێك بوینەوە
بەناو یەك وەر بوینەوە
تاكو یەك ئەبرِینەوە
هاتن كتكێ كوێستانێ
وا ئەكەن جلیتانێ[2]
خراكەن خەلیفانێ
كتك هات لە دیوینی[3]
لە چاوان چ نابینی
رِووبوە سۆف یاسینی
هەریدا ناو پەرژینی
سرقانی پێ بچینی
ئەی هاوارو سەد هاوار

كتكێ شین با بێمە خوار
ئەم كردینە بەندەوار
ئەمی بەندەوار كردین
سەر كۆتو پێخواس كردین
حارێ خۆ كێوە بەرین
حارێ خۆ ببەینە زێتكێ[4]
بابێمە خواردیە كتكێ
جوابێ بدەنە عوزێرە
نۆ گای كردینە خێرە
خوایە كتك نێتە ئێرە
جوابێ بدەنە گولەكی[5]
لەبۆم بێنە ملەكی
تا لێی بگرن لایەكی
جوابێ بدەنە ئامۆكە[6]
بائێنە كوری سوكوكە
گوللەی تفەنگێو پەرِۆكە
كتكێ بكوژن ئەورِۆكە
زەین دەنە بەرازانێ[7]

رەش ئەكرێن وەك كارِانێ
هەردێن لەبەر دۆرانێ[8]
سەلیم ئەرێتە بەسێ
پیاو لە كتكان ناترسێ
بەس بكە پسە پسێ
كتك هاتن سێو دوو
یەك بە ئەستوندەی هەرچوو
دیتم بەنێشتی ئەجوو
سەلیم ئەرێتە فاتێ
زووم بگەینە قەراتێ[9]
لەشكری كتكانم گاتێ
ئەمبەن لەبۆ ئافاتێ
سەدەق لێ كارەساتێ
كتك هاتە یەكدەرێ
غاریدا كلكێ كەرێ
ئاشەوان لەبەر هەرێ
شەمو سوراحو رابی
كتك مارت خرابی

قەت لە شەڕی تێر نابی
شەمێ هەڵمەگرە خەمێ
بە تەبشوی غار ئەدەمێ
ئەستێنم خینێ شەمێ
هەمزە ئەرێ مەلایە
کتکان جێ مەڕوایە
خوێندنم لەبیر نەمایە
هەمزە ئەرێ هۆ مامە
بینن خەنجەرێ شامە
کتکت لۆ بکەم تەمامە
جوابێ بدەنە هەناری[10]
دار بەدەست بێنە خوارێ
کتکێ گرتیە بنارێ
جوابێ بدەنە باتاسێ
بەس بکەن پسە پسێ
کتك شێرەو ناترسێ
لەولای ڕاهات برایمە جوو
بەخۆو بە سوڵێ بەگوو
ئەویش لەوێ لەخۆ چوو
جوابێ بدەنە هەریرێ
لەبۆم بێنن زنجیرێ
کتك شێرەو ناگیرێ
چەند خەنجەرێ خۆشناوان
ناکرێن بە دراوان
نابڕن پێستی میاو میاوان
کتك هاتە مۆتراوێ[11]

پەڕیەوە لە پسەکاوێ[12]
گەیشتە ناو سیساوێ
ڕێککەت لەگەڵ هەتاوێ
سبەینێ بچیتە ناوێ
برێنە مستۆی کیژیلێ
شەڕ گەرمە لەگەڵ پشیلێ
میر کتك گەییە کانیلێ
برێنە مستە کەچەری
با بگری رێی چەقەری
نەهێری کتك تێ پەری
برێنە حوسێنی خەجێ
دەست بداتە دەمانچێ
کتکێ بکوژی جێ بەجێ
برێنە سوفی خدری
پلینگێ لە گەوەری[13]
ئەو کتکان چاك ئەگری
هاتیە مامە حەوێزە
پیاوێکی زۆر بەرێزە
زووی کوشت کتکێ دێزە
کتك هاتە شەقلاوێ
ڕێککەت لەگەڵ هەتاوێ
سبەی زوو بچیتە ناوێ
هاتی‌یە تەهای نەبی‌یە
لە پشیلەی راست هاتی‌یە
پەتکی لە ملی کردی‌یە
پشیلەی خنکاندی‌یە

---

فەرهەنگۆك

1 — کتك : پشیلە .
2 — جلیتانێ : مەشق‌کردن .
3 — دیوین : گوندێکە سەر بە ناوچەی سەلاحەدینە .
4 — زێتکێ : گوندێکە سەر بە ناوچەی مێرگەسۆرە .
5 — گولەك : گوندێکە سەر بە ناوچەی هەریرە .
6 — ئاموکە : ئاموکان : گوندێکە سەر بە ناوچەی هەریرە
7 — بەرازان : گوندێکە سەر بە ناوچەی هەریرە.
8 — دۆران : مەشکەی دۆ .
9 — قەرات : قەڵات .
10 — هەناری : گوندێك بوو سەر بە ناوچەی هەریر .
11 — مۆتراوە : گوندێکە سەر بە ناوچەی هەریر .
12 — پسەکاوە : (پیسەکاوە) بەو جۆگەلە ئاوە ئەڵێن
کە دەکەوێتە نێوانی گوندی
مۆتراوەو گوندی سیساوە .
13 — گەوەر : دەرز ، قەڵش ، کەلەنە شاخ

## مەندۆ

تۆمارکردنی
عباس عبدالله یوسف

مەندۆم کوڕێ پیرێ
دەستی دا سێ تیرێ
مەندۆ کورێ زێزێ
لەتفەنگێ‌کا تێزێ
باویا نێریا رێزێ
مەندۆم ناری ناری
وەکی ئەچیە شاری
چم لۆینی پەدیاری
بازنا تەگە گواری
نیریێ مەندۆم سێ‌نە
لە گەریا عاسێنە
راوکەریا لەرێنە
نێریێ مەندۆم چارن
لە گەریا ئەنارن

تێبینی
ئەم گۆرانیە لە گوندی (جۆنەلەی) ناوچەی سوور چیاتی تۆمار کراوە
فەرهەنگۆك
سێ‌تیر = جۆرە تفەنگێکی کۆنە
لەتفەنگێ‌کا = لە تفەنگی ئەکا . ئەم (ئـە) ی کاری رانەبردوو تێ‌دەسوێ
ئەکا تێزێ = ئامادەی دەکا بۆ تەقەکردن
زێزێ = ناوی ژنانە
باویا = بهاوێژە
ناری ناری = بەناڵە ناڵ
لۆینی = لۆ دێنی = بۆم دەهێنی
پە = بە
تەگە = لەگەڵ ، دەگەڵ
گەریا = گەلی ، دەربەند
ئەنارن = ئەناڵن

# بەڵگە

مەهابادقەرەداغی
کفری

ڕۆژگارەکان هەموو بوونە سرودێکی سووری بەڵگەو..
پێیان ووتم تۆ لە شەوەزەنگا مۆمی
یادگارەکان پەردەیان لە ڕوویان لادا
دەرکەوت کەوا تۆش هەر خۆمی...
کە کلافەی ناسۆرەکانم کردەوە
تۆ دەرکەوتی!
گۆرانی دڵ نەواییت بۆ دەوتمو..
چاوەکانت وای ئەگەیاند
هاوژانی ئازارو سۆمی
خۆشمئەوێی .. چونکە من تۆو ، تۆش هەر خۆمی

× × ×

بەڵگەم پێیە کە تۆ نەوەی مانگەو خۆری
چونکە ڕەگت
لە هی ڕەگی داربەڕووی بناری کێوە سەختەکانی ئەم
هەوارە پتەوترە

چونکە لە زریانی شەوا
پێڵوی چاوت لێکنانێیت .. و
دەستناگری بە گوێو دەمتەوە
چونکە ترس نەیتوانیوە بچێتە ناو پەرچەمتەوە

× . × . ×

تۆ ئەو سوارەی
کە بە شمشێری بێداری تاریکایی ڕاوئەنێی .. و
لە کەلێنی کێوی ووشەی شیعرەکانا خۆری هیوا
هەڵئەهێنی

ئەو بنارەی کە لووتکەکان لە باوەشت هەڵئەگریتو..
وەکو ساوا ئەیلاوێنیێ
ئەو دەریایەی بە ڕۆژ خۆرو
بە شەو مانگەو ئەستێرەکان ئەڕازێنی.

× × . ×

ئەو سیزیفەی..
لە زۆرداریو تاوان یاخیت
لە خوای مەرگەو لە ژان یاخیت
پەتی وورەت
گەردنی مەرگ ئەتاسێنێ
هەوری خۆزگەت
بارانێ ڕوون بە سەر وولاتی تاوانا ئەبارێنێ
ئەیشواتەوە
زرێبارە ووشکەکان پڕئەکاتەوە

× × ×

بەڵگەم پێیە .. ئەو سندبادەی، هەر ئەگەی
بە زێی ئاوات و مەبەستت
چونکە تۆ ئەو شۆرە سوارەی لە هەگبەتا
هیوا دوا ئامانج ئەدوێنێ
پەنجەکانت گوڵ ئەڕوێنێ
گوڵیش مژدەی بەهارێ گەش ئەبەخشێتە گوڵزارەکان
گوڵزایش خۆشترین بنیاتە بۆ ژیان

# لەبیرخۆمت ئەبەمەوە

ئازاد پێنجوێنی
سلێمانی / 1983

ئاخ ! دەستم بەدەستت ناگا
ئاگرێکت کردوتەوە
هێمن ، هێمن
لەتەمەنی لاویم ئەبا
چیت لێبکەم ..
بۆمن نابی ، خۆشم ئەوێی !

* * *

ئاگرێکت کردوتەوە
رێگام بکە ، هەر بۆتاوێ
لەتەنیشتا هەڵترووشکێم
شیعر .. گۆشتم
لێبکەرەوە !
ئەوئاگرەی ،
شیعرو گۆشتی منی هەبێ
دوایی‌نایە ، خامۆش نابێ !

* * *

ئاگرێکت کردوتەوە
رێگام بکە ، هەر بۆتاوێ
لەتەنیشتا هەڵترووشکێم
چاوەکانم چەند تالێ تیشك هەڵمژن و
پەنجەکانم
کەمێ گەرم ببنەوە !
ئاخ کچەکە تۆ نازانی
ئەو ووشانەی ،
ئابەم پەنجە تەزیوانە
بۆت ئەنووسرێن
ئارام ناگرن ... لەبن نایەن !

* * *

ئاگرێکت کردوتەوە
ئاخ ! دەستم بەدەستت ناگا
چیت لێبکەم ..
بۆمن نابی ، خۆشم ئەوێی !
ئاگرێکت کردوتەوە
چاوەڕێم تا ، خامۆش ئەبێ
« لەبیرخۆمت ئەبەمەوە ! »
عەشق تەنها ماندوو بوونە
عەشق هێلێکی تەریبە
« بویەك بوون » ە !!

# بویکا ژینێ

هاشم محمد ئەتروشی
ئەیلول 1978

کەفنە ئێشان نەلڤینە
پیسە هزران برەڤینە
ئەم بۆ خۆشیا پێدڤینە
بویکا ژینێ هەر ئەڤینە

* ● *

کەفنە ئێشن تاریا دلی
پیسە هزرن ژبەر سلی
تۆ ستری‌یان تۆ گولی
ئەو دوو رێنە تۆ بناقلی

# خاچ

●
سیروان حمید کوێی
کەرکووك
●

دڵدارەکەم
دڵنیابە یادت دەکەم ؛
یادت دەکەم وەك ئەو « خاچ » ەی
بۆ یەکەمجار ؛
لە شۆخێکی ئازیزو جوان
کرا بە کۆتی گەردنم .
دڵدارەکەم ؛ .
رق و کینە لە چاوانتا بەدی دەکەم .
نازدارە دڵ رفێنەکەم ؛
وات لێکردم ...
«خاچ» پەرستبم تا ئەو رۆژەی ؛
لەگەڵ تکەی هەر دڵۆپێك لە خوێنەکەم ..
لەبەر ئاوی سوێری «کانی» ی چاوەکانتا
دێرآو لێدەم ... دێراو لێدەم !!

# گفت

**ئەهائەحمەد جاف**
**سلەیمانی**

بەپەلە بوویت .. خۆت ئامادە کردبووو ئاراستەت بەرەو رووی کشا .. دیسانەوە چوویتەوە پاڵی و سەرنجت لێدایەوە ، زۆرت پێخۆش بوو لەتەکیا دانیشی و گوێتی بۆهەڵخەی .. چوار میشقی دانیشتی و نقەت لەخۆت بری .. چاوەکانت ئاراستەی کشان هەروەکو ئەستێرە یەکی گەڕۆك ، لەگەڵ دەستەکانیدا دەجووڵایەوە ، دیسانەوە لەگەڵیدا دەخولایەوە ، خوریەکەی نایە تەنیشتی و دەستی پیاهێنا .. کردنیە پارچەیەکی دریـژ ، سـەری پارچـەکەی دەهێنـاو بەقـولابی سەر تـەشی یەکـەی گیرکرد .. دووسێ جار ڕاي کێشاو لەبەرخۆیەوە دەیوت :

- ئا .. زۆر باشە ناپچرێت .. خوری یـەکی چاکـە ئای کـە مەڕێکی باش بـوو .. سپی و سوّل .... دای لەڕانی و یـەك .. دوو .. سێ .. چوار هەندلی پێدا تەشی کەوتە هەواوەو دەستی ئـاراستەی دەبـوّوە ، وەڵلا خولایـەوە .. دەڵێی پانکـەیەکی دەستکردە ، هەرلەپـانکەی بنمیچی خـانوەکـەتان دەچێ ، جارێکی کە دەستی پیاهێنایەوەو کردی یە دەم هەواوە تـوێش چاوەکانت لەگەڵ تەشی یەکەدا دەخـولانەوە ، گێـژ بوویت .. دەڵێی مزراحی مندالانە ، بەلام کلکەکەی گەورەترە ، ووردە - ووردە خوریەکەی کێش دەکردو دەیدایەبەری ، لەنێو پەنجە باریك و چرچەکانیدا وەکومار ئـالێندرابـوو ، دەی ڕۆیشت .. خوری دەڵێی موگناتیسەو سەری تەشی یەکە بـەرنادا ، ئـەم سەفەرەیان زۆر خولایەوە نەتدەویرا تێی بروانی « مرۆڤ گێژ ئەکات ، ئەی دایە گەورە چۆن گێژنابێ ؟ ... نەوەرزبوون ... نە ....... » ئەم قسەیەت لەژێر لێوەوە درکاندو نـەت هێشت کەس درکی پێبکا ، ئاوەڵلا نقومت کرد .. وەرزنەبوو جارێکی دیکە دەستی پێکردەوە لەپڕ پسا تەشی کەوتە سەرزەوی یەکەو ڕۆچـوو ، بەبێ ئـامێر مـایەوە ، دەستێکی دریـژ کـردو مـلی تەشیەکەی گرتەوە ، نەوەڵلا ئەم سەفەرەیان گرێیەکی زۆر توندی لێدا ، توند ... بەبێ پچران ، ئای کەبەئارەزوو بوو ، خوری تادەهات کەم دەبوّوە ، دەبوونە پەتێکی پتـەو ، خولی پێـدایەوە وخـوری یەکـە ڕوّی ، بوّی سـەرکەوت و دەستیشی وەدووی خست ، خوری لەدەستەکانیدا خـڕ بۆوە ، دریـژی کردنەوە ، جارجارەیش پەنجەی بـەتف سواخ ئـەداو ئەیـدا لەخوری یەکە ، جارێکی کە .. ڕوّی بوونە پەتێکی زۆر ، ئەنجا نۆرەی تۆپە پەتەکەیە وەکو بەکرە هـەڵیان کـاتەوە ، گـرێشی جارجارە تێ دەکەوت ....

دەی کەیتەوە لفکە ؟

- بۆ ئایشێ خانە

- کام ئایشێ خان ؟ هەزار ئایشێ هەیـە ، وەنیە .. - ئـایشێی دراوسێمان .. هەیهوو .. چەنەبازی ...

- هەر پێی دەفرۆشی بە سەد فلس .

- نەخەیر ... ئەمەیان خوری مەڕەکەمانـە کەدوێنێ بـەیانی سەرمان بری .. دەی دەمێ بە سێ پەنجایی ، ئای کەخوریەکی پاك و جوانە ، ماشائەڵلا ... لەجوانی ، لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەووت ، دڵی خـۆش بـوو ، هیـچ ڕۆژێ خـوری وای دەست ناکەوێتەوە ، لە کیس خۆی ناداو خۆیشی بەهیچەوە خەریك ناکا دەنگتـان لێبرا ... دەورووبـەرتان هێمن بـوو .. داپیـرەیشت وەرزنەبووە ، خەریکی کاری خـۆیەتی و خـۆی دەزانێ چۆنی بەڕێوە ببات .. ئازایە بەخوا ... قەوانەکەی لێدایەوە ، دەستی خستەوە سەر تەشی و خولی پێدا .. ڕستی زۆر .. زۆر ، بوونە پەت و گرموّلە بوونەوە ، کاتێکت زانی خوری تەواو ، هەمووی تەواو ، « ئۆخـەی واتەواو بـو ، ئۆخـەی ، ئیتر دایـەگەورە چیرۆکەکەم بۆدەگێڕێتەوە »

- دایەگەورە چیرۆکەکەم بۆدەگێڕیەوە ؟

- چیرۆکی چی ؟ .... ها ....

- ئەی گفتت نەدامێ بۆم بگێڕیەوە ؟

- ڕاست ئەکەی بەلام باتەواوبم ..

- ئـەی تەواو نـەبـوویت ؟ گفتت پێدام .. گفت .. داپیـرەت ڕۆیشتـە ژوورەوەو خوری تـری هێنـا ، دیسـانـەوە دەستی پێکـردەوە .. ڕستی ..... تـوّش کـەچـاووت بـەمـەکـەوت وەرزبوویت ، واقت ورماو داپیرەش گفتەکەی نەبـردەسەر ، گێژبوویت .. گێژ ...... بوو ....... یت .




**کاراکتەرەکان**

**١ـ خانزاد**
**٢ـ لەشکری**
**٣ـ خانزادی سۆران**
**٤ـ بازرگان**
**٥ـ کابرا**

(ژوورێکی نووستن، بەلام دەبێ کەل‌و پەلەکان بەشێوازێکی خەوناوی دابنرێن . رووناکی‌یەکی ئەندێشەیی .... مۆسیقایەکی رۆمانسی، کات، دەوروبەری نیوەی شەوە خانزاد لەسەر قەریوڵەکەیدا پاڵکەوتووە دەخوێنێ ... جاروبار تەماشای کات ژمێرەکەی دیوار دەکا ....
میلی کاتژمێر لە دوانزە نزیک دەبێتەوە، خانزاد گورج دەبێ زەنگی دوانزە، خانزاد هەلدەستێ دەچێتە بەرامبەر ئاوێنەو خۆی دەرازێنێتەوە ....)

خانزاد: (کچێکی جوان‌و تەمەنی بیست ساڵەیە . دیژداشەیەکی رەش‌و تەنکی بەتام‌و بۆی لەبەردایە زۆر بەپەلەو شێواوی رەفتار دەکا ... نازانرێ) (لەترسانە یا لە شەرم‌و کەیفان .) نەء هەردێ ... ئەمجارە هەردێ ... دلنیام (بەتوندی) لەشکری .. ((بەهێمنی)) ئەوە بووە سێ شەو .... سێ‌شەوە بڕیارە بێت . ئەگەر ئەمجارە نەهاتی ، بەتوندی، خۆم دەزانم چی دەکەم ، بۆن لە خۆی دەدا ، سەیرە دەڵێی لێم دەترسێ ... یا هەستێکی کردووە .. ((گۆرانیەکی کوردی رۆمانسی دەخاتە سەر ریکۆردەر تەپەیەك دێ .

بەپەلە دەرگا دەکاتەوە، نامراز دەبێ تەپەیەکی‌تر .... دەچێتە لای پەنجەرەکە دەگەشێتەوە بەدەست داوای هاتنە ژوورەوە لەیەکێك دەکا . بەهێما گفتوگۆ دەکەن))
دەرگا داخراوە !
،بەگورجی لە شتێ دەگەڕێ، دەستە کلیلێك دەدۆزێتەوە دەچێتەوە لای پەنجەرەکەو کلیلەکە داوێتە خوارەوە، چەرچەفی قەریوڵەکە رێك دەکا بەرگی بالیفەکە چاك دەکاو لەپڕ دەمانچەیەك دەکەوێتە خوارەوە، خێرا دایدەنێتەوە نێو بەرگی بالیفەکە دەچێتە بەردەم ئاوێنە)) خۆ هات .

**لەشکری** ((لەبەر دەرگا دەوەستێ . گەنجێکی ئاساییە، بەخەندەیەکی بێ‌گەرد دەڕوانیتە خانزاد)) خانزاد

**خانزاد** ((بەنازێکی بەسامەوە)) ئەوەبووە سێ شەوە! سێ‌شەوە چاوەڕوانم !؟

**لەشکری** ((لێی دەچێتە پێش ... دەچەمێتەوە)) ببوورە گیانەکەم ، بێ‌دەنگ، خاتوو خانزاد، دلنیایی کە من تاڕادەی مردن خۆشم دەوێی . ((بێ‌دەنگی)) دلنیای ....

**خانزاد** ((دەچێتە پشت لەشکری بیر دەکاتەوە)) دڵنیام

**لەشکری** ((خێرا هەڵدەستێتەوە)) واتە ببووره خاتوونەکەم .

**خانزاد** ((دەرگا قفل دەداو پەنجەرەکەش جوان دادەخا .. بەخەندەیەکی دڵی لەشکری دەداتەوە ... دەچێتە سەر قەریوڵەکە . )) دانیشە .

**لەشکری** ، بەپەلە لەسەر کورسیەکە دادەنیشێ . بەشەرم‌و ڕیزەوە، خاتوونەکەم ... دەزانم چەند تاوانبارم دەرحەق

بەڕێزت بەلام بڕوا بكە گوناهبار نیم ... ئەوەی ڕووی داوە یا ڕوودەدا هیچ لەڕادەی توانای من نین . كارەساتەكە نازانم چۆن بوو، لەبەرچی ڕوویدا !؟ هەر ئەوەندە دەزانم قەوما .... ئیتر وەكو خەون ... نازانم نەفرەتی ئاسمان بوو ... یارق و كینەی شەیتان !؟

گەورەم ئەم كارەساتە ناهەموارە گشت تواناو دەستەلاتی لێ سەندووم . چەك و هێزم ئیفلیج بوون من ئێستا لە مەیدانی جوامێری دلداری تۆ دابێ گومان دۆڕاوێكی كۆسكەوتووم من لە پێناو گرەو بردنەوەی نێرگزی لاویەتیم تەنیا تاكە هیوایەكم ماوە ... ئەویش نازانم تا چ ڕادەیەك لای بەڕێزت بایەخی هەیە،

خانزاد ـ ((بێ دەنگی . بایەخ پێدان)) ئەم تاكە هیوایەت چی یە؟ لەشكری ـ دڵم .

**خانزاد** (( بەقاقایەكی سەیر)) دڵ ... دڵ (( بەتاوانبار كردن ))
ئەوەی دڵی هەبێ دلان لە خورپەڕا ناگرێ ئەوەی ویژدانی هەبێ ڕاستیان نانێژی ... ئەوەی مرۆڤایەتی هەبێ هەلویستی دڕندانە نانوێنێ؟

**لەشكری** ((دەتوێتەوە)) خاتو خانزاد ... گەورەم ... بەقوربان دڵنیابە گیانەكەم .. من .. ببوورە، بمبوورە .. بمكوژە .

**خانزاد**( ( بێ دەنگ)) تو ئازایت .

**لەشكری** «دەگەشێتەوە » سوپاست دەكەم .

**خانزاد** بەلام دڕندەی

**لەشكری** خاتوون

**خانزاد** تۆ منت خۆش دەوێ .

**لەشكری** گیانم لە پێناو تایە .

**خانزاد** بەلام زڕقت لە كاكمە

**لەشكری** درۆیە

**خانزاد** بەكوشتنت دا

**خانزاد** پەرداخی ژەهرەكە بویت؟

**لەشكری** درۆیە، درۆیە . « وەكوشێت، خوای گەورە ڕاستی، داد . بۆكەس قسەیەك ناكا ... داد ... داد .. ئەوەی گوناهبارە بێ تاوانە ... ئەوەی بێ گوناهە تاوانبارە ... داد خودای گەورە، داد ڕاستی داد . «بێدەنگی» ئەوانەی دڵنیان بێ گوناهم لالن . ئەوانەی تاوانبارم دەكەن هارن . خودای گەورە، ڕاستی داد ... داد «بەكول دەگریت»

**خانزاد** « بێ دەنگی بەخەندەیەكی سەركەوتن، تائەو ڕادەیە منت خۆش دەوێ!

**لەشكری** « بەسەر وەلامی دەداتەوە» .

**خانزاد** حەز دەكەم گوێت لێ ڕاگرم .

**لەشكری** « بەدوڕاوی » چی بلێم

**خانزاد** باسی جوانی و شۆخی و ... دلداریم بكە ...

**لەشكری** « هەڵ دەستێ . ناتوانێ تەماشای خانزاد بكا» ...

**خانزاد** ناتوانێ سەیرە . چۆن دلداریكی؟

**لەشكری** « قەرەوێتەكەی شل دەكاتەوە» ئەو كاتەی توانای سەربەرزی و دلداریم هەبوو نەتگەبیشتمێ ئێستاش لەژێر قورسایی تاوان و سەر شۆڕی چ باسی دلداری بكەم هەر شورەیە

**خانزاد** « بەدڵنیای» لەشكری تۆ منت خۆش دەوێ .

**لەشكری** بەچی دەچێ .

**خانزاد** بارابردو بنێژین . كای كۆن بەبا نەكەین .

**لەشكری** «وشیار دەبێتەوە» گیان؟

**خانزاد** خۆشمت دەوێ؟

**لەشكری** دەتپەرستم

**خانزاد** ئەی مـــن؟

**لەشكری** نازانم .

**خانزاد** واتە خۆشمت دەوێت بێ ئەوەی ڕای من بزانی .

**لەشكری** بەلێ .

**خانزاد** تاقیمت كرد بووەوە، لە نزیكەوە، ناسیبومت لەكەست پرسی بوو ئاخۆ من تۆم دەوێ یان نا !؟

**لەشكری** نەخێر

**خانزاد** هەرئاوا، ڕەمەكی ...

**لەشكری** نەخێر

**خانزاد** هەرئاوا، ڕەمەكی ...

**لەشكری** بەدەست خۆم نیە .

**خانزاد** « بەهێمنی» بەلام من واناكەم وەكو هەموو كیژێكی هاوچەرخ تاقیت دەكەمەوە .

**لەشكری** « دەگەشێتەوە» تاقیم دەكەیەوە !؟

**خانزاد** گشت لقەكانی سایكۆلۆژی و زانستی كۆمەلایەتیت لێ بەكار دێنم .

**لەشكری** مافی خۆتە . « ئازایانە» ئەوە من و ئەوە مەیدان .

**خانزاد** تاقی كردنەوەی یەكەم .

**لەشکری** ئامادەم .

**خانزاد** ئەو کورسیەبێنە

**لەشکری** « کورسیەکە دێنی ، فەرموو .

**خانزاد** لە سەر ئەم کورسیە دانیشە .

**لەشکری** گیانەکەمی . « لەسەر کورسیەکە وەك قوتابی دادەنیشێ »

**خانزاد** « دەستەکانی لەشکری داوێتە پشت کورسیەکە وتوند دەیانبەستێ ، پاشان لەهەمان شێوە پێیەکانیشی » ئێستا خۆت رزگارکە .

**لەشکری** « پاش هەوڵ دانێکی زۆر » ناتوانم .. « بێ دەنگی » ئەگەر تاقی کردنەوە تەواو بمکەرەوە .

**خانزاد** نەخێر . « بالیفەکە هەڵدەگرێ ، دەمانچەکە دەردێنێ » تاقی کردنەوەی دووەم .

**لەشکری** « بەتەوسەوە » چی دەکەی ؟

**خانزاد** دەتکوژم .

**لەشکری** چی !؟

**خانزاد** هەی ناپاك ، سپڵە بێ ئەمەك ، درندە ئەوەی دڵداری بکا رق و کینە هەڵدەگرێ ؟

**لەشکری** درۆیە .

**خانزاد** چۆن مرۆڤ دەکوژێ ؟

**لەشکری** درۆیە

**خانزاد** چۆن بەکوشتن دەدا . ؟

**لەشکری** درۆیە

**خانزاد** چۆن دەبێتە پەرداخی زەهر ؟

**لەشکری** درۆیە ... درۆیە .

**خانزاد** « بەهێنی » ووس . تەنیا مافێکت دەدەمێ .

**لەشکری** ماف ؟!

**خانزاد** بەچاوت وەنێم ، یاگوێت ، یاسەری دڵت ...؟ . هەرچەندە من دڵەکەم پێ باشە لەبەر دوو هۆ .. یەکەم تادڵە بەردینەکەت نەختێ بەگوللە نەرم کەمەوە . دووەم .. تاخێرا رزگار بێت ..

**لەشکری** « بێ دەنگی .. ئازایانە » واتە بڕوات پێ نەکردم .

**خانزاد** هەرگیز .

**لەشکری** واتە !؟

**خانزاد** کام شوێن ؟

**لەشکری** ئارەزووی خۆتە .

**خانزاد** خۆت سەر پشك بە .

**لەشکری** بڕوام پێ ناکەی . بڵێم چاو دەڵێ ی گوێ . بڵێم گوێ دەڵێ ی دل

**خانزاد** دوا قسەت ؟

**لەشکری** خۆشم دەوێ ی .

**خانزاد** دەتکوژم ؟

**لەشکری** دەتپەرستم

**خانزاد** « بێ دەنگی . دەمانچەکە سواردەکا . نیشانە لە دلی لەشکری دەگرێ . هەست رادەگرێ . » دەڵێ بانگیان کردم !؟ « دیسانەکە نیشان دەگرێ »

**دەنگ** « دەنگێکی ئافرەتانەی تەلیسماوی » خانزاد ...

**خانزاد** « خانزاد رادەچەنی ... لەشکری هەرگیز ئاگادار نابێ » کێ یە ؟

**دەنگ** خانزاد ... وەك من مەکە ... وەك منت لێ دێ ..

**خانزاد** تۆکێ ی ؟

**دەنگ** خانزاد

**خانزاد** خانزاد !؟ «بەزۆر هۆش دەهێنێتەوە بەرخۆی» دیارە زیندە خەوە «بێ دەنگی ... دەچێتەوە گژ لەشکری » ئامادەیە .

**دەنگ** وەك من مەکە خانزاد ، وەك منت لێ دێ .

**خانزاد** «دەشێوێ» تۆ چی ؟ خەونی راستی ، لەکوێ ی ؟

**دەنگ** ئەوەتەم « بەشێوازێکی خەوناوی دیار دەکەوێ »

**خانزاد** خانزادی سۆران

**دەنگ** بەلێ خانزاد ، خوشکە بچکۆلەکەم ، پێت دەڵێم وەك من مەکە وەك منت لێ دێ .

**خانزاد** تۆ ، تو خانزادی سۆران !؟ نا ، ناشێ ئەمە زیندە خەونە ، جادووە ، خەونە ... تۆ فریشتەی ؟!

**دەنگ** چۆنی تێدەکەی باوابێ .. بەلام وەك من مەکە ...

**خانزاد** « بێ دەنگی . لێ ی نزیك دەبێتەوە ، چاك تێڕا دەمێنێ » « بێ دەنگی . لێ ی نزیك دەبێتەوە ، چاك تێرا دەمێنێ » «دەستی بۆ درێژ دەکا بەلام خێرا پەشیمان دەبێتەوە» خانزادی سۆران !؟

«دەگەشێتەوە لەگەڵ مۆسیقایەکی تایبەتی سەما دەکا ، خانزادی سۆران .. «دەوەستێ ... بەرێزو جۆش و تاسەوە» خاتو خانزادی بەرێز ... ئەی مایەی پاکی و شانازی ئافرەتی کورد ئەی هیوای جوامێریو سوارچاکانی رابوردووی

هەمیشەیی ...
ئەی ئومێدی دلە نائومێدەکەی لەشکری ...
**دەنگ** «دەشێوێ، بەناڵەو ئازار هاوار دەکا» لەشکری ...
لەشکری .. ئۆهـ .. ئاخ لەشکری ... بمبورە .. بمبورە
لەشکری .
**لەشکری** نانا ... درۆیە، درۆیە، من بێگوناهم . بوختانە،
خانزاد ... بوختانە ئەوان بوون . من بێگوناهم .. نانا
مەمکوژەخانزاد .. مەمکوژە راستیت پێ بلێم ... ئینجا ...
بەمن گوێم لێ راگرە ._ . ئینجا ...
**دەنگ** «بەتوورەیی» هەی ناپاکی نەفرەت لێکراو .
زەندیق چون بڕوا بەخوێنەناسێکی وەك تۆ بکەم! لێدەن
بەقامچی ... گازەکەکەم بدەنێ باشیمرۆش هێندێکی تر گۆشتی
لێبکەمەوە ._
**لەشکری** «بەهاوارو فیغان، ئەیهاوار... خودای گەورە داد ...
راستی داد خەڵکینە داد ... بڕوا بکەن بوختانە ... داد
**خانزاد** لەگەڵ دوا هاتنی فیغان لەشکری گوێمان لەگریانی
خانزادی سۆران دەبێ»
خاتوونەکەم خوشکی گەورەمان ... بەسکە ...قوربان ...
خانزادی مەزن .
**دەنگ** «بێدەنگی» وەك من مەکە ... وەك منت لێ دێ ...
**خانزاد** «بێدەنگی» بەلام ... بەلام قوربان تۆ ... تۆڵەی خۆت
کردەوە .. سزای ناپاکێکت داوە ...
**دەنگ** ناخوشکە بچکۆلەکەم ... سەهو بووم ... زۆر
پەشیمانم ... بۆیە ... بۆیە ... هەمان گوناهی من دووبارە
مەکەوە ... پاشان وەك منت لێدێ ...
**خانزاد** خاتوونی مەزن تۆ .. تۆ بوویتە میر ... میری سۆران
**دەنگ** «بەتوندی» بوومەمیر ... بەلام میرێکی بێ دڵ، میرێکی
ناشاد، میرێکی بێ ئوجاغ ... بەدەستی خۆم نێرگزی لاویەتیم
هەڵوەراند . بەئارەزووی خۆم ئوجاغی خۆم ویران کرد .
بەچەکوشو تەوری دەستی خۆم بیناغەی میرایەتیم
هەڵوەشاند ...
**خانزاد** بەلام لەشکری ناپاك بوو ...
**دەنگ** چۆنت زانی؟
**خانزاد** خەڵك وادەڵێن! .
**دەنگ** خەڵك!؟ قسە بکەوێتە زارێ دەکەوێتە شارێ . لەهەموو
خەڵکت پرسی؟
**خانزاد** پێویست ناکا ... دڵنیام .
**دەنگ** سەهووی، خوشکە ناسکۆلەکەم سەهووی . وەك من
مەکە، کێ لەگەڵ کاکتدا چوو بوو؟
**خانزاد** لەشکری و کابرایەکی تر .
**دەنگ** کابرا گوتی لەشکری گوناهبارە؟
**خانزاد** بەلێ
**دەنگ** بڕوات پێکرد ؟
**خانزاد** بەلێ
**دەنگ** ئەی بە لەشکری
**خانزاد** نەخێر .
**دەنگ** باشە ئەو کابرایە لەکوێیە؟
**خانزاد** خاتوونی مەزن ... ئەم پرسیارە بۆ دەکەی؟
**دەنگ** بەرامبەر بەلەشکری دای بگرە .
**خانزاد** «بێدەنگی» ناتوانم .
**دەنگ** بۆ؟
**خانزاد** کابرا گیراوە ...
**دەنگ** لەبەرچی؟
**خانزاد** لەبەر ... «دەشێوێ» لەبەرئەوەی دز ... دزی کردبوو
**دەنگ** هەمان کارەساتەکەی من ... مخابن ... خوشکە
ناسکۆلەکەم مخابن . پاش ئەم هەموو سەدەیە، هەتا لەم
چەرخەشدا هەمان چەوتی دووپات دەکرێتەوە ...
**خانزاد** چەوتی !؟
**دەنگ** «بەتوندی» چۆن بەقسەی دزێك لەشکری تاوانبار
دەکەی؟!
**خانزاد** بەلام
**دەنگ** ئەوەی چەوتیەکانی رابوردووی بێ راست نەکرێتەوە
سەری لەراستیەکانی ئایندە دەشێوێ .
**خانزاد** خاتوونی مەزن ..
**دەنگ** تووك ... تووك و نەفرەت لەو دزانە .. تووك .. تووك و
نەفرەتیش لەوانەی بڕوایان پێ دەکەن ..
**خانزاد** خاتوونی مەزن
**دەنگ** «بەئازار» داد خودای گەورە داد .. راستی داد ...
**خانزاد** بەقوربان
**دەنگ** هەتا لەو چەرخەش، لەو چەرخەشدا !؟ داد خەڵکینە

داد .

**خانزاد** بەلام من، بەقوربان خاتونی مەزن .

**دەنگ** لەلەشکری بپرسن .. دەرمانی دەرد لای ئەوە ..ئەوەی ژیانی دەویٚ لەلەشکری مردوو بپرسیٚ ... ئەوەی وەلامی دەویٚ لەلەشکری بیٚ زمان بپرسیٚ ... داد ڕابوردوو داد ... ئاییندە داد ... خودای گەورە، ڕاستی، خەلکینە، داد .. داد ..

**خانزاد** « مۆسیقا . ڕوناکی بەهیٚمنی دەخریٚتە سەر خانزاد بەشیٚوەیەك بینەر هەست ناکا کەی خانزادی سوڕان وون دەبیٚ .

بەشیٚواوی» داد ... داد خەلکینە .. ڕاستی ..خودای گەورە ... ئاییندە ... ڕابوردو داد ... داد ... ئەوەی وەلامی دەویٚ لەلەشکری بیٚ زمان بپرسیٚ ... ئەوەی دادی دەویٚ لەلەشکری بیٚ داد بپرسیٚ ئەوەی ژیانی دەویٚ لەلەشکری مردوو بپرسی ... دەرمانی دەرد لای ئەوە ... لەشکری مردوو ؟! « ڕادەچەنیٚ » بەلام لەشکری من زیندووە « دەگە شیٚتەوە . لەلە شکری نزیك دەبیٚتەوە .

بەتوندی» لەشکری

**لەشکری** تاقی کردنەوەی سیٚیەم .

**خانزاد** بەلیٚ

**لەشکری** فەرموو

**خانزاد** کارەساتەکەم بۆ بگیٚرەوە .

**لەشکری** بەدەست بەستراوی؟

**خانزاد** « بەتوندی» بگیٚرەوە .

**لەشکری** بەلیٚ خاتوونی مەزن « بیٚ دەنگی» کاکت و من و کابرا چووینە لای بازرگانی مەڕو مانگا .

**خانزاد** «لەگەڵ دووربوو نەوەی لەلەشکری ڕووناکیەکەش لەگەڵ خۆی دەبا لەشکری دەکەویٚتە تاریکی» بازرگانی مەڕو مانگا .. تەواوی کە ...

**لەشکری** «خۆی دیارنیە» پاش گفتو گۆو ئالوگۆر کردن کاکت گەڕایەوە ئوتیٚل ... کەچی بازرگان من و کابرای لای خۆی هیٚشتەوە ... پیٚم گوت جەناب پیٚویستە منیش لەگەڵیا بڕۆم ... بەم بازرگان سووربوو

**بازرگان** «ڕوناکی دەکەویٚتە سەر بازرگان و لەشکری و کابرا» ئانیٚوە میوانی منن ... باسی سلیمانم بۆ بکە . بازرگانیٚکی چۆنە ... دەست پاکە .. سەرکەوتووە ؟

**لەشکری** گەورەم لەوەتی من لەو جۆرەبابەتانەیش دەکەم . لەکاك سلیمانم دلسۆزتر نەدیوە .. ڕاستگۆ ، خۆشەویست ... داد پەروەر چۆن ئارەزوو دەکەی ئاوا باشە .

**بازرگان** بەلام ئەوە « مەبەستی کابرایە » وانالیٚ

**لەشکری** ڕای خۆیەتی

**بازرگان** هە ... باشە ئەگەر دەگەڕیٚنەوە ئوتیٚل فەرموون .

**لەشکری** سوپاست دەکەم .

**بازرگانی** خوات لەگەڵ «لەشکری دەڕوا» ئیٚ ی .. ئەوقسانەی لەشکری چۆنن؟

**کابرا** قوربان ڕای خۆیەتی .

**بازرگان** وانە پەشیمان نیت ... دلنیای؟

**کابرا** بەلیٚ قوربان

**بازرگان** «بیٚ دەنگی» کەواتە دەبیٚ بکوژریٚ .

**کابرا** چی، ئەی ئیٚمە، من !؟

**بازرگان** تۆ «بیٚ دەنگی» پەرداخیٚك ژەهری دەرخواردده .

**کابرا** مـن

**بازرگان** کە گەڕایتەوەش، وا بلاوکەوە کە لەشکری گوناهبارە .

**کابرا** بەلام قوربان ... من ... چۆن ؟!

**بازرگان** «جانتایەکی» دەداتیٚ خوات لەگەل .

**خانزاد** «ڕووناکی تەنیا لەسەر خانزادە» خودای گەورە داد ... ڕاستی ـ خەلکینە داد ... ئەوەی چەوتیەکانی ڕابوردووی بیٚ ڕاست نەکریٚتەوە سەری لەڕاستیەکانی ئایندە دەشیٚویٚ .. «بیٚ دەنگی» لەشکری .

**لەشکری** «دەکەویٚتەوەبەر ڕووناکی» تاقیکردنەوەی چوارەم

**خانزاد** دووشتەکەت هیٚناون .

**لەشکری** بەلیٚ .

**خانزاد** بیدە

**لەشکری** بەدەست بەستراوی

**خانزاد** ڕاست دەکەی «موسیقایەکی دلڕفیٚن دەست وپیٚی لەشکری دەکاتەوە .. لەشکری دەگەشیٚتەوە ... بەهەوەس تەماشای یەکتر دەکەن . لەشکری ... دوو ئەنگوستیلە دەردیٚنیٚ ... یەکیٚکیان دەداتە خانزاد . خانزاد بەشەرمو دلشادی هەریەکەو ئەنگوستیلەکەی خۆی لەپەنجەی ڕاستی ئەوی‌تر دەکا مۆسیقایەکی زەماوەندانە . »

نووسینی : لۆناچارسکی
وەرگێرانی : یاسین قادر بەرزنجی

# گانێ یافۆڕا

**کاراکتەرەکان :**

**ناپلیۆن مالاپارتە « گیان هێنەرەوە »**
**برۆسپێر دۆراندۆ « بازرگانی پەنیرو ماست »**
**نیتۆش برالینە « گۆرانی بێژی ئۆپرایە »**

● ● ●

[ شوێن : ستۆدیۆی گیان هێنانەوەی ناپلیۆن مـالاپارتـەیە ، لەلای راستەوە کورسیو مێـزێکی نووسینـەوەی لێیەو سـەر مێزەکە هەندێ پەرەکاغەزو لەمپایەکی لێ دانراوەو شووشەی لەمپاکە رەنگاورەنگەو گڵۆپەکەی داگیرساوە ، لەولای مێزەکەوە گـرامێك دانـراوەو تیشکێ ئـاراستـەی گـرامـەکـە کـرواە ، لەنـاوەراستا کـورسییـەکی گـەورە دانـراوەو لەپشتییـەوە پەردەیەکی رەش شۆڕ بووەتەوە کە لەجێگـای خۆشـاردنەوە ئەچێ ، لای چەپی شانۆکەش عەلاگەیەکی جـل هەڵواسـینو کورسیو تەپلەکێکی لێیە ، ناپلیۆن کابرایەکی بالابەرزی پەنجا ساڵەیەو پەنجەکانی دەستی درێژدرێژن ، سەرو ریشێکی زۆری هێشتوەتەوە .. بەژوورەکەدا دێتو دەچێو زوو دەست بەقژو ریشیا ئەهێنێ .. جارجار بەهێمنییەوە سـەیرێکی سـەعاتی هەڵواسراوی قەد دیواری ناوەراستی ژوورەکەی ئەکات ... ] .

**ناپلیۆن** : نەهات ... نەهات ... ئەوکچە مەلعوونە دواکەوت .. واسەعات یانزەو نیوە ، تۆزێکی تر کابرا دێتو منیش ناچارم هەمووشتێك دوابخەم ، [ زەنگ لێ ئەدرێ ] زەنگـە .. دیارە خـۆیەتی .. ئـا ، ئەوە .. ئـەوەتـا بەپاژنەی پێڵاوەکانی لەدەرگاکە ئەدات .. [ بەپەلە بەرەو دەرگاکە ئەچێت ] بەڵێ .. بەڵێ .. واهات ...

[ دەرگاکە ئـەکاتـەوە ] فەرمـوو .. فەرمـوو وەرە ژوورەوە .. [ بـەخێـرایی نیتـۆش بـرالینـە دێتـە ژووری ، کچێکی جوانەو زیاتر لەئەکتەر ئەچێت ] ..

**نیتۆش** : وابزانم دواشکەوتم ..

**ناپلیۆن** : بەڵێ خانم ، زۆر دواکەوتی ، ئائەمە ماقووڵنییە ! ئەبێ پەلەبکەین .. دەی خێرا وەرە ئێرە .

**نیتۆش** : [ لەسەر کورسییەکی نزیك مێزەکە دائـەنیشێت .. ئـاوێنـەیـەکی بچکۆلە لە جـانتـاکـەی دەستی دەرئەهێنێو دەست ئەکاتە ئـارایشت کردنی دەمو چاوی .. ] مەسەلە چییە ؟ نـامەکـەت سەرنجی راکێشام .. دیارەشتێکی گرنگ لەئارادایە ! ...

**ناپلیۆن** : ووس .. بێدەنگبە ... سەیری ئەم وێنە بچکۆلەیە بکە .. [ وێنەکەی ئەداتە دەست ] ..

**نیتـۆش** : لەئـافـرەتێکی سیسـالان ئـەچێ .. جـوانـە .. مەسەلەچییە ؟

**ناپلیۆن** : ئەمخانمە بەرلە چـوارساڵ مـردووە ... زۆرگەرام بەشوێن یەکێکدا لەمبچێ ..

**نیتۆش** : ئێ ...

**نیتۆش** : ئەوە بوو دواجار دۆزیمەوە ..

**نتیۆش** : من ؟!

**ناپلیۆن** : ئا ، تۆ ..

**نیتۆش** : گاڵتەم بەقسەکەت دێ .. ئەمە کەی لەمن ئەچێ .. من جوانترو منداڵترم و گەلێك زیاتریش خوێنم شیرینترە

**ناپلیۆن** : ئەمە زۆرراستە .. بەلام لێرەدا گرنگ ئەوەیە تۆ بتوانی خۆت وەك گیانی ئەوخانمە نیشان بدەیت .. واتە لەڕۆحی ئەوبچیت ...

**نیتۆش** : جامن چوزانم گیانی ئەو چۆن چۆنی یە ! گیان .. ئەڵێن لەم دوایی یەدا کابرایەك مردووەو گیانەکەی یەکسەر وەك مشکێکی بچکۆلە دەرپەریوە [پێ ئەکەنێ] .

**ناپلیۆن** : ئەشێ شتی وا رووی دابێ .. بەلام زۆربەی گیانەکان ئەوە نەبێ تۆزێك بچووکترن ئەگینا تەواو لەخاوەنەکانیان ئەچن .

**نیتۆش** : کەواتە ئەتەوێ بڵێیت ...

**ناپلیۆن** : [ پێی ئەبڕێت ] کەواتە حاڵی بوویت لێم .

**نیتۆش** : بەڵێ تێگەیشتم ، ئێستا من چی بکەم ؟

**ناپلیۆن** : خۆزگە دوانەکەوتیتایە ، ئێستا وەختمان بەدەستەوە نەماوە ... بەم پەلەپەلە ناتوانم چیم ئەوێ تێتی بگەیێنم ... باشەتۆ ئەتوانیت لێم تێ بگەیت ؟

**نیتۆش** : نەوەڵلا .. بەم پەلەپەلە هیچت لێ ناگەم !

**ناپلیۆن** : تۆبێ دەنگبە .. خانمەکەم ، بێ دەنگبە ، پێویستە تۆ بە بێ دەنگی گوێم بۆرادێریت .. ئەبێ تۆ گیانی خاتوو یانۆرا دۆراندۆی خێزانی بازرگانی پەنیرو ماستی کۆمارەکەمان بنوێنیت .

**نیتۆش** : ئەو .. یانۆرا ..! سەیرە ، گیانی ژنە بازرگانی گەورە !!!

**ناپلیۆن** : [ بەدەنگی بەرز ] کارێکی وامکرد هەرلەم مێژەوە ئەوخانمە کۆچ کردووە قسە لەگەڵ مێردەکەیدا بکات ... ئێستاش دۆراندۆی بەرێز پارەیەکی زۆر ئەدات ئەگەر بێتو بۆچەند دەقیقەیەکی کەمیش بێ شێوەی ژنە نازدارەکەی بخەینە بەرچاو ... بەڕای من گیانی تۆ زۆر لەشێوەی ئەو خانمە ئەکات ... تارایەکی سپیت ئەدەم بەسەرتا ... تیشکەکان ئەکوژێنمەوە ، هەموو شتێکیش بەستراوە بەکلاوێکەوە .. تکایە لەگەڵم مەلێ ... دۆراندۆ بڕوای بەهێنانەوەی گیانەکان هەیە .. ئەو کەری تەواونی یە ... بەش بە حاڵی خۆی خوێندەوارە ... بە بچووکترین هەڵە هەست ئەکات کە ئەوە هەڵخەڵەتاندنە ..

**نیتۆش** : بەراستی کارێکی خۆشە [ پێ ئەکەنێ ] ناهێڵم پێ بزانێ [ چەپڵە لێ ئەدات ] ناهێڵم پێ بزانێ ... زۆر لەسەرخۆ قسەی لەگەڵ ئەکەم و جارجاریکیش زەردەخەنەیەکی غەمبارانەی ئاراستەئەکەم ...

**ناپلیۆن** : تەواو بێ دەنگبەو بە غەمباری یەوە زەردەخەنە بخەسەرلێوت .. زۆر چاکە با دەستی پێ بکەین ... یەکەمجار با پرۆڤەیەك بکەین ، [ دەستی ئەگرێ و لەسەر کورسی یەکە دای ئەنێ ] لەسەر ئەم کورسی یە دائەنیشیت ، ئێستائەم تارایە ئەدەم بەسەرتا ، ئەم حەریرە رەشەش ئەدەم پیاتا .. [ تاراکەی ئەدا بەسەرداو حەریرە رەشەکەشی وەکو عەبا پیائەداتو لەدوورەوە تێی ئەڕوانێ ] زۆرچاکە ، ئێستا ئەم پەتەی دەستم رائەکێشم و بەمەش حەریرە رەشەکە بەرزئەبێتەوە بۆسەرەوە ... زۆر چاکە ، ئێستا لەتارمایی ئەچیت .. باتیشکی گلۆپەکە بدەم لەدەموچاوت .. [ تیشکەکە دائەگیرسێنێ و تۆزێك لێی دوورئەکەوێتەوەو بەووردی سەرنجی ئەدات ] .. زۆرچاکە ، لەسەرخۆ تاراکە لەسەرت بەرزبکەرەوە .. ئاوا .. ئافەرم .. زۆر جوانە .. منیش پەنجە بەم سویچەدا ئەنێم بۆئەوەی بەهێواشی دەنگی قەوانەکە ببیستین [ پەنجەی پیائەنێ و لەقەوانەکەوە دەنگی کۆمەڵێ ئاژەڵ جیاجیا ئەبیسترێت ، ناپلیۆن شپرزە ئەبێ و نیتۆش قاقا پێ ئەکەنێ ] ...

**نیتۆش** : ها .. ها .. ها .. وەختە لەپێکەنینا ئەتەقم ..

**ناپلیۆن** : باکاتی خۆمان بەفیرۆ نەدەین .. خەریکە ئەم هەڵەبچکۆلەیە کارەساتی گەورەمان بۆدروست بکات .. وائەیگۆرم .. ئێستا قەوانێکی تری ئەخەمەسەر کەمۆسیقای کڵێسەی ئەرسەدۆکسی یۆنانی ی تیابێ .. ئەمیان بەتەواوی بەسەر هۆشی مرۆڤدا زاڵ ئەبێ [ دەنگی مۆسیقاکەدێ ]

ئەوەتا ، زۆرچاکە ، ئێستا لەسەرخۆ تاراکە لابدە ..
لەسەرخۆ ، تۆ یانۆرای ، ی .. ا .. ن .. ۆ .. را ...
ئێستا ئامێری قسەکردنەکە ئەخەمە گەڕ بۆئەوەی
چەند پرسیارێکت لێبکات [ زەنگ لێئەدرێ‌و ناپلیۆن
رائەچلەکێ ] زەنگە ! هات .. فریای پرۆڤەکەمان
نەکەوتین .. دەك بەلەعنەت بێت .. خێرا حەریرەکە
بدە بەسەرتا .. دەی زووکە .. [ گلۆپەکەی سەر
یانۆرا ئەکوژێنێتەوە ـ چرای سەرمێزەکەی
دائەگیرسێنێ ] بێدەنگ دانیشە ، فرزەت
لیوەنەیەت .. گەربەباشی دەورەکەی خۆتت نواند
ئەواپێنج‌سەدفرانکت ئەدەمێ .. نەجولێیتەوە ،
بەداخەوە کەپرۆڤەکەمان تەواونەبوو ، گرنگ‌نی‌یە ،
گرنگ ئەوەیە بەغەمباری‌یەوە زەردەخەنە
بخەیتەسەر لێوت .. ئێترتەواو ، بێدەنگبە ،
وائەیهێنمە ژوورێ .. [ دەرگاکەی لێئەکاتەوە ،
بروسپیر دۆراندۆ دێتە ژوورەوە ، چاکەتێکی رەشی
لەبەردایەو بۆینباخێکی توخی لەملدایە ،
شەپقەیەکی گرتووە بەدەستەوە ، ناپلیۆن بەرێزێکی
زۆرەوە بۆی ئەچەمێتەوە ، دۆراندۆش بە هەمان
شێوە وەلامی ئەداتەوە ، دۆراندۆ دارێکی
وەك‌گۆچانی بەدەستەوەیە ، ناپلیۆن لێی نزیك
ئەبێتەوەو شەپقەو دارەکەی لێ وەرئەگرێ‌و
بەعەلاگەوە هەلیان ئەواسێ .. لەسەر یەکێك
لەکورسی‌یەکان دائەنیشێنێ .. ]

**ناپلیۆن** : بەرێز ، داواکەتانم زۆربەزەحمەت بۆمەیسەرکرا ،
ناچاربووم راستەوخۆ پەنابەرمە بەرلێپرسراوە
مەزنەکانی ئاسمان ، ئەوانەی گیانەکانیان
بەدەستە ، بەنام بردە بەر « تامورگان » ی
لێپرسراوی گیانەکان‌و دوای هەولێکی‌زۆر توانیم
رازی‌بکەم کەگیانی خاتوو یانۆرای خێزانی
جەنابتمان پێبداتەوە ، تالەم بەیەککەیشتنەی
ئەمرۆدا ئامادەبێ ، ئەم نامەیەشم‌لە تامورگانی
مەزنەوەبۆ هاتووە ...

**دۆراندۆ** : [ لێ‌ی‌وەر ئەگرێ ، چاویلکەکەی بەرزئەکاتەوە ،
بەدیقەتەوە نامەکە ئەخوێنێتەوە ... ] تەنها بۆ
سەیرکردنە ، بەراستی ئەمە مایەی خۆشحالیمە ،
مانای ئەوەیەمن یانۆرائەبینم ..

**ناپلیۆن** بەلێ ئەیبینیت ..

**دۆراندۆ** : چەند بەختیارم ، مامۆستای بەرێز ، ئەمرۆ خۆشترین
رۆژی‌منە ، چونکە خاتوو یانۆرای خوالێ‌خۆشبوو
ئەبینم ، خۆ مەسەلەکەتەنیا ئەو
چاوپێکەوتنەنی‌یە ، بەلکووەك
هاوولاتی‌یەکی‌خاوەن بیروباوەڕ خۆم بەبەختیار
ئەزانم ..

**ناپلیۆن** : زۆر راست ئەکەیت .

**دۆراندۆ** : تائەمرۆ کفرکردن هەربەردەوامە ، بەلام
من‌گەشبینم ، بەهەرحال ، ئەبێ شارستانێتی
رۆژئاوا بەرامبەر بەهەلەتە بەلشەفی‌یەکەی ئاسیا
بووەستێتەوە ..

**ناپلیۆن** : ئەمەراستی‌یەکە هەرگیز نکوولی لێناکرێت .

**دۆراندۆ** : بەبیروباوەڕی کۆنەوە ناگەینە ئەنجام ، بەلکو ئەبێ
لەگەل بیری ئەم سەردەمەدابین ، پێویستە ئەمرۆ
ئایین‌و زانست پێکەوە ببەستین .. شەممەی
رابووردوو سەبارەت ئەم مەسەلەیە بە
دووروودرێژی دوام . بروابکە ئەیانویست باجی
نوێ‌لەسەر هێلکەدابنێن ، بەلێ رادیکالێکان
ئەوپارەیەی لەشیروەری ئەگرن بەشیان ناکات ،
بۆیە پێم ووتن : ئەی‌رادیکالێکان ئەتانەوێ رژێمە
کۆمەلایەتی‌یەکەتان لەسەرچی دابمەزرێنن ؟
لەسەر هێلکە ؟ ئێوە هەموو کردەوەیەکتان ئەکەن
بەگژ هێلکەی بەستەزماندا ، بەلام من‌ئاگادارتان
ئەکەمەوە ، ئەگەر شاروانی ئاگای لەخۆی نەبێ
ئەوا باج کارێکی ئەوتۆ ئەکات هەرچی هێلکەیە
لەداخا شەق بەرێ !. بەلێ ، لەسەرقسەکانم
بەردەوام بووم‌و بەوپەری بڕواوە ووتم : « چی
ئەتوانێ ئەم کۆمەلەمان رزگاربکات ؟ بێگومان
تەنها یەکێتی‌ی کلێسەو هێنانە بەرچاوی
گیانەکان .. چونکە ئامادەکردنی گیانەکان ، بێجگە
لەوەی خێری خواوەندە تاقی کردنەوەیەکی
لەباریشە ، بۆیەپشت ئەستوورین لەوەی کەگیانی

ئەمواقیعە والەبەردەمتانا » ... زۆر بەپەرۆشەوە قسەمئەکرد .. ئەوەندەمووت ئارەق لەشەپقەکەمەوە چۆڕاوەگەی بەست ، تەنانەت دەستەسرەکەم وای لیهات بەباشی ئەگوشرا .. ئەو پیرەمێردەی چاودێری مندالەکەمە پێیووتم : تەواو سەرنجمت بەلای خۆتدا ڕاکێشا ، هەرلە تشیشرۆن ئەچوویت ، تۆ بۆ ئەوەباشیت ببیتە زەعیمێکیگەورە .... کەواتە پێویستە یانۆرابیبینم ، باشە ئەیناتوانم دەستی لیبدەم ؟

**ناپلیۆن** : ئەم کاتەی پێتی ئەڵێم بیهێنەرەوە یادیخۆت .. سەعات بیستی ئەوێ بۆیانزەی ڕۆژی هەشتی ئەیلوولی ساڵی 1928 .. تۆئەمە بکەو منیش بەڵێنت ئەدەمێ کە دەستی لێبدەیت ...

**دۆراندۆ** : ئەوە تۆ ئەڵێیت چی ؟ خۆمن تۆمای کافر نیم ! منهەر ئەوەندەم ئەوێ دەستی بخەمە ناو دەستمەوەو بڵێم : « منبروام قایمە ، خوایە تۆبەبێ » .. ئەوسا بە هەمان شێوە بەهەموو گومان لەدڵەکان بڵێم : « گیان ڕاستییەو ڕاستیش بەتەرازوو ئەپێوریت » .. جا ئەبێ ئەو کاتە حاڵیان چۆنبێ ؟ چۆن ئەتوانن شۆڕش بشارنەوە ؟؟ ئەبێ مانای شۆڕش چیبێ لەخاکێکدا کەناتوانێ نەمریمان بۆتۆمارکات ! بەم بۆنەیەوە مامۆستا ئەمەوێ پرسیارێکی بچکۆلەت ئاراستەکەم ..

**ناپلیۆن** : فەرموو قوربان .

**دۆراندۆ** : ئەو پیرەمێردەی چاودێری مندالەکەمە ڕۆژێکیان سەبارەت ئەم مەسەلەیە لێی پرسیم : « گیانی بەلشەفییەکان دوای مردنیان بەرەوکوێ ئەچن ؟ » منیش پێمووت : « بەرەو جەهەننەم » ، جائەوی ڕاستیبێت تەواو لەوەڵامەکەم دڵنیانیم !

**ناپلیۆن** : گەورەم ، ئەوان کەئەمرن گیانیان ئەبێتە شەیتان ، هەرچۆن لەژیانیشیانا شەیتانی رووسیان ..

**دۆراندۆ** : لەگەڵ ئەمانەشدا ، هەرچەندە دڵنیام لەوەی کەجیهانی غەیب وردە وردە لەبەرچاومانـدا دەرئەکەوێت ، بەلام هەرگیز بڕواناکەم جارێکیتر دەست لەملی یانۆرای نازدارم بکەمەوە .

**ناپلیۆن** : نەخێر بەپێچەوانەوە ، ئەمرۆ ئەیبینیتو قسەشی لەگەڵدا ئەکەیت ، بەلام ئەبێ ئەوەش بزانیت کەگیانەکان هەست بەناخۆشیو دڵتەنگی ئەکەن . بۆیە ئەبێت چاوپێکەوتنە کە درێژە نەخاێنێ ، پێویستە پرسیارەکانت کەمبن .. چونکەلەوە ئەچێ ئەوگیانانە بەرگێکی یەکجار تەسکو تروسکیان لەبەرکرابێ ، تەواو سەغڵەتن !

**دۆراندۆ** : باشە ، هەوڵ ئەدەم یانۆرای بێگوناه نارەحەت نەکەم .. بەلام مامۆستا زۆر حەزئەکەم قسەی لەگەڵ بکەم .

**ناپلیۆن** : پێکێك ئەلبۆرتۆ ناخۆیتەوە ؟

**دۆراندۆ** : با ، بەخۆشحاڵییەوە .

**ناپلیۆن** : [ پێك تیئەکاتو پێشکەشی ئەکات ] فەرموو ..

**دۆراندۆ** : هم .. زۆرچاکە ، سوپاس .

**ناپلیۆن** : [ لەسەر کورسییەکە دۆراندۆ دائەنێ ] گەر تووشی دڵە کزێ بوویت ئەوا دەنگەکە با دەنگێك کادیالیست بدەمێ .. تکایە لەسەرخۆو بەدەنگێکی هێواش بدوێ ، بەچرپەش نا .. مێشکت لەسەر خۆیەتی ، ؟

**دۆراندۆ** : تەواونە ، بەلام لاموایە بێ حەب چاك ئەبم .

**ناپلیۆن** : بەم ناقووسە ئەفسوناوییە بانگی ئەکەمو ئەویش ئەبێ وەڵامم بداتەوە .. ئەم ناقووسە لەباپیرمان کۆنترە .. [ بەجۆرێکی تایبەتییەوە بۆی ئەوەستێو بەدەنگێکی دەستکردەوە ] ئەی یانۆرای جوان ، ئەی ئەوکەسەی پاش مردنیش خۆشەویستیت لێئەبادێت .. ئەی یانۆرای شەنگ ، ناسکترین یانۆرای نێوان سیوحەوت ملێون یانۆدای ئاسمان ، ئەی ئەو یانۆرایەی جاران لەشەقامی تیبۆ خانووی ژمارە چواردە ئەژیایت .

**دۆراندۆ** : [ بە چرپە بۆ ناپلیۆن ] ژمارە حەفدە : حەفدە : نەوەك یانۆرایەکی تر بێت !

**ناپلیۆن** : ژمارە حەفدە .. حەفدە ... ئەی یانۆرای خێزانی مسیۆ برۆسپیر دۆراندۆی ڕاوێژکەری شارەوانی . خۆت نیشاندە ، خۆت نیشاندە ، ئەوەتا لێرەیە . لێرەیە ئەوکەسەی تاڕادەی شێت بوون بۆت ئەیپەرستی .. تۆش بەهەمان شێوە بوویت بۆنەو ،

ئەمە دۆراندۆی مێردتە .. [ بەچرپە بۆ دۆراندۆ ] لەماڵەوە بەچی بانگی ئەکردیت ؟

**دۆراندۆ** : تیمساحە بچکۆلەکەم .

**ناپلیۆن** : [ بەپێکەنینەوە ] تیمساحە بچکۆلەکەم ! [ دەنگی پێکەنینی نیتۆش دێ ]

**دۆراندۆ** : هێواش ، گوێم لەپێکەنینێکی نەرمبوو ، تۆ بڵێی گیانی یانۆرابێ ؟

**ناپلیۆن** : ئەشێ ئەوبێت .. تەماشاکە ، واخەریکە دەرئەکەوێت .. پێمبڵێن ، چیئەبینن ، چیئەبیستن ؟ چونکەئێوە زۆرشت هەست پێئەکەن کەمن هەستیان پێناکەم ..

**دۆراندۆ** : تیشکێك ئەبینم زۆر ڕوون نییە ، خاڵێکی تۆخ ، چەند جوانە ، ئەوە خاڵەکە بووە تارمایی سپی ، شێوەکە ڕۆشەن تربوو ، بەڵێ خۆیەتی ، دەموچاوی زیاتر دەرکەوت .. ئەوە ژنەکەمە ، خۆیەتی ، ئاژنەکەمە ، ئەیهاوار ناتوانم بووەستم [ بەچیچکانەوە بۆی دائەنیشێ ] .

**ناپلیۆن** : چی ئەبیستی ؟

**دۆراندۆ** : شتێك دێتەگوێم زیاتر لەگۆرانی ئەچێت ، دەموچاوی باشتر دەرکەوت ، خۆیەتی ، ئێستا جوانترە لەجاران ، یانۆرا لەشێوەی فریشتەدایە ، ئەڵێی «سافارف» ی خواوەندە .

**نیتۆش** : [ بەدەنگێکی ژنانەی ڕێكوپێكەوە ] سڵاوت لێبێ مێردەکەم .

**دۆراندۆ** : دەنگی گۆڕراوە .. ناسکتربووە .. سڵاوت لێبێ یانۆرا گیان ، منئێستا بەچاکی ئەتبینم ، گەلێك جوانتروگەنجتر دیاریت لەجاران .

**نیتۆش** : ئۆی ، لێرە جێگایەکی ئەوتۆمان هەیە هیچ هاوینە هەوارێك نایگاتێ ، منهێندە گەنج ئەبمەوە ئەترسم ماوەیەکی تر وەك منداڵێکی بچکۆلەم لێبێت ، بەلام تۆ تەواو پیربوویت ، هیوام وایە بەم نزیکانە بێیت بۆلام ، خۆزگە ئەهاتیتو پێکەوە بژیاینایە ، ئەوسا دووقۆڵی بەرەو ئەستێرەی زوهرە ئەفڕین ، ئەوێ جێگایەکی زۆر خۆشە ، تێر ئەگەڕێین ، ئەوانەی بەرەو ئەو ئەستێرەیە ئەفرن زیاتر ئەو ئەفسەرانەن کەلەم جەنگەی دواییدا کوژران .. ئەوان لەوێ بوونەتە ئەسحابە ، لەوێ هەموو شتێك جوانە .. [ ناپلیۆن سەر بۆ نیتۆش ڕائەوەشێنێو بەدەست ئیشارەتی پارە پێدانی بۆئەکات ] ..

**دۆراندۆ** : من زۆر بەختیارم یانۆرای جوان ، ئۆخەی کەلەبەهەشتایت .. بەلام منئەمەوێ زیاتر لەسەر زەوی بمێنمەوە ... باشە تۆ باسی گەشتو گوزارتکرد ، ئەی لەوێ خواردنو خواردنەوەتان هەیە ؟

**نیتۆش** : بەڵێ بەلام ئێمە ئەو شتانە ئەخۆین کەڕۆحین ، واتە تایبەتن بەگیانەکان ، خواردنەوەشمان شەرابی گوڵاوییە ..

**ناپلیۆن** : [ بەدەنگێکی دروستکراوی سەرسوڕهێنەرانەوە ] ئەمانە هەمووی مەعلووماتی تازەن ، ئەوانەیتر کەگیانەکان ئەهێننەوە هەرگیزشتی وانابیستن !

**دۆراندۆ** : [ بەناپلیۆن ] مامۆستا ، هێشتا ئەمانەکەمن ، بەلام هەرچۆنێ بێت لەهیچ باشترن ..

**ناپلیۆن** : کاتی ئەوە هات کۆتایی پێبهێنین .. باگلۆپەکان داگیرسێنمەوە .

**دۆراندۆ** : نا ، نا .. نەکەیت ، هێشتا ئەوپرسیارانەم ماوەبیانکەم کە زۆر دەمێکە گینگلیان پێوە ئەخۆم ... یانۆرا ، تۆ مردوویتو منزیندوو ، پێمبڵێ ، تالەژیاندا بوویت درۆت لەگەڵدا کردم ؟

**نیتۆش** : ئەیچۆن خۆشەویستم .

**دۆراندۆ** : ئەڵێی چیی ؟! درۆت لەگەڵ کردووم ؟! لەگەڵ کێبوویت ؟ ها ...؟ کەواتە ئەوەی پێت ئەووتری ڕاستە .. پێمبڵێ ، کێ بووکێ ؟

**نیتۆش** : خۆشەویستم ، ئێمە لێرە ئەوشتانەمان لەبیرئەچێتەوە .. بەلام دڵنیابە ، تەنیا شتێك کەڕەگی بەقوڵایی دڵمدا داکوتاوەو هەرگیز لێی نابێتەوە خۆشەویستی تۆی ئازیزە ...

**ناپلیۆن** : [ بەوپەڕی وەڕسییەوە ] قسەی جوان ، زیرەکانە .. ئاخ ...

**دۆراندۆ** : تۆ نزیکترین کەسم بوویت .. هەرتۆ ئەتلاواندمو

خزمەتت ئەکردم .. بەلام ئێستا خـوا ئاگـای لێیە
تەنیا باڵو بێ‌کەس ماوم ..

**نیتۆش** : هەڵەیت .

**دۆراندۆ** : چۆن ؟ ئەتەوێ یەکێکی‌تر هەڵبژێرم ، وانی‌یە ؟

**نیتۆش** : نەخێر

**دۆراندۆ** : ئەی چی ؟

**نیتۆش** : ئەبینیت چەندە دڵم پێت ئەکرێتەوەو ئێستاش چۆنم بۆت .. لەبری ئەوەی تۆبێیت بۆلام خۆم دابـەزیمو هاتمە دیدەنیت لێرە .. لێرە .. نازانم چۆنت تێ‌بگەیێنم ... لێرەمەرجەکانی خۆشەویستی نابینرێ !

**دۆراندۆ** : تێ‌گەیشتم .. ئەی تۆ مامۆستا ناپلیـۆن مالاپـارتە تێ‌ئەگەیت ؟

**ناپلیۆن** : بەلێ تێ‌ئەگەم [ لەنیتۆش نزیك ئەبێتەوەو بەچرپە ] باسی چی‌ئەکەیت مەلعوون ؟

**نیتۆش** : گەر مامۆستـا یارمـەتیم بدات هـەندێ شت هـەیە ئەمەوێ بۆتی باس‌بکەم .. لێرەو لەناو گیانەکانـدا زۆر ئەناسم .. ماوەیەك ا ـەوبەر «ئۆفباخ» کـرابە سەرۆک ـی مۆسیقای ئاسمان .

**ناپلیۆن** : [ بەچرپە بۆ نیتۆش ] چی‌یە ، تێك‌چوویت ؟

**نیتۆش** : لێرە مرۆڤ ئەتـوانێ پەی بـەرێگای ئـەوتۆ بـەرێت کەبیگەیێنیتـە عەرشی خـواوەند ، ئـەو خواوەنـدەو گیانێکی مۆسیقایی جوانی هەیەو ئـامێری گیتـاری ئۆلس لێ‌ئەدات ...

**ناپلیۆن** : [ بەهێواشی بەنیتۆش ] گەر لەچەنەبازی نەکەویت ئەوە ناچارم گلۆپەکان بکوژێنمەوە .

**نیتۆش** : [ بەهێواشی بۆناپلیۆن ] کەیفی خۆتە ، گەرئەتەوێ تاقی‌کەرەوە .. [ بەدەنگی بەرز ] دۆراندۆی ئازیز ، گریمان جارێکی تربەتۆی خۆشەویستم ئەگەمەوە ، ئەوسا من ساوا ئەبمو تۆش پەك‌کەوتە .

**دۆراندۆ** : من لەمەقاقێکی . بەوێنەی ئـۆرفیە ئەفریدیکا وابوویە

**نیتۆش** : چۆن .. تۆ ئۆرفیە ئەمریدیکا ئەناسیت ! ، بەراستی ئۆپەرێتێکی نایاب بوو [گۆرانی ئـەلێ] ئەفـریدیکـا «ئەفریدیکا ... با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان ..

لێـرە دەرهێنـەرێکیشم نـاسی ... ئـا .. ئـەلێم .. رۆژمێرەکەت دەربێنەو بنووسە ..

**دۆرانـدۆ** : ئەلێیت چی هـەی گیانـە ئەفسـووناوی‌یـەکـە ، لەئاسمانا دووخاڵ لەسـەر کوڵـەکانت درووست بوون دڵ دەرئەهێنن .. فەرموو ئامادەم .

**نیتۆش** : ئەو خـالانە ئـەهێنمەوە سـەر زەوی .. بنووسـە : شـەقامی مـۆفتاد ژمـارە 99 ، 13 ، لەوێ ئـەمیلیـا بـۆتاشی بێـوەژن بدۆزەرەوە ، لەوێ کچێکی لایـە ناوی نیتۆشە ، هەرلەیانۆرا ئەچێت ، لەگەڵ یانۆرادا وەك دوو دەنکەنیسکن‌و لەیەکتر جیا ناکرێنەوە گەر خۆشت‌ووویست ، گەر وویستت لیـوەی نزیـك‌بیت ، ئەوائەبێ خزمەتێکی چـاکی بکەیت ، ئـەبێ کراسی جوان‌جوان‌و خشڵی گرانبەهای بۆبکڕیت ، گەروات کرد ئەوا من ئەچمە بـەرگی ئەوەو ئـەوساپێکـەوە ژیانێکی سەرفراز رائەبوێرین .

**دۆراندۆ** : ووتت لەتۆ ئەچێت ؟

**نیتۆش** : بەتەواوی ، وەك سێوێکین کرابێ‌بە دووکەرتەوە ..

**نـاپلیۆن** : [ بـەشلەژاوی‌یەوە ] دۆرانـدۆی بەرێـز ، چی‌تر لەتوانامدانەما دان‌بەخۆمدا بگرم ، ئەبێ ئەم فێڵە بخەمە روو ، ئەمکچە فێڵبـازە ، وائەزانم لەبـاتی گیانی یانۆرا گیانێکی درۆزن‌و پیس خۆیمان نیشان ئەدات ، گیانی ئافرەتێکی بەلشەفی بێ‌دینـەکە لەزووەوە مـردووە ، ئـەیـەوێ دەست بخـاتـە ئەمکارەی ئێمەوە کەلە جیهاندا بەهای بێ‌وێنەیە ...

**نیتۆش** : ئەم قسانەچین ئەم کابرایە ئەیانکات .. من‌ژنەکەتم ، یانۆرام ، ئەمە ئەیەوێ بەختیاریمـان لێ‌بشێوێنێ .. ئەم پیاوە مردوو هێنەرەوەیەکی هیچ‌وپووچ‌و درۆزنە .. ئەیەوێ سەغلەتمان‌بکات ، پێویستە گیانی ژنەکەت لەم پیاوە بێ‌ئابرووە بپارێزیت ..

**ناپلیۆن** : [ گلۆپەکەی سـەر نیتۆش ئـەکوژێنێتـەوە ] دوور کەوەرەوە ..

**دۆراندۆ** : چیتان کرد ؟

**نیتۆش** : من نەرۆیشتووم [ لەتاریکی‌یەکەوە ] من لێرەم ..

**ناپلیۆن** : [بۆدۆراندۆ] ئەمەوێ پێت‌بڵێم ....

**دۆراندۆ** : [ قسەکەی پێ ئەبڕێت ] هیچم پێ مەڵێ.. ژنەکەم بۆبهێنەرەوە .

**ناپلیۆن** : ببورە خەریکە ئەبێتە قوربانیی دەستی ئافرەتێکی درۆزن .

**نیتۆش** : قەیناکا .. وامن خۆم ئەشارمەوەو لەچاو وون ئەبم ، [ خۆی وون ئەکات ، لەپشتی پەردەکەدا ] بەلام دۆراندۆ گیان ، ئاگات لەخۆت بێ و مەهێڵە ئەم شەریکی شەیتانە لەخشتەت بەرێ ، هیچی تر قسەی لەگەڵدا مەکە ، سبەینێ سەعات شەش لە شەقامی مۆفتادی ژمارە 99 , 13 چاوەڕوانتم ، [ بۆناپلیۆن ] ئیتر واخۆم وون ئەکەم ئەی فێڵبازی درۆزن [ خۆی ئەشارێتەوە ] .

**ناپلیۆن** : سەیرە ! ئەبێ بۆتی روون بکەمەوە کەوا ....

**دۆراندۆ** : [ قسەکەی پێ ئەبڕێت ] هیچ روون مەکەرەوە تۆئازاری ئەم گیانە داماوانە ئەدەیت .. ئەچم بۆ کۆمەڵەی ئاژەڵ پەروەران .. یەك پوول چییە نادەم .

**ناپلیۆن** : بەڕێز ..

**دۆراندۆ** : بەڕێزو مەڕێز ناخوات ، هیچت نادەمێ .. بابێ بەدەرس بوت ، ئای لەسیحری یانۆراکەم ، هەست ئەکەم گەنج ئەبمەوە [ تەماشای رۆژمێرەکەی بەرباخەڵی ئەکات ] سبەینێ سەعات شەش ، خاتوو نیتۆش ، مادمۆزێل برالینە ، ئەزانم چۆن چۆنی سەروەتەکەمی بۆ ئەخەمەکار ، تۆش هەوڵبدە خۆت چاك بکەیت ، ببە بەپیاو .. پێویستە لەگەڵ گیانەکاندا ئاقڵ بیت ، ئەبێ ئەوەباش بزانیت کە تۆ لەخزمەتی گیانەکانایت نەك بازرگانیان پێوەبکەیت .. خواحافیز ناپلیۆن مالاپارتە .. [ بەدەم چوونە دەرەوە ] ئێفریدیکا .. ئێفریدیکا .. ئێفریدیکا [ ئەڕواتە دەرەوە ] .

**ناپلیۆن** : لەکوێ خۆت شاردووەتەوە هەی بێ رەوشت .. وەرە ئێرە هەی ساختەچیی درۆزن ..

**نیتۆش** : [ بەجلەکانی یەکەم جارەوە دێتە دەرەوە ] ناپلیۆن بێ دەنگبە ..

**ناپلیۆن** : ئاوا بانگم مەکە هەی بۆگەنی بەدفەسال .

**نیتۆش** : قسەم پێ ئەڵێیت .. زۆر باشە ، هەروا بەسەرتەوە ناچێت .. هەر بەیانی زوو ئەچمە لای لیوشی هاوڕێی رۆژنامە نووسمو ئەم بەسەر هاتەی بۆئەگێڕمەوە ، تا لەرۆژنامەکەیاندا ئابڕووت بەرێت .. بگرە شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕیشت لەسەر بنووسێت .. ئەوسا ئەبێتە سینەمای خەڵکی .. بەڵێ منی نیتۆش برالینە وات پێ ئەڵێم .. بەچاوی خۆشت ئەیبینیت ، ئێستا باش گوێ بگرە ، تۆ لەژێر دەستی مندایت و منیش مەگەر هەرخۆم بزانم بەچ دەردێکی ئەبەم .. [ ئەیەوێ بچێتە دەرەوە ] .

**ناپلیۆن** : بووەستە ، مەڕۆ .. تۆ ناتوانیت ئەمەبکەیت ، گەر وابکەیت ئەوا دۆراندۆت لەکیس ئەچێت ، تێ گەیشتیت ؟

**نیتۆش** : لەتوانامدایە بێ ئامۆژگاریی تۆ دۆراندۆی بەڕێز بکەمە هاوڕێی خۆم .. با ئەو بەشەقامی مۆفتاددا بێت و لەدەرگای ماڵەکەمان بدات ئەوسا ...

**ناپلیۆن** : زۆر چاکە ، بەکەڵکت دێت ..

**نیتۆش** : هەرئەوەیە .. با پێشت بڵێم ، ئەبێ لەمەودوا رێزم بگریت ها ..

**ناپلیۆن** : زۆرچاکە ، هەر بەوێنەی تابلۆیەکی نایاب رێزت ئەگرم کەرۆژێ لەرۆژان چاوم پێی کەوتبێ .. بەلام ئەبێت شتێك پارەم بەش بدەیت چونکە من بوومە هۆی ناساندنت بەدۆراندۆ ..

**نیتۆش** : ئەمەیان ئەکەوێتە سەر ئارەزووی خۆم ئەی ناپلیۆنی بەڕێز .. [ بەخۆ بادانەوە ئەچێتە دەرەوەو پەردە دائەدرێتەوە ]

**تێبینی** :

ئەم شانۆگەرییە لەرۆژی 10 / 9 / 1983 لەمیهرەجانی مەڵبەندەکانی لاوانی کوردستان لەشاری دهۆك لەلایەن تیپی نواندنی هەڵەبجەوە پێشکەش کراو خەڵاتی دووەمی میهرەجانەکەی پێدراو ، لە رۆژی 23 / 9 / 1983 وە بۆماوەی هەفتەیەك لەسەر شانۆی مەڵبەندی لاوانی هەڵەبجە پێشکەش کراو ئەم هونەرمەندانە دەوریان تیابینی :-

رێبوار نوری «ناپلیۆن» ، سۆران حەمە فەرەج «نیتۆش» ، مەحموودعەزز «دۆراندۆ» .

هەردوو جارەکە لەلایەن هونەرمەند یاسین قادر بەرزنجییەوە دەرهێنرابوو

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## لە هەولێر

ئامادەکردنی : شوان

### کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد

### و

### پێشانگایەکی خنجیلانە

یەکێ لەو دیاردەگەش و دڵخۆشکەرانەی ، نیشانەو بەڵگەی پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەگەیێنێ ، گرنگی و بایەخدانە بە جۆرو چۆنیەتی پەروەردەو پێگەیاندنی منالان ... بەڵێ منالان ئەو غونچە ناسک و بێگەردانەن کە تەلاری دوا رۆژی کۆمەڵگا دروست دەکەن ... بۆیە هەر هەوڵ و تەقەلایەکی دڵسۆزانە لە پێناویاندا بەخت کرێ ، بەزایەو فیڕۆ ناڕوات ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو جۆرە پشتگوێ خستنێکیان ئەنجامێکی ڕەش لای کۆمەڵ بەجێ دێڵێ ... دیارە هەر لەو روانگەیە شەوەیە تەواو روو لەم بوارە ناسکە کراوە .

جێی خۆیەتی بە شەوقەوە ڕووبکەینە ئەو پێشانگا خنجیلانەیەی لە رۆژانی 2— 1983/10/9 لە لایەن کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کوردەوە لە هەولێر بۆ منالە روو خۆش و دڵپاکەکانمان سازکرا .

## - کێ بەشداری پێشانگاکەی کرد ؟ -

لەو پێشانگایەدا (80) منال کە تەمەنیان [5 — 12] سال دەبوو بەشداریان تێدا کرد .. هەر یەکەیان باشترین تابلۆی خۆی لەگەڵ وێنەیەکی فۆتۆگرافی و کورتەیەکی ژیانامەیان لە پێشانگاکەدا ئامادە کردبوو .

تابلۆو وێنەکان بە بۆیەو بۆیەی ئاوی و قەڵەمی رەش نەخش کێشرابوون ، هەر یەکە لەو تابلۆیانە بە پێی ئاسۆی بیری ئەو تەمەنەی خۆیان لایەنێکی بواری ژیانی کوردەواریان

دەرخستبوو ... تابلۆکان هاواریان دەکرد : دنیایەکی بەربلاومان لەبەردەمدایە بابە کەیفی خۆمان هەڵوێست بنوێنین ، زۆربەی خاوەنی تابلۆکان دیاردەی وزەو توانایەکی

باشیان پێوە دیار بوو ، گەر بێتو لەلایەن هونەرمەندە پسپۆرەکانمانەوە بایەخیان پێ بدرێو بە شێوەیەکی راستەو دروستی سەردەم بە گیانێکی زانستانەوە پەروەردە بکرێن ئەوا هیوای داهاتێکی روون و سەرکەوتویان لێ دەکرێت .

## - چەند تابلۆیەکی هەڵبژاردە -

لە گەشتێکی هێمن و ورد بە نێو پێشانگاکەدا . گەلێ تابلۆی رەنگینی ئەو دەستو پەنجە وردو نەرمۆڵانە بە توندی سەرنجیان راکێشاین ، سا بەو نیازەی مشتێ بکەینە نمونەی خەروارێك ئەوا زۆر بە کورتی لەم تابلۆ هەڵبژێراوانە دەدوێن :

1 - **بەهائەدین محەمەد عەلی** : دیمەنی تاڤگەیەکەو زیاد لە هەمووی وێنەیەکی کتومتی تاڤگەی عەلی بەگە لە وەرزی هاویندا :
رەنگە جۆر بە جۆرەکانی تابلۆکە تا ئەندازەیەکی چاك لەگەڵ یەکدا گونجا بوون .

2 - **شادمان عەلی ئیبراهیم** : بەرە بەیانێکی زوو ، گزنگ لە ئاسۆی دەربەندێکی دوورەوە سەرەتاتکێ دەکات دەیەوێ ماچی رووی ئەو گوندە بکات کە پاڵی بە چیایەکی سەرکەشەوە داوەو گەرووی دەربەندەکەش ئاوێکی خوڕی پیادا دێت و بە بەردەم گوندەکەدا دەڕوات .

3 - **گوڵخاتر محەمەد ئیبراهیم** : ئەم کیژۆڵەیە دیمەنێکی دنیای مات و خەفەتباری کیژێکی داماوی دەرخستووە کە بە تەنیا لە پەنایەکدا بۆ خۆی هەڵتروشکاوە .

4 - **هێمن عەبدول رەسوڵ** : دیمەنێکی سروشتی رانە بزنی بەرانە کێوی‌یە ، لە قەدپاڵی چیایەکدا بێوەی بە کۆمەڵ دەژین .

5 - **سەعدی عەبدولرحمان شوکر** : وەرزێرێکی کورد پێمەرەکەی بە نەرەی شانیدا داوەو رووەو کێڵگەکەی بۆ کارو فرمان دەچێت .

6 - **شەهلا رەفیق مەعروف** : دیمەنی بەهارێکی تەڕ کوبە کچێکی هەرزە لە دەشتاییەکی پڕ لە گوڵ و گوڵزاردا بە روویەکی خۆشەوە لەگەڵ یەك دەدوێن .

7 - **بان گەردون عەزیز** : دیمەنی سەیرانگایەکی نزیك لە گوندێکەوە ، سەیرانکەرەکان هەرهەموویان منالن ، کات نیوەڕۆیەو چوار چوار لە سەر سفرە دانیشتون و نان دەخۆن .

8 - **روناك بایز** : خەیاڵێکی قوڵ لە دیمەنی کۆلیچکەیەکدا خۆی دەنوێنێ کە بە هێمنی روو لە دەریایەکی نزیکی دەکات .

9 - **لوقمان سەعدی مستەفا** : بەهارەو مەل کوێستان و گەرمیان دەکات و خۆی لە دیمەنی هێلانەی حاجی لەقلەقێکدا دەنوێنێ کە بە سەر پۆپەی درەختێکی بلندەوە نیشتوتەوە .



| ئەکتەرەکان | دەوری |
|---|---|
| 1 ـ صەباح عەبدولرحمان | مۆکینبۆت |
| 2 ـ مەحموود ئەحمەد | پاسەوان |
| 3 ـ حەتۆ حەسەن | پارێزەر |
| 4 ـ ئەحمەد جەمیل | مەئمور |
| 5 ـ عەلی ئەحمەد | فۆرست |
| 6 ـ جیهان ئەحمەد | ژنەکە |
| 7 ـ تەها ئاغاجان | دۆست |
| 8 ـ فەوزی جەلال | فریشتە |
| 9 ـ غازی غەفوور | خاوەنکار |
| 10 ـ جەوهەر باپیر | خاوەنکار |
| 11 ـ عومەر محەمەد | حەمال |
| 12 ـ محەمەد سەعید ئیبراهیم | دوکتۆر |
| 13 ـ شلێر ئەحمەد | سستەر |
| 14 ـ ئیبراهیم حەکیم | پیاوی میری |
| 15 ـ مؤید فەقی | پیاوی میری |
| 16 ـ جەلال ئەحمەد | پیاوی میری |
| 17 ـ ئەنوەر شێخانی | خواوەند |
| 18 ـ خالید شێخە | موەزیع |

## مرۆڤ و ئازارەکانی
## یان
## چۆن مۆکینبۆت لە ئازارەکانی رزگار دەکرێ ؟



**ئەم شانۆگەریە :**

1 ـ پیتەر فایس نووسیویتی .
2 ـ عەبدوڵلا قادر محەمەد لە عەرەبی یەوە وەرگیراوە .
3 ـ صەباح عەبدولرحمان بۆ سەر شانۆ ئامادەی کردوە .
4 ـ تیپی رۆشنبیری سەر بە بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەری لە هەولێر ئامادەی کردوەو لە 1983/9/1 دا بۆ ماوەی هەفتەیەك لە سەر شانۆی هۆڵی بەرێوەبەرایەتی ناوبراو پێشکەش کرا .



دەقی شانۆگەریەکە لە پانزە دیمەن (مشهد) پێك هاتووەو هەربەهەمان شێوە لە سەر شانۆ پێشکەش کرا کە بەم جۆرە بوو .

**مۆکینبۆت لە زیندانا**

لەم پەردەیەدا مۆکینبۆت بە پەشۆکاوی لە ژوری زینداندا دەردەکەوێ وادەردەخات نازانێ لە سەرچی گیراوەو پەلەقاژەی رزگاربوون دەکات ، بۆیە لەگەل یەکێ لە پاسەوانەکان رێك دەکەوێ پارێزەرێکی بۆ بگرێو پارەکانی بانکی بۆ دەربهێنێ .

**مۆکینبۆت لەدەرەوەی زیندان**

مۆکینبۆت باسی ژیانی زۆرلێکراوی خۆی بۆ فۆرست دەکات ، کەچی فۆرست کە پیاوێکی بەدەمستە نەك هەربایەخ بەکێشەکەی نادات بەڵکو بەجێشی دەهێڵێ ... فەراموش کردنی مۆکینبۆت تووی دوودڵیو بێ بروایی لە دەروونـدا دەچێنێ ، چونکە لەلایەن کۆمەڵەوە فەراموش‌کراوە .

**ماڵی مۆکینبۆت**

لەم پەردەیەشدا ململانێ نێوان مۆکینبۆتو ژنەکەیدا دەردەکەوێت ، کێشەی ناکۆکیەکەیان بێ‌بروایی ژنەیەو نەفرەت لە مێردەکەی دەکات ژنەکوێی بۆ باسو خواسەکانی مێردەکەی ناگرێتو ئاشکرا دەست بە رووبەوە دەنێتو دەڵێ : چونکە تۆ بەرامبەر من گۆراوی منیش تۆم ناوێ .

**خاوەن کار هەڵوێستی چۆنە ؟**

لەم دیمەنەدا هەڵپەرستی سەرمایەدارەکان دەردەکەوێ کە چۆن هەرکات کاریان بە کەسێك نەماو زانیان دوای گوشینی دوا چۆری هێزی بازوی ئەو مرۆڤە ئیدی کەڵکی نەماوەپشتی تێ دەکەن ، ئەوەتا مۆکینبۆت لە کار دەرکراوەو ئێستا وەك کەسێك تەماشا دەکرێت کە هەرگیز ئەوخاوەن کارە نەیناسیبێ .

خاوەن‌کار تەنانەت کرێکارە ئاوەڵەکانی مۆکینبۆت وا لێدەکات نەفرەت لە هاورێکەیان بکەن .

**مۆکینبۆت بێزاری لەژیان دەردەبڕێ !**

مۆکینبۆت بۆ بەژارە دای نەگرێ روو لە هەر لایەك دەکات ، دەرگا خربەروویدا داخراوە ، خانەبێزارە ، فۆرست بەهەمە جۆرگاڵەی پێدەکاتو زیاتر دڵی لە ژنەکەی پێ‌پیس دەکات .

**دیمەنی شەشەم لەلای دوکتۆر**

لەم دیمەنەدا دکتورو فۆرست بەسەرزاری وەك دەردەدارێك هەڵوێست لەگەڵ موکینبۆت دەنوێننو بە باشی فەحسی ئەندام کوێی دەکەن .. کەچی بە پێچەوانەوە لە رووی دەرونیەوە ئازاری پێ دەگەیێننو بە نەخۆشو سەقەتی دادەنێنو فۆرست خۆی دەکاتە دکتۆرێکی گاڵتەجار .

**فۆرستو هاوریەکەی**

لەم پەردەیەدا هەر کە مۆکینبۆت بە فۆرست دەگات ، ئیدی بێ‌سێوو دوو داخی دڵی خۆی لا هەڵئەرێژێ کە چۆن روو

لە هەر لایەك دەكات چەپۆكی زەمانەی بەردەكەوێت ، ئەوەتا لەلایـەك خانـەی لێبێزاركـراوەو لەلایەكی تـرەوە لە دەرەوە تروسكایی بەدی ناكات .

### مۆكینبۆت بۆ روو لەمیری دەكات ؟

فۆرستو مۆكینبۆت روو لە دایەرەیەكی میری دەكەن ، بەو نیازەی بە پیر هاوارو دادیانەوە بچێ ، ئەمان هەر شەكوای باری ژیانی خۆیان دەكەن كەچی ئەنجام بەو جۆرە دەشكێتەوە ئاش لە خەیاڵێو ئاشەوانیش لە خەیاڵێك .

### بە دەم ڕێگاوە

لەسێ كوچكەی سێ ریانێكەوە دەنگەو هەڵایە ، هەردوو هاوڕێ مۆكینبۆتو فۆرست ناوەرۆكی قسەكان شی دەكەنەوە ، هیچی تێناگەن ... سابەو نیازەی كێشە تایبەتیە كەیان چارە سەربكرێت پەنا بۆ لای خواوەند دەبەن .

### پاڕانەوە لە بەردەم خواوەندا

لەم پـەردەیەدا مـۆكینبۆت بـە مـل كـەچی لەبـەردەم خواوەندی خۆیدا وەستاوەو چاوەری بەزەییو یاریدەدانە ، بۆ ئەو مەبەستە رووی سـوورو خاوێنی خـۆی نیشان دەدات ، كەچی لێرەشدا فورستێ هاوڕی هەرقسەی بە توێكڵ بە روویدا هەڵدەداتو دەی ڕەنجێنێ .

### مۆكینبۆت بە چ ئەنجامێك دەگات ؟

لە دواپەردەی شانۆگەریەكەدا مۆكینبۆتو فـۆرست بە پەشۆكـاوی دەبینرێن ، فـۆرست لە سەر بـەدمەستی خـۆی بـەردەوامـە ، مـۆكینبـۆت هـەر ئـازار دەچێـژی بـۆیـە روو وەردەچەرخێنێو دەروات ، لەم ساتەدا دوو فریشتەی لێپەیدا دەبنو پێ‌دەڵێن :

حەیفو خەسارە بۆ ئەم كابرا بێبەختـە ، كە ڕێگـا بۆ خەڵكیتر ڕۆشن‌دەكاتەوە ، سەیركەن سەیر ئەم پیاوە خەریكە بزانێ چ لە دەوربەریدا هەیە ، وا خەریكە خۆی دەناسێ ، دەبێ لە ئەنجامدا لە هەموو كارەساتەكانی رزگاربێ .



# لـە سـلـێمـانـی

- ئاسۆس -

### « حـەمـە سـالح دیـلانی شـاعیـرو كـۆڕێكی ئـەدەبی » ڕۆشنبیری جەماوەر

ئێوارەی 29 / 9 / 1983 گوڵو ڕێحانەو درەختی لقو پۆپ سەوز لە باخچەی یەكێتی‌ی نووسەرانی كوردا لە پێشوازی ئەدیبـانو ڕووناكبیرانی شاری سلێمانیدا بوون ، بۆ ئامادە بوون لەكۆڕی شیعری شاعیری ناسراو مامۆستا حـەمە سـاڵح دیلانـا . كە بەریوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوە ر لەسلێمانی سازی كردبوو لەزنجیرەی كۆرەكانیو ئەوەندەی لەسەر كورسی دانیشتبوون بەقەدەر ئەوانیش بە پێوە ئەدەب دۆست وەستابوون سەرەڕای ژمارەیەكی زۆری لاوان كـە چوار مشقی لەسـەر چیمەنـەكە دانیشتبـوونو گوێیـان بۆ فـریشتەی شیعـر شلكـردبوو ، لەچوارو نیوی پاش نیوەڕۆدا مـامۆستـا عبدالله عـزیز خـالد كۆڕەكەی بەبەخێرهاتنی ئامادەبوان كردەوە ئەمجا كورتەیەكی ژیـانو بەرهـەمی ئـەدەبی دیـلانی بـاسكـرد ، دەربـارەی تاقیكردنەوەكانی شاعیرو دەنگی تایبەتی لەشیعری كوردیـدا دوا ، هەروەها پەنجەشی بۆ ئەو ئەدیبانە ڕاكێشا كەدەربارەی شیعری دیلان نووسیویانە بەتایبەتی شاعیر كاكـەی فەللاح . ئەمجا شاعیری پێشكەش كرد .

بێگومان زوربەی خوێنەرە بەرێزەكان دەزانن كەدیلانی شاعیر ساڵی 1927 لەشاری سلێمانی لەدایك بووەو لەتەمـەنی بیست ساڵیدا وازی لەخوێندن هێناوەو بوە بەفەرمانبەر تا ساڵی پار كە لەسـەر خواستی خـۆی خانـەنشین بـوو ، شاعـیر لەژیانیـا ئـەشكەنجـەو ئـازاری زۆری چێشتـوە ، سـاڵی 1979 تـووشی



نەخۆشییەکی سەخت بوو ، بۆ چارکردنی ڕۆیشت بۆپراگ ، دوای چاك بوونەوەی یەکەم شت کە بیری لێ کردەوە شیعر بوو ، ئەو شیعرەی هەر لەمناڵییەوە بۆتە هاوەڵی ئازیزی .
لەم ئێوارە کۆڕەدا «دیلان» ووتی : من شیعر لەکەسەوە فێر نەبووم هیچ شاعیرێك کاری تێ نەکردووم و کاری نەکردۆتە سەر ڕێبازی شیعرم ، لەبنەماڵەی خۆم و بەتایبەتی لەباوکمەوە « مەلا ئەحمەدی دیلان » شیعرم خۆش ویستوە ... ئەمجا ووتی : یەکەم جار کە دەستم دایە قەڵەم بەنیازی شیعر نووسین لە مانگی مارتی ساڵی 1948 دا بوو ، وەئەم شیعرەم نووسی :

منم بەدەستی چەرخەوە واگێژ ئەخۆم و ئەڕۆم
منم کە بوومە خوێنە خۆرو خوێنی خۆم ئەخۆم
منم لەبەحری خەیالاتی بێ ووچانی ماتەما
هەر پەل ئەگێڕم نەکەڵك و نەسوودو علاجە بۆم
زامدارە بولبول و لە دەوری گووڵ ئەکا ڕەقس و سەما
بەکەیلی ئەشکی سوورو سوێرو ئەسەف ، دەست و چاو ئەشۆم

کە ئەم شیعرەم پیشان بێکەسی نەمردا ، زۆری پێ خۆش بوو تەنانەت لەسەرەتادا لەگومانا بوو کەمن یەکەم هەنگاوم ئەم شیعرەبێ . داخی گرانم دوای چەند مانگێك لێك ترازاین ئەو بۆ کۆڕستان و من بۆ زیندان ، لەساڵی 1949 لەبەندیخانەی کووت [ دەمە تەقێی لاس و گوولم ] نووسی کەوتومە :

گووڵە باخ ئەم ساڵ شکاوە چڵی
وەنەوشە سیس و ژاکاوە گووڵی

لە 1950 دا ئەم شیعرەم ووت :

ئەی ئەوپەڕی شعورم
مەنزڵگای ڕێگای دوورم
ئاسۆو شەبەقی سوورم
مایەی شادی وسرورم

لە 952 کەلە کۆنگرەی ئاشتیخوازان لەڤیەنا گەڕامەوە بۆئەو کچە ئەڵما نیەی لەوێ بووە هاوڕێم ووتم :

تۆ بۆم بڵێ بەلەرەی لێو
لێوی ئاڵتر لەبەرگی سێو

لەساڵی 954 دا ئەم شیعرانەم بەرودوا لەرۆژنامەی ژینا بڵاوکردەوە ڕووناکی ، « مەبەسم لەم شیعرەدا ئەوە بوو کەدەبێ شیعر ئاراستەکەر بێ ،
گەشەدار بێ ، ئاودێری گووڵ بێ ، خونچە بپشکوێنێ .

ئەمجا « سروودی من » لەگەڵ چوونە پێشەوەی بزووتنەوەی نیشتمانیدا شیعری (کاروان) و (پلەی خەبات) م بڵاوکردەوە . لە ساڵی 1956 دا لە کۆچی دوایی شێخ مەحموودی نەمرا ، شیعرێکم بڵاوکردەوە ـ وەك تاقیکردنەوەیەکی نوێ لەشیعرا . لەساڵی 1957 لەسەر هەمان ڕێباز « دیسانەوە نەورۆز » م ووت هەر لەوساڵەدا بووکەووتم :

مامە کورپنوو ڕاکشاوی گردەکەی سەیوانەکەم
سەر ڕەحەت ، دڵ بێ گرێ ، گوێ شل کە بۆ داستانەکەم

تائەڵێم : وەك ووتم سەیرە لەبانە یاوەکو نالی ئەڵێ

زیندەگیم تاڵە کەزەلکاو بێ بەتیمار خانەکەم ..!

ـه 960 دا شیعری (من ئینسانم) ووت

( پێستم ڕەشە وەك شەوەزەنگ )

ـە (962) دا « دار بەڕوو » لەدواییدا « ڕەز » بڵاوکرانەوە دوای ئەم گەشتە بەگوڵزاری شیعرەنەتەوەیی‌و نیشتمانییەکانی دیلانا ژمارەیەکی زۆر پرسیاری ئاراستەکرا ، کەبەرو دوا وەلامی دانەوە .

## کۆڕی چیرۆك نووسەلاوەکان

لەژمارەی پیشوودا پەنجەمان بۆ ئەو ئێوارە کۆڕە ڕاکێشا بووکە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لەسلیمانی بۆ دوو چیرۆکنووسی لاوی ساز کردبوو ، بەنیازی ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز زیاتر چێژلەو کۆڕانە وەربگرن وە بەمەبەسی ئەوەی بزانین ڕۆشنبیرە لاوەکانی هاوتەمەنیان ڕایان بەرامبەر بەچیرۆکەکان و ڕەخنەکەی مامۆستا عبدالله طاهر چییە ، لە ڕووناکبیری لاو (کاك محمد عمر عثمان ) مان پرسی : ئاخۆ چۆن سەر جەم چیرۆکەکان‌و ڕەخنەکە هەڵدەسەنگێنی ؟ پرسیارەکەشمان بۆیە ئاراستەی ئەو برادەرە کرد چونکە یەکێ بوو لەوانەی کە لە کۆڕەکەدا سەرنجی خۆی دەربڕی .

لەوەلاما کاك محمد عمر عثمان ووتی :

کاك عبدالله طاهر ... لەسەرەتای ڕەخنەکەیدا بە شێوەیەکی کورت باسی هونەری چیرۆك بەگشتی‌و کورتە چیرۆکی کرد ئینجا هاتە سەر هەڵسەنگاندنی چیرۆکەکان ... ئەوەی زیاتر سەرنجی گوێگرانی ڕاکێشا ئەوەبوو دەیان وشەی عەرەبی بەکار هێنابوو هەرچەند خۆی ووتی بەزمانی عەرەبی خوێندویەتی‌و لەکوردی‌دا لاوازە نەهاتبوو پشت بەخوێنەوارێکی کورد ببەستێ‌و ئەو وشانەی بۆ بکات بەکوردی کەوەرگێڕانیان کارێکی ئاسانە ..

ئەوەی شایانی باسە لەکۆڕی چیرۆك خوێندنەوەدا .. گوێگر ناتوانێت تارادەیەکی باش چێژ لەو خوێندنەوەیە ببینێت چونکە ئەو هونەرەی چیرۆك پشتی پێ دەبەستێت وەکو بەکارهێنانی دیالۆگ‌و مەنەلۆج‌و کەوانەو نوختەو فاریزەو نیشانەی سەر سوڕمان‌و نیشانەی پرسیار لەکاتی خوێندنەوەدا بەباشی ناکەونەڕوو بەڵکو ئەشارێنەوە کورتە چیرۆك ساتێك لەساتەکانی



ژیانەو بەشێوە یەکی ڕێژەیی (نسبی) نەك ڕەها (مطلق) نابێت لەسنوری دیاری کراوی خۆی تێپەڕێت .

چیرۆکەکەی کاك ئاسۆ : ( تۆو دایەو شەوە ڕەشەکان ) لە بابەتێکی کۆنی کۆمەلایەتی ئەدوا .. دایکێکی پێشێل‌کراو باوکێکی دڵڕەق‌و کچێکیان کەپاڵەوانی چیرۆکەکە بوو هەر لەمناڵیێ وە بەهۆی (اغتصاب) کردنیەوە لەتەمەنی (9)ساڵیدا کە ئەمە ناچێتە عەقلەوە .. ( چونکە ئەم کارە ئەبێت بە هۆی‌مردنی مندالەکە ) توشی گرێیەکی دەروونی هاتبوو لەئەنجامی ئەوکارەو لە دەست دانی کچێنی‌دا ساڵانێکی درێژ بەئازارەوە ئەتلێتەوە تاڵە خۆشەویستی کوڕێکدا هەموو ڕابردووی تاڵی بیر ئەچێتەوە ئەمەشی لەبەشی سێ هەمی چێرکەکەدا ڕوونەدات .

بەش‌کردنی چیرۆك بەقۆناغ لەکورتە چیرۆکدا بەبێ ڕێ خۆش کردنی زانستیانە کارێکی نەشیاوەو بەڵکو دابەش کردنی چێرۆك بە چەند بەشێکەوە زیاتر بۆ بابەتی ڕۆمان ئەشێت ئەویش بێ ئەوەی زنجیرەی ڕوداوەکان لەیەکتری بپچڕێت .

چیرۆك نووس بابەتێکی کۆنی هێنا بۆوە گۆڕ بەبێ ئەوەی بتوانێت مامە لەیەکی هاوچەرخانەی لەگەڵ بکات . ئەمەوێ بڵێم هەندێ بابەت کەپەیوەندیەکی زیندویان هەیە بەژیانەوە لەڕەوت‌و خودی مرۆڤا هەرگیز کۆن‌نابن .. ئەگەر وابوایە ئەوا



هونەری چیرۆك نوسین لەجیهانا بەنوسینی چیروکیك لەسەر خۆشەویستی یان برسێتی یان جەنگ کۆتایی ئەهات ... لەسەرانسەری ئەدەبی میللەتاندا هەزارەها چیرۆك لەسەر خۆشەویستی نوسراوە .. چونکە شتێکی زیندووەو کۆن نابێت هەر نوسەرەش بەشێوەی جیا لەوی تر تەعبیری لێکردووە هەر یەکەشیان ڕوبارێکەو بەهەموشیان ئەڕژێنە یەك دەریاوە .

نووسەر نەهاتبوو کەباسی ترس یان خەمی لەگیانی پالەوانەکەدا ئەکرد لەجیاتی ئەوەی بلێ ترسایت بەشێوەیەکی بەرجەستە (مجسم) باسی بکات ئەویش بەنیشاندانی نیشانەکانی ئەو ترسە وەکو ... شلەژان .. ڕەنگ تێکچوون ... بورانەوە .... هتد وەهەروەها ئەمرۆ ئاسۆی چیرۆك نوسین فراوانتر بوە هەندێ هونەری تازە لەوانەش بەکار هێنانی شەپۆلی هۆش (تیارالوعی) لەرۆمانا کە ئەمرۆ لەکورتە چیرۆکیشا بەکاردێت .. ئەم هونەرە مەودای زەمەنی لەچیرۆکدا کەم ئەکاتەوە . نوسەرێکی وەك جیمس جویس لە ڕۆمانی (یولوسیسی) دا کە زیاد لە (17) سال پێوەی خەریك بوو تەنها (24) سەعاتی ژیانی پالەوانەکەی ئەگێرێتەوە . چیرۆکەکەی کاك ئاسۆ لەسنوری کورتە چیرۆك چوبوە دەرەوەو جگە لەهەلەی دارشتن و زمانەوانی کەوتبوە هەلەوە لە بەکارهێنانی هەندێ واتادا وەکو ئەوەی ئەلێ : ( دیوجامەیەکەو ئیسك و پروسکت تێك ئەشکێنێ ) زۆربەمان ئەزانین دیوجامە قوماشێکی ڕەنگاو ڕەنگەو لەڕاوەکەودا بەکاردێت .. بەهۆی ڕەنگەکانیەوە کەو لەدەوری کۆئەبێتەوە ڕاوچیش لەوکونەوە کەتیا ئەهیلرێتەوە لولەی تفەنگەکەی دێنێتە دەرەوە لەپشت دیوجامە کەوە خۆی ئەشارێتەوەو ئیسك و پروسك ناشکێنێ ..

چیرۆکەکەی کاك (بکر حسن) یش کەخۆی ئامادە نەبوولەلایەن کاك جەمال غەمبارەو خوێندرایەوەو لەژێر ناو نیشانی (حەیران) دا بوو زیاتر لە بیرۆکەیەك (خاطرە) ئەچوو ... هەندێ شتی نەگونجاوی تیابوو وەکو ئەلێ ( هۆرنی ئوتومبیلەکان هی‌منن ) ئەو پارچە شیعرەش کە بەناوی (حەیران) ەوە لەچیرۆکەکەیدا نوسیبوی گویگر چێژی لێ‌نەئەبینی ..

ئەدەب بەپیری وگەنجی‌نیە .. ئەدەبێك نیە لە جیهانا پێی بوترێت ئەدەبی لاوان و ئەدەبێکی‌تر ئەدەبی پیران یەکێکی وەکو میخائیل لێرمنتۆف یەکەم ڕۆمانی لە تەمەنی (24) سالیدا نوسیوە گەرچی ئەمەش پەیوەندی بەتوانای کەسی و ئەو دەوروبەرەشەوە هەیە کەنووسەر تیایا چاو ئەکاتەوە ئەم دوو لاوەش لە سەرەتادان و پێویستیان بە خۆ قال کردن هەیە و کورد وتەنی سوار تانەگلێ نابێ بە سوار .. گاگۆلکێش یەکەم هەنگاوی پێ گرتنە ..

## کۆرێك بۆ لێکۆلینەوە دەربارەی شانۆییی «میراتی»

لە کۆتایی تشرینی یەکەمدا بەرێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لەسلێمانی هۆلی نەقابەی کرێکارانا کۆرێکی بۆ لێکۆلینەوە دەربارەی شانۆییی (میراتی) سازکرد .

شیاوی باسە «میراتی» لەنووسینی مامۆستا قاسم محمدەو مامۆستا حەمە رەشید هەرەس گۆڕیویەتیە سەر زمانی کوردی ، ئەم شانۆییە کۆمەلی هونەرە جوانەکان لە 1983/9/6 و ڕۆژانی لەوەو دوا لەسەر شانۆی قوتابخانەی ئامادەیی لە دەرهێنانی مامۆستا طە خلیل پێشکەشیان کرد .

ئێوارەی 1983/10/27 مامۆستا کەمال هەنجیرەییی دەربارەی ئەم شانۆییە بەتایبەتی سەبارەت بەوەرگێرانەکەی باسێکی پێشکەش کرد .

لەسەرەتادا ووتی : نیازمان وابوو کە بەهاوکاری برادەرم کاك ئەحمەدئابلاخی پێکەوە ئەم کۆڕە پێشکەش بکەین ، هەر یەکەمان دەربارەی لایەنێکی بدوێین ، بەلام لەبەر هەندێ هۆ بەتەنیا خۆم مامەوە .

ئەمجا ووتی : ئاواتە خواز بووم کە کاك حەمە رەشید هەرەس لەم کۆڕەدا ئامادە بوایە بۆ ئەوەی وەلامی چەند پرسیارێکم بداتەوە .

دوای ئەم پێشەکییانە کەوتە خوێندنەوەی باسەکەی و ووتی : وەرگێران دەبێ بێ دەستکاری بێ و دەقەکە وەك خۆی بگۆڕرێتە سەر زمانێکی تر ، بەلام ئەگەر دەستکاری کرا دەبێ بوترێ ( بەدەستکاریەوە کراوە بەکوردی ) ئەگەر ئامادەکردنیش بێ ئەوا گەلێ باری سەرنجی وەرگێر تێکەل بەدەقەکە ئەبێ ، لەوانەیە تەنیا هێلە سەرەکییەکە بپارێزرێ ، بەلام لە (میراتی) دا ئەوە بەدی ناکرێ چونکە وای لێهاتوە کە وەرگێڕراوەکە لەدەقەکە وە زۆر دووره . لەدواییدا چەند خالێکی دەست نیشان کرد کە جێی رەخنەن لەمیراتیدا :
وەك « بوونی شەکەرۆکە » ، « خۆشەویست کردنی ئاغای چەوسێنەر بەدابەشینی جەژنانە » ، مردنی ئاغاو شەکەرۆکە بەرو دوا ، کۆیلەیی لەقۆناغێکدا کە کۆیلەیەتی تیانییە ، نەش و نما کردنی هێلی درامی لەکێشەی چینایەتیدا ، ووشەکانی شەکەرۆکەو نەگونجاندنیان لەگەل کارەکەیدا ، هاتوو چۆی کارەکەر بۆ دیوەخان ، دەوری گۆرانی بێژەکان و شیعر ووتنەکەیان ، هەلگەرانەوەی قەمووری کوری ئاغا لەداب و نەریتی دەربەگایەتی لەکاتێکدا چەند شەوێ لەوەو بەر لەباوکی ستەمکارتر بوو بەرامبەر بە شەکەرۆکە ، تا ... د

هەروەها تێبینیشی بەرامبەر بە دەرهێنان و رووناکی و مۆسیقای تصویری شانۆنامەکە هەبوو .

لەدوای تەواوبوونی باسەکە : چەند کەسێ لە دانیشتوان باری سەرنجی خۆیان بەرامبەر بەشانۆییەکەو وەرگێرانەکەو باسەکەی مامۆستا کەمال پێشاندا لەوانە : حەسیب قەرەداخی ، مستەفا سالحکەریم ، طە خلیل ، حکمت هندي ، یاسین بەرزنجی .

مامۆستا طە خلیل بەوبۆنەیەوە کەدەرهێنەری شانۆییەکە بووە لەگەلێ شوێندا بەراو بۆچوونەکانی کاك کەمال هەنجیرەیی قایل نەبوو ، هەر چۆنێ بێ کۆرەکە سەرەتایەکی باش بوو



بۆلێدوان و لێکۆلینەوە دەربارەی کارە هونەرییەکانی تیپ و کۆمەلە هونەرییەکان . ئەم کۆڕە هونەرمەند جەلیل زەنگەنە بەرێوەی دەبرد .

**« مال ئاوا ئەی شاعیران »**

« ڤان کۆخ » ئەو هونەرمەندە مەزنەی تەنیا 37 سال چاوی بەجیهانا گێرا ئەو بلیمەتەی کەلەژیانیا تووشی گەلێ دەردی سەری بوو ، ماوەیەکی زۆر لەکانە خەلووزەکاندا لەگەل کرێکارانی بەلچیکادا چەوسایەوە ئەو هونەرمەندە ناسکەی بۆ قایل کردنی دلی خۆشەویستەکەی گوێچکەیەکی خۆی بری و بەدیاری پێشکەشی بە خانمۆلەکەی کرد ژیانی ئەم هونەرمەندە رۆژی 10/10/1983 و رۆژانی لەوەو دوایی لەیەك پەردەی شانۆییدا لەسەر شانۆی مەلبەندی چالاکییەکان لەلایەن تیپی نواندنی سەر بە [ بەرێوەبەرێتی رۆشنبیری جەماوەر ] هوە پێشکەش کرا ئەم شانۆنامەیە لەنووسینی نووسەری بەناوبانگ مامۆستا جەلیل قەیسی یە کاك ئازاد عبدالله گوریویە بۆ کوردی و کاك بەکر رەشیدیش دەرهێنەری بوو
کاك رێبوار حسین دەوری ڤان کۆخی دەبینی
خۆشکە روناك ئەمین لەدەوری جۆلیادا بوو

کاک ئەحمەد رەئوف دەوری هۆراس و کاک ئیبراهیم مەولود حەمە عەلی دەوری پیرەمێردەکەو خوشکە نیان عەلی لەدەوری ئافرەتەکەدا بوو . لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم هونەرمەندە لاوانە هەوڵیان دابوو کارێکی هونەری پوخت پێشکەش بکەن ، بەلام لەراستیدا ئەم جۆرە شانۆییە یەك پەردانە بۆ میهرەجانی قوتابخانەکان زیاتر دەست دەدات نەك بۆ پیشاندانی جەماوەرو بۆ چەند رۆژێك .

هیوادارین ئەم تیپە لەدوارۆژا سەر کەوتوو تربێ و شانۆیی پەسندترو باشتر پێشکەش بکەن .

## دوا کۆری وەرزی رۆشنبیری دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی لە سلێمانی

دوا ئەلقەی ئەو زنجیرە کۆڕانەی لقی دەزگای رۆشنبیری و بلاو کردنەوەی کوردی لەسلێمانی پێشکەشی کرد ، کۆرێك بوو دەربارەی مێژووی شانۆی کوردی کەئێوارەی 19 / 10 / 1983 لە لایەن کاك(عمر محمد صالح)ە وە باسێکی تێدا پێشکەش کرا دەربارەی مێژووی پەیدابوونی نووسینی شانۆی کوردی و یەکەم نواندنی شانۆی کوردی و سەرەتای چاپەمەنی شانۆی کوردی .

لەراستیدا ئەم باسە زۆر گرنگە بۆیە لێدوانیش لەسەری ئەبێ قووڵ و زانستانەبێ و پشت بەگەلێ سەرچاوەی واوە ببەستری کەباسەکەی پێ بەپێزبێ .

ئەو کەلێنانەی لەوباسەدا بوون پێویستیان بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی هەیەو لێرەدا بواری ئەوە نییە مافی خۆیان بدرێتی ئەو برایانەی سەرنج و تێبینی یان دەربارەی باسەکە دەربڕی ئەمانە بوون : یاسین بەرزنجی و بەیاد عەبدولقادرو شەفیق محمدو چەند برایەکی تریش .

هیوا دارین کاك عمر پوخت ترو چرتر دەربارەی مێژوو سەرەتاو رێچکەی « شانۆی کوردی » لە کوردستانی عیراقا باسێك بەجیاواز ئامادە بکات و لەکۆرێکی وا داپێشکەشی بکات کە ئەوانەی خولیای مێژووی شانۆی کوردییان هەیە تێیدا بەشدارین . ئەم کۆرە کاك لەتیف هەڵمەتی شاعیر هەڵسوورێنەری بوو .



## پرۆژەیەکی نوێی بەرێوەبەرێتی رۆشنبیری جەماوەر لەسلێمانی

ماوەی ساڵێك زیاترە بەرێوەبەرێتی رۆشنبیری جەماوەر لەسلێمانی نەخشەی پرۆژەیەکی ئەدەبی گرنگی بەدەستەوەیە دەربارەی تۆمار کردنی چاوپێکەوتنی تایبەتی و گفتوگۆ لەگەڵ شاعیران و ئەدیبانی کوردا بە ڤیدیۆ ، بۆ ئەوەی لەئەرشیفی تایبەتی بەشی رۆشنبیری بەرێوە بەرایەتیدا بمێنێتەوە .

سەرەتای ئەم پرۆژەیە رۆژی 13 / 10 / 1983 سەری هەڵهێنا بۆئەم مەبەسەش چاوپێکەوتنێکی تایبەتی لەگەڵ « ئەحۆڵ » ی شاعیردا تۆمارکرا ، ئەوانەی بەشدارییان لەوگفتوگۆیەدا کرد : مامۆستا کاکەی فەللاح و کاك جەمال غەمبارو کاك فاضل علی عباس بوون بەهیوای ئەوەی کە لیژنەی رۆشنبیری لەسەر ئەم کارە گرنگەی بەردەوام بێ و « کتێبخانەیەکی تایبەتی لە ڤیدیۆ کاسێت بۆ ئەم مەبەسە پێکەوەبنێ : پێشنیازیش دەکەین کە بەدەستوبرد چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەدیبان مامۆستایان شێخ محمدی خاڵ و محمد مستەفا کوردی و ئەحمەد هەردی و عەلی عارف ئاغا تۆمارکەن ، ئەمجا بەنۆرەو بەپێی دەرفەت لەگەڵ شاعیران و ئەدیبە ناسراوەکانمان لەم جۆرە گفتوگۆیە بەدەنگو بەوێنەوە تۆمار بکرێ و بپارێزرێ .



# لـــه دهــــــوّلــــك

ژ ئامادەكردنا : مەتين

**راوستيانەك لگەل‌چيروكا لە عليخانا گوڤەيى**

ل روّژا چـار شه .ىّ 17/8/1983 ، هـژمـارەكـا مـەزن ژگەنجێت دهوكىّ ، ژئـەديبو ئەدەب ـ يستـان ، نێزيكى دوو سـەعەتـا ، لميهڤان دارىـيا ئـەديبىّ بـرومـەت « صـديق شرو » ى بون . لباخچىّ يانا نوهـەدرا . ئو لگـەل چيروكا لەعليخانا گوڤەيى . ئەڤ بزاڤە ئێكە ژچالاكيێد بـەردەوام ييد ريڤەبەرىيا رەوشەنبيريا جەماوەرى لدهوكىّ ، بهەلكەفتنا سەركەتنيّد لەشكەرىّ مە دژى خومەينيىّ خوين مێژ . پشتى بخێر هاتنا كاك « حجى جعفر » ى ب ميهڤانيـد هێژا كـرى . سەيدا « خـالد حسين » ريبـەرىّ ريڤەبـەريا رەوشـەنبيريـا جەماوەرى ، بخـێر هاتن‌و ريـزگرتن لحـازرا كرو دەرگـەهىّ كورانگەهىّ ڤەكر .

لپێشيى كاك « صديق » لسەر فولكلور مێژووا فولكلورى ئاخفت ژسەدا هەژدىّ ئو هەتا نهو . بكورتى بەحسىّ وان زانا كر ، ئـەويّد بـكـومكرنـا فولكلورى رابـوين ، لئەورپـاو لدەڤەرا عـەرەبى . هەر وسـا خەمخـوريـد ڤى لايى لنـاف كـوردان دياركرن . نولا حاجى جندى ، قەناتىّ كوردو ، مەلا مەحمودىّ بايەزيدى . محمد توفيق وردى ، مەلا محمودىّ ديرشـەوى ، حسـ عبدالله زدرو وه گـەلەكيّد دى . پشتى هينگىّ لسـەر ىـەـسنيـ توردى نـاخڤت ، ئو خـويا كـر كه هـەتا نهـه ، چ ـىـەليىـ اىلى لسەر فولكلورى ، مه نەديتينه . لەما پىّتڤى‌يه ىەىىو ىيته ىغيسىـ‌و كريـدان ب كومـەلى‌ڤه ، دا سـودو مفا ـ ـ سىتى ـ ى ىيته ودرگرتن .

ـىں كاك صديق . سەركەته بێلايا لەعليخانىّ ئو ل هـەمى ڤولاجكيـ بيلايى كەريا . لڤيرىّ يافەره بێته دياركرن ، كوئەڤ چيروكە سەيد مصطفى نورى بامەرنى كومكريەو چاپ كريە . سەيدايى صديق بابەتىّ خو رندو جوان لسـەر سىّ خالا ليكڤەكر نەو ژى نەڤەنە :

1 – **دەم‌و جهو قارەمانيّل چيروكىّ** : جهىّ چيروكىّ گـوندىّ گوڤى‌يە دكەڤيتە سەر روبيارىّ گومل نێزيكى باژێرى شێخانىّ . هـەر وەكى كاك « صـديق » ى ديار كـرى . وه ژقارەمـانيد چيروكىّ « حسن ئاغا » مەزنەكىّ عێلەكا كوردايە ل كوردستانا توركيا . ژوێرىّ هاتيە گوندىّ گوڤىّ‌و لەعليخانا ژخورا ديتى . ب كورتى سەيدايى بەحسىّ مێـژووا بنەمـالا « حسن » ى كر . ددويڤدا كره بەحسىّ دەمىّ چيروكىّ‌و گوت : ژكريارو بەلگەيّد ئـاخڤتنىّ دچيـروكىّدا ، مـروڤ دشێت ب سـەر دەمىّ وىّ هەلبيت ، ئەوژى چاخىّ قوناغا دەولەتـا ئوسمـالى‌يە نيـزيكى بەرى 90 سالا .

2 – **دلدارى‌و ئـەڤـين دچيـروكىّدا** : ڤىّ چيـروكىّ تـەڤنىّ دلدارىّ راچـانديـه ، كاك « صـديق » ئەڤ چـەنده گـوت‌و روناهيەك بەردا سەر كارتێكرنا ئەڤينىّ دكومەلىدا . ئو پيچەكىّ لگەل ئەفلاتونى راوستيا چەند گوّتنەكيّد وى دراستا دلدارى‌و ئەڤينىّدا بو مه خاندن . پاش چەند چيروكەكيّد جيهانى لگەل چيروكا لەعليخانىّ بەراورد كرن ئو گوّت : ئەڤ چيروكه يا ب سەركەفتى‌تره ژگەلە چيروكا ژڤانا .

ئەڤينا لەعليخانىّ دگەل مێرچاكى‌و ماقويلىيا حسن ئاغايى بومه زل‌و بەرب‌چاڤ كرن وه كره بەحسىّ ئاستەنگيّد دكەتينه دريّكا ڤىّ ئەڤينىّدا .

3 – **خـرابى‌و قەنجى دچيـروكىّدا** : هێزا قـەنجيى‌و هيـزا





خرابیێ وکه‌سێد هه‌ر هێزه‌کێ دچیروکێ‌دا . ئو هه‌ڤرکییا دناف به‌را وان‌دا دانه دیار کرن . پاشی ده‌مه‌کی ، روناهی ئێخسته حسن ئاغای . وه‌ ئه‌گه‌رێد ڤه‌قه‌تیان‌و تورسکینا وی ژکومه‌لی بو سروشتی ، ئه‌و ژی ده‌ینانه پێش چاڤێد مه . ل سه‌ر کریارێد چیروکێ کاك « صدیق » ی گوت : گه‌له‌ك کریارێد هێـژا دڤێ چیروکێ‌دا ییێد هه‌ین کومه‌ل سودو مفای دێ ژێ وه‌رگردیت . بڤێ چه‌ندێ سـه‌یدایی گـوتارا خـو ب دویماهی ئینـاو کلیلا ده‌رگه‌هێ ئاخفتنێ دا ده‌ستێ کاك « حجی جعفر » ی پاشی ڤان براده‌را پشکداری دگێنگه‌شێ‌دا کر ، کـاك رێکێش ئامێـدی ، انور ، جحی ، عبدالکریم ، هه‌ر ئێکی ژلایێ خوڤه تیشکـه‌کا روناهیێ بسه‌ر چیروکێ‌دا به‌ردا ، چ کونجالك ژێ نه هێلانـه دتاریێ‌دا . سه‌یدایێ « صدیق » ژی ب‌مـل به‌حنی بـه‌رسڤا پسیارا دا وه‌لگه‌ل براده‌را که‌ته گێنگه‌شێ . کاك « صدیق » یا راست یێ بسه‌رکه‌تی بو دبابه‌تێ خودا ، هه‌ر وه‌کی مه ل تم هوسا دیتی لێ لێگـرتنا مـه ل سه‌ر ئـه‌وه ئه‌م دبیـژین دا یێ ب‌سه‌رکه‌تی تر بیت ، هه‌که تێرادیتنا خو لسه‌ر هنده سـه‌ره کانێد دی ژی کربا ، ل خو خرکربان لسه‌ر ڤێ چیروکێ . نه‌کو یێ که‌تیه ئالوزیا ، نه‌خێ . وه‌لێ ب ڤێ بێ‌کولێ دا پتر بابه‌تی ب‌هێـز ئێخیت‌و ده‌وله‌مـه‌نـدتـر لێ کـه‌ت . ژبـل راستێـد دگه‌هه‌شتێ ، ژناڤێد که‌سانێد چیروکێ‌و ده‌م جهـوارێد وێ ، هه‌ر وسا په‌یڤ‌و کریارێد هاتین‌و چێبوین . لگه‌ل رێزو سوپاسیا لسـه‌ر زه‌ڤه‌رو وه‌ستیـانا سـه‌یدایی درێکـا به‌رزو بلنـدکرنـا مه‌شخه‌لا په‌یڤا کوردی یا ره‌سه‌ن .

### تێکسته‌کا فولکلوری دکوره‌کا نافخوییی‌دا

ل روژا پێنج شه‌مبێ ل 1983/8/18 کاك « حاجی عبدالله » ی کوره‌کا نافخوییی پێش کر . ئه‌ڤه‌ژی ئێکه ژبزاڤا به‌رده‌وام ، یا ئێکه‌تیا نفیسه‌ڤانێت کورد ، تایێ دهوکێ . کورێ ئه‌ڤرول سه‌ر چیرووکه‌کـا فولکلوریـه لبن ناڤ‌و نیشـانێت « عه‌یشـا بیبیێ‌و ئه‌حمه‌دێ بانی » لپێشیێ سه‌یدا حاجی گوت : کو ئه‌ڤ چیروکه ب سترانکی هاتیه گوتن یا پێك هاتیه ژ 756 دێرکێت هوزانی . ورگریته ژزار ده‌ڤێ سـتـران بێژێ خـودێ لێ خوش « حیـدر باجلوری » .

ب دوو تا هاتیه گوتن . سه‌یدا «حاجی» تایه‌ك وه‌رگرت‌و ل سه‌ر ئاخفت . ژخاندنا وی دیاربو کو ئه‌ڤ چیروکه ئێکه ژچیروکێت فولکلوری بیت تراژیدی ، دلێ دوو ئه‌ڤیندارا پێکڤه دنویسێت‌و دویماهیێ ناگه‌هنه مرازێ .

بێ گومان چیروکێت ژڤی توخمی گـه‌له‌ك ب بهانـه ، نه‌مـازه ره‌نگه‌کێ تورێ مللیێ تایبه‌تیه ، ل ده‌ف چ مللـه‌تا ژبلی کوردا ، هه‌تا نهو نه هاتیه دیتن . تایبه‌تیا ڤان چیروکا دکیرێ دایه . ب چیروکی تێنه گوتن ، ئو دناڤ چیروکێ‌دا ستران ژی تێنه گوتن ئو ب ڤێ ده‌ست‌و داری هه‌تا چیروك ب‌کوتایی تێت . پشتی کاك حاجی چیروك ب قاره‌مان‌و کریارڤه دانه به‌ر روناهیه‌کا گه‌ش سـه‌یدا صـدیق شرو ، حجی جعفـر ، انور محمـد طاهـر ، عبدالرحمن مزویری ، عبدالکریم فندی ئو هنده براده‌رێت دی ئاخفتن ل سه‌ر چه‌ند لایه‌کێت چیروکێ ، ئو دل خوشیا خو دیار کرن بو حاجی‌و کارێ خو پێڤه مه‌زخاندی ، ژبو رێك‌و پێك کرنا تێکسته‌کا فولکلوریا نوی . پاکو ژین بارێ تاریێ ئینایه ده‌ر .

### شانوگه‌ریا گازیه‌ك ژکاوه‌ی

ل روژا 22/8/1983 ئێکـه‌تیا گشتی یـا لاوێت عیراقێ ل دهوکێ تیپا شانووا بزاڤ ، شانوگه‌ریه‌ك پێش کێش کر ل ژێر نـاڤێ «گازیـه‌ك ژکاوه‌ی» ل هـولا سه‌لاحـه‌دین . هژمـاره‌کا به‌رسیاراو توره‌ڤان‌و ره‌وشه‌نبیرا وه جه‌ماوه‌ره‌کێ به‌رفره‌هه لڤێ شانوگه‌ریێ ئاماده‌بون .

کاك « عبدالله اسماعیل » ئه‌ڤ شانـوگه‌ریـه نفیسیه ، وژده‌رهێنانا « ئازاد عبدالله » یه . ده‌رباری ڤی بـه‌رهه‌می ، تیپا بزاڤ گوتنه‌ك ژجه‌ماوه‌ری‌را پێش‌کێش کـر تێدا هـاتیه «ئه‌ژده‌هاك .. کاوه .. شوره‌ش .. ئـه‌رێ ئه‌ڤ تشتـه هه‌می راستن ؟ کی یێ رابویه ؟ دژی کێ ؟ هه‌تا نهو ئه‌ڤ تشته یێ شێلیه وه‌ه‌ر مله‌ته‌کێ روژهه‌لاتی بو خود دانیت . مله‌تێ کورد



ـِی کوئێکە ژوان ملەتا ، ب بال خوڤە دکێشیت . مەرەما مە ئەو
ـینە ئەم ڤی تشتی دیارکەین ، لێ مە دڤێت ئەم چاکیی و خرابیێ
ـشکرا کەین و خویا کەین کو سەرکەفتنا د ئێکەتیێ دا دژی هەر
ـەیارەکێ بیت » . هێژایێت پشکداری دڤێ چالاکیێ دا کرین ،
ـموریێت وان بڤی شێوەی بون :

| | |
|---|---|
| محەمەد عەبدلا | زەلامێ (1) وەزیر |
| لوقمان طەیب | زەلامێ (2) کاوە |
| عسمەت مویسا | زەلامێ (3) |
| عەبدلوەهاب خالد | زەلامێ (4) |
| عەبدلسەلام عەبدلقادر | زەلامێ (5) |
| خالد عەگید | زەلامێ (6) |
| رفعەت رەجب | ئەژدەهاك |
| ئازاد محەمەد | نوبەدار (1) |
| محەمەد سەلیم | نوبەدار (2) |
| دلوڤان حافز | گزیر / جەلاد |
| لوقمان مستەفا | حەکیمێ قەسرێ / مەلا (1) |
| شەعبان عەمەر | حەکیمێ پیر / مەلا (2) |
| سماهیل محەمەد | زەلام |

براستی ئەڤ بزاڤە ، جهێ رێزو ئافەرینێ‌نە وە ژگش ژەخ و ڕویاڤە . لوکا هونەری یا تێگستێ گەلەکا ب سەرکەفتی بو . دیسا ئەکتەر ددەوریێت خو دا ، گەلەك دباش و پێ چێبوی‌بون نەمازە کاك « رفعت رجب » وە لوقمان طەیب . موسیقەو دەنگ دەینانا وا لگەل لڤلڤین و کریارا ، دەینانەکا دەست هەل و دجهێ خو دا بو ، هێزەکا مەزن هەبو لگەل ئەگەریێت دی یێت سەرکەتنا شانوگەریێ . پێدڤی‌یە ئەم دیار کەین کو شانوگەریێ شییا ، ب شێوەکی جوان و ژی هاتی باسێ دیروکا کەڤن بکەت و وە ب ڤی سەردەمی ڤە گریدەت . لدویماهیکی جەماوەری پیروزباهیێت گەرم پێش کێش تیپێ کرن . ژلایەکێ دی ڤە ، ژبو وەرگرتنا مفای ژبیرو رایێت جەماوەری ، لسەر ڤێ شانوگەریێ وبزاڤا تیپێ ب گشتی . پەرك هاتنە بەلاڤەکرن وەجەماوەری بیرو رایێت خو ل سەر مالکێت تێدا دیارکرن ، وەلتیپێ زڤراندنە ڤە . ئەڤە ژی کارەکێ باشە هاریکاریەکا موکم پەیدا دکەت ل ناڤبەرا ئەکتەراو جەماوەدی . کێم وکاسییێت بوین ، لایێ ب هێزو سەرکەتی ، ئەڤنە گش لڤێرێ دکەڤنە سەر بەرکێ . پیروزباهی بو دەرهێنەری کاك « ئازاد عەبدلا » وە هەمی برادەرێت بشکداری دڤی کاری دا کری .

## سێ چیروك و ڕەخنە

ل روژا پێنج شەمبێ 25 / 8 / 1983 کوڕانگەهەکا دی یا نافخویی ، ژبزاڤێت ئێکەتیا نڤیسەڤانێت کورد تایێ دهوکێ ، هاتە پێش کێش کرن ، ژلایی سەیدایێ هێژاڤە ، «صدیق شرو» ی ل ژێر ناڤێ «سێ چیروك و ڕەخنە» هژمارەکا ئەدیب و ڕەوشەنبیرا لێ حازربون . کاك «احمد عبدالله زەرو» ی کوڕانگە برێڤەبر .

ل پێشیێ کاك صدیق ل سەر قوتابخانێت ڕەخنێ ئاخفت ، وە دەورێ ڕەخنەگری و سالوقەتێت وی تڤی‌یا دچاوا بن . وە شیان و ئامیرەتێت ئەو بێدڤی ، ژبو راست ئینانا کاری ڕەخنەگریێ . ددویڤدا سێ چیروك نڤیسا چیروکێت خو خاندن .

(1) چیروك نڤیس — کاك أنور محمد طاهر ، چیروکا « دزێت شەڤێ »
(2) چیروك نڤیس — کاك رشید فندي ، چیروکا « کەپر »
(3) چیروك نڤیس — کاك نجیب صالح ، چیروکا «کولیلك»

پشتی خاندنا هەرسێ چیروکا ، سەیدا « صدیق » ی دەست هاڤێتێ ئەڤ چیروکە هەلسەنگاند هەلسەنگاندنەکا زانایی ب شەهرەزایی و پێ چێبونەکا دیار ، ژگش لایاڤە ، روخسار ، ناڤەروك ، تەکنیك و هونەرێ کورتە چیروکێ . لایێت

گەش و رون دەست دەینا سەر ، هەروسا لایت لەنگو لاوازژی دانە کفشێ نەمازە بێ هێزیێیا هندەك ویناو گوتنا ، ئەڤێت دڤان چیروکادا هاتین . پاشی گێنگەشەکا بەرفرهە هاتە کرن لسەر رەخنەگری ئو هەرسێ چیروك نڤیسا ، گەلەك برادەرا پشکداری تێدا کر وەکی عبدالکریم فندی ، وصفی ردینێ ، نزار محمد سعید ، شڤان علی ، حجی جعفر ، جلال محمد . ئاخفتن لسەر ناڤەروکا چیروکا ، وە هندە حوکمێت سەیدایی رەخنەگر . چەند روناهیەك ل بابەتی هەلکرن . لبەری هەمیا کاك «عبدالکریم فندی» ئاخفتنەکا گەلە دجهێ خودا گوت : «یا پێدڤی بو کو کاك صدیق لسەر قاعیدەکێ ئەڤ چیروکە هەلسەنگاندبان . هەر لایەك جودا جودا کرتباو لسەر ئاخفتبا ، روخسار ، ناڤەروك ، کەس ، تەکنیکا چیروکا» لدویماهیکی چیروك نڤیس هاتنە گوڤەندی وە ب ملبەحنی پەیڤێت برادەرا وەرگرتن . وە بکورتی لسەر بیرو رایێت وان پەیڤین دەرهەقا چیروکێت خودا ، ژلایی خو ڤە گەلەك زێدەهێت نوی ل خەملا کورانگەهێ زێدە کرن .

## دگەل شانوگەریا رەنی

رێڤەبەریا لاوا لدهوکێ بنگەها دهوکێ ، پشکا ندواندنێ شانوگەریا رەنی پێش کێش کر ، لروژێت 25 ، 26 ، 27 / 8 / 1983 . ژئامادە کرنو دەرهێنا هونەرمەندێ هێژا کرمانج .

یا جوانو دجهێ خو دا بو ، کو ڤێ شانوگەریێ ملێت ئەکتەرو بینەرا دانە ئێك وە چ تخویب لناڤبەرێ نەهێلان . دێ بێژی بینەر ژی ئەکتەربون . هوسا بیرو باوەرێت شانوگەریێ ، دێ هێسا دمێشکێ بینەرادا هێنەچاندن و رهێت خو کویر هاژون ڤێ شانوگەریێ بئاوایەکێ ژێ هاتی ، دەمێ رابوری وەرگریتە ، ژبو نهو ڤی سەر دەمی . شانوگەری باسێ زەڤەرو خەبات و پێکولێ دکەت ، دژی زورداری و بێدادیێ ، وە کارێت نەمروڤانە ، ئەڤێت میر پێ رادبو . ڤێ چەندێ ئاگرێ رابون و مێرانیێ هەلکر . هەتا کو لدویماهیێ میر وەلێ هاتی ، ئێلچی و هەڤال و هوگرو کرێ گرتێت وی ژی ژێڤە دبن . برادەرێت دشانوگەریێدا دەرکەتین دەورێت وان بڤی شێوەی بون :

| | |
|---|---|
| (1) کامیران لەزگین | مەم |
| (2) موفق رشدی | لێبوك |
| (3) مەهدی محەمەد سەلیم | شێرکو |
| (4) ماجد محەمەد وەیس | بکو |
| (5) شکری محەمەد طه | زیرەڤان |
| (6) ڤیران فرج | بەنگین |
| (7) عبدالله هرور | میر |
| (8) ئازاد عبدالغفار | عبدالله |
| (9) مهدي احمد | سەروکێ چەکدارا |
| (10) خضر عبدالسلام | تاجدین |
| (11) احسان عثمان | کوشتی |
| (12) ماجد نوری | عارف |
| (13) طارق خالد | زەلامێ (1) |
| (14) لقمان مصطفی | زەلامێ (2) |
| (15) ناجی سعدالله | زەلامێ (3) |

هونەرمەند سعید زەنگەنە دەرهێنەرێ شانوگەریێ دبێژیت : « ئەڤ شانوگەریە ، من ئامادەکریە ژتێکستا «إبراهیم سلمان» ی ، وە هندەك زێدەهی و مەشاهدێت نوی من ئێخستینە تێدا . چمکی کەسانێت تێکستا من شانوگەریی ژی ئامادەکری ، دسەنگەلاو (مختل التوازن) پەریشان و شەپرزەنە . وە پێڤە چو گوت ؛ عەشق و ئەڤینا ستیی و مەموی کولومتێ پەڤینێ یە لڤێرێ» براستی سەروبەرو ، رێڤەبەریا ، پێش کێش کرنی ، یا هولێ ، گەلەکا رێك و پێك بو . وە ئەکتەر ب چەلەنگیا خو ، کارین تێگستێ بگەهیننە بینەرێت خو . ژئەکتەرێت دەورێ خو گەلەك باشی ئینابن ، وە پتر بدلێ بینەرا ڤە نویسیاین ، موفق رشدی (لێبوك) ، عبدالله هرور (میر) ، مهدی محمد سلیم (شیرکو) وە کامیران لزگین (مەم) . سوپاسیی و سەد ئافەرین بو گش برادەرێت دەست دگەل ڤێ سەرکەفتنێدا هەبوی . براستی ئەڤ بزاڤە ئو دگەل بزاڤێت تیبا بزاڤ یاشانوگەریێ دبنە هاریکار بو :

(1) ب هێز ئێخستن و پێش ڤە برنا لڤلڤینا شانوگەریێ ل پارێزگەهێ .

(2) پەیدا کرنا هەڤرکیەکا برایانی دڤی چارچوڤەیدا ژبو پێش کێش کرنا چاکترین کارێت شانوگەریی .

(3) ڤەکرنا دەرفەتەکی ژلاویت پارێزگەهێ را ، ئەڤێت دل لسەر شانوگەریێ هەین ، وە بو دتێهنی . دا ڤێ تێهنێ بشکێنن .



Ingmar Bergman

### دوو نامە لە نەمساوە :

# بریگمان و تەلاقی سێ بەسێ لە سینەمادا ..

● هاشم عەلی مەندی ●
ڤییەنا ـ نەمسا

لە سەرەتای مانگی ئابی ڕابردوودا شاری سالزبۆرگ ، دووهەم شاری گەورەی نەمسا ، میهرەجانی شانۆی جیهانی سازدا ، بەشێکی زۆری هونەرمەندانی جیهان بەشداریان لەم میهرەجانەدا کرد ، لەوانە دەرهێنەری سینەمایی بەناوبانگ « ئەنگیمار بریگمان » بوو کە بە شانۆگەری « دون جوان » ی نووسەری فەرەنسایی مۆلیێر ، بەشداری میهرەجانەکەی کرد

هەر لە ڕێگەی ئەم میهرەجانەوەبوو کە بریگمان لەگەڵ کۆمەڵێ لە ڕۆژنامەنووسانی ئەم وولاتەدا « کە ئێمەیش بەشداریمان تیادا کرد » بەیەك گەیشتو ڕایگەیاند کە ئیتر خۆی لە سینەما دوور دەخاتەوە دوای پێشکەش کردنی ئەم بەرهەمەی ، واتە بەرهەمی « دون جوان » .

ئەم هونەرمەندە بە زۆری لە ڕێگەی فلیمەکانی یەوە ناوی دەرکرد لەوانە فلیمی « کبي » ، « هاوارو چرپاندن » ، « چەند دیمەنێ لە ژیانی بنەماڵێك » ، هەر لە ڕێگەی ئەم فلیمەمانەشەوە نەك هەر لە ئەوروپا ناسراو بەڵکوو لە سەرانسەری جیهاندا دەنگی دایەوە ..

بریگمان بەناچاری وولاتەکەی خۆی « سوید » ی ، جێهێشت لەترسی ڕژیمەکەی کە داوای پارەیەکی زۆری لێدەکرد لە بریتی ئەو داهاتەی بەدەستی دەکەوت ، ئەوەبوو لە دواییدا ڕووی کردە میونیخ لە ئەڵەمانیا .. هەر لەوێش بواری ئەوەی بۆ ڕەخسا کە بەرهەمێکی زۆر لە شانۆگەری پێشکەش بکات ، لەم دوایەشدا دەزگای شانۆ لە ئەڵەمانیای ڕۆژ ئاوا داوای لێکرد بە بەرهەمی « دون جوان » بەشداری لە میهرەجانی سالزبۆرگدا بکات ..

لەڕاستیدا جاری یەکەم نی یە کە بریگمان بڕیاری ئەوە دەدات کە سینەما جێ بهێڵێت ، بەڵکو دوو ساڵ بەر لە ئیمڕۆ هەمان بڕیاری داو پاشان لێی پاشگەز بووەوەو گەڕایەوە هەمان شوێنی جارانی کە ئەویش پشت کامێرایە ، هەربۆیەش ناچارین کە ئەمجارەش بڕوای پێنەکەین و ناشمانەوێ بڕوای پێ بکەین ، چونکە دوورکەوتنەوەی لە کامێرا زیانێکی زور بە سینەما دەگەیەنێ ، ئەگەرچی قازانجێکە بۆ شانۆ ..

دوا فلیمی بریگمان « فاریاو الکساندرا » بوو کە باسی دوو مندالی شارەکەی خۆی « سوید ـ أوبسالا » ی تیادا دەکات لەو شوێنانەی کە خۆی تەمەنی مندالی تیادا بەسەر بردووە ، درێژی فلیمەکە « سێ سەعات و هەشت دەقیقە » بوو ، لە کۆنفرانسەکەیش ئەوەی ڕوون کردەوە کە دەولەمەندیو بەسەرهاتەکانی دەقەکە وایان لێکردووە فلیمەکە وا درێژ بکاتەوەو ماوەکەی زۆر بێت ..

بریگمان ئێستا لە تەمەنی « 65 » ساڵیدایەو لە ماوەی چل ساڵ لەبواری سینەمادا توانیوویەتی 45 فلیم دەربکات ، کە لێشمان پرسی ، تۆبڵێی ئاسان بێ ئەم هەموو ناوبانگە پشت گوێ

بخەیت ، لە وەلامدا گووتی : ماندووم ؛ بەلکو زۆریش ماندووم ، بۆیە نامەوێ لەناکاودا بکەوم « مەبەستم ناومە » ، چونکە لەوانەیە لەمەودوا بەرهەمی باشم لەدەست نەیەت و زیاتر گووتی : « من هەردەم یەکەم بووم و دەمەوێ لەسەرخۆ بێمە خوارەوە ، نەوەك بە یەکجاری بخلیسکێم و لەناو بچم » ، دانی بەوەشدا نا کە وەکوو گیان لەبەرێك هێزی ئەوەی نەماوە زیاتر کار بکات ، بۆ بەلگەش گووتی :

لەم فلیمەی دواییمدا 130 رۆژی تەواو بەپێوە وەستاوم و کارم کردووە بێ ئەوەی دانیشم ، تاوەکو وام لێهات لە کۆتاییدا هەستم کرد کە ئیتر بۆم ناکرێ بەردەوام بم )

لەهەمان رۆژی کۆنفرانسەکەدا کە رۆژی [14] ی تەمووز بوو تەمەنی بریگمان بوو بە شەست و پێنج سال ، لەگەل ئەوەشدا بینیمان هێشتا هەر لەسەر هێزو توانای خۆی بوو بەلام ئەو دەیگووت : وام مەبینن کە لەگەلتاندا دانیشتووم ، لەوانەیە ئەوەم بۆ بکرێ ، بەلام ئیتر هیچ ئاواتێکم بە سینەما نەماوە ، نیازم وایە لەمەودوا خۆم بۆ شانۆ تەرخان بکەم و بەس ، بەجێشی ناهێلم تا دوایی .. هەروەها گووتی : لەشانۆدا ژیانم لەبەرچاودا فراوانتر دیار دەبێت ، هەر ووشەیەکی سەر شانۆ ژیانێکی تازەیە هەر جارێکیش خۆم لەگەل بەرهەمێکدا خەریك بکەم شتێکی تازەم بۆ دەردەچێ کە بەر لە ئێستا نەم زانیووە .

لە بارەی هەلبژاردنیشی بۆ شانۆگەریەکەی مولیێر « دون جوان » گووتی :

ئەم شانۆگەرییەم بەدل بوو ، چونکە هەستێکی ئێستای خۆم دەر دەبرێ کە ئەویش بێزاریمە لەم ژیانە ..

مولیێر ئەم شانۆگەرییەی لە سالی 1664 دا نووسیوەتەوە ، لە کاتێکدا کە مەلیکی فەرەنسا پشتگوێی خستبوو ، شەرێکی بێ دەنگی لەگەلدا دەکرد ، بۆیە لە دەمەتەقێکانی دەردەکەوێ کە زۆر تورە بووەو لەوانەیشە بەرهەمەکەی لەماوەی یەك هەفتەدا نووسیبێتەوەو ، مەترسی خۆی لەمردن و خۆشەویستیشی بۆ ژیان تیایدا دەربریوە ..

ئێستاش من « هەر بریگمان دەلێ » : هەمان هەست دەکەم کە ئەویش ترسانمە لەمردن و خۆشەویستیمە بۆ ژیان ..

ئەوەی شایانی باسە هەر هەمان شانۆگەری بەر لە سێ سال لەلایەن بریگمانەوە لە میونیخ پێشکەش کراوە کە ئەوساش هەمان تەنگوچەلەمەی ئێستای هەبووە ، هەر وەکوو خۆی گووتی و روونی کردەوە ..

لەراستیدا بریگمان زۆر خووی داوەتە ئەو بەرهەمانەی کە ژیانی خۆی دەگێرنەوە ، لەوانەیش « نورا » ی هنریك ئەبسن کە لە سالی 1981 دا پێشکەشی کردووە ، هەروەها شانۆگەری (خاتو جولیا) کە ئەمەیشی لە دواییدا خستە سەر « شاشە » ی پەردەی سینەما لەژێر ناوی « چەند دیمەنێ لە ژیانی بنەمالەیەك » .

بریگمان دوژمنایەتێکی گەورەی لەگەل ئافرەتدا هەیە بۆ نموونەش « شەش ژنی خواستووە » ، برواشی وایە کە ئافرەتی ئەورووپا هێشتا پاش کەوتووەو لەوەش دلنیایە کە ئافرەتی ئەسکەندناڤی ئازادترە لە ئافرەتی فەرەنسایی ، چونکە هی یەکەمیان زیاتر بەشداری و هاوبەشی لەجەنگدا کردووە ، بۆیە ئایین زۆر کاری تێ ناکات ،

هەروەها بریگمان رای گەیاند کە ئیتر لەمەودوا خۆی زۆر لەگەل ئەم بابەتە خەریك دەکات کە ئەویش مەسەلەی ئازادی ئافرەتە ..

بریگمان وەنەبێ هەر لەبواری بیرو راکانیدا زەلامێکی سەیر بێت ، بەلکو لە هەلس و کەوتیشیدا هەر سەیرە ، بەرێوەبەرانی میهرەجانی سالزبورگ سەریان سورما کە بریگمان بریاریدا شانۆگەرییەکەی لە مەلبەندێکدا سازبکرێ کە بۆ دوا مەشق « جەنەرال پروڤە » دروست کرابوو .. بۆیەش زیاتر سەرسام بوون چونکە مەترسی ئەوەیان هەبوو خەلکێکی زۆر نەیەن بۆ بینینی شانۆگەرییەکە ، دوای ئەوەی لەسەر شەقام دەیبینن ، کە ئەمەشیان زەرەرێکی زۆر لە داهاتی میهرەجانەکە دەدات ، بریگمان لەوەش زیاتر داوای لێکردن کە بەهەر جۆرێك بێت دەبێ مەلبەندەکە فێنك بکەنەوە ، چونکە خۆی لە گەرما ناحەسێتەوەو بێزار دەبێ بەتایبەتی لەو رۆژانەشدا پلەی گەرما لە سێبەردا گەیبووە 38 پلە ، لەکاتێکدا کە بریگمان شەرتی کردبوو کە لە دوانزە پلە زیاتر نەبێت ، لەگەل ئەوەشدا کە بەرێوەبەرانی میهرەجانەکە ئەمەیشیان بۆ ئامادە کرد کەچی نە ئامادەی پروڤەکەبوو وە نە شەوی پێشکەش کردنی شانۆگەرییەکەش دەرکەوت ، لەبەر گەرما ..

هەربۆیەشە کە دەلێن « هونەر شێتیەو شێتیش هونەرە » ، کە ئەمەیشیان من نایلێم بەلکو رۆژنامەکانی نەمسا ئەوەیان بەسەر لاپەرەکاندا دەدرەوشایەوە ..

# یەڵماز گیونی

# پاشای دزێو یاخی یەکی سەرکەوتوو

کوردۆ

لە ئاڵەمانیەوە کردوویە بە کوردی

پێم وایە ساڵێك لەمەو بەر بوو لە یەکێ لە ژمارەکانی رۆژنامەی هاوکاریی دا گوتارێکی تەرجەمە کراوی کاك ( ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی ) م بەرچاوکەوت کەلەسەر فلیمی (مێگەل) ی رێژێسێوری کورد (یەڵماز گیونی) نـوو سرابـوو . بە داخـەوە رۆژنامەکەم لانەماوە تا بگەرێمەوە سەری و ژمارە و رۆژەکەی دیاری بکەم .
لە ژمـارە هەشتی گـۆڤاری (کـاروان) یش‌دا گوتـارێکی کاك ( سەلاحەدین ساڵح مجید ) لەسەر فلیمی (یۆل) ی هـەمان رێژێسێور بلاوکرابووەوە .
لە گەڵ رێزی زۆرمدا بۆ کۆششی ئەو دووبرایە ، بەڵام گەر بڵێم گوتارەکان تێرو تەسەل و بێ هەڵە نە بـوون ئەوا رووی ئـەو برایانە ناگرێتەوە دڵیان گەرد ناگرێ .
لەم پێ و دانگەوە بە پێویستم زانی وەکو بینەرێك کـە زیاد لە چەند جارێك هەردوو فلیمی (مێگەل) و (رێگـە) م دیتووە و ، وەکو خوێنـدە وارێکیش کە هـەندێ سـەرچاوەم دەربـارەیان کۆکردۆتەوە مشت و ماڵێك بکەم و چەپکێك زانیاری دیکە بخەمە سەر کاری ئەو برایانەو پێشکەشی خوێنەرە ئازیزەکانی بکەم ، بەو هیوایەی کەمێ تامەزرۆییان لەم رێژێسێورە تاقـانەیـەی نەتەوەکەمان بشکێنم .
بروا مەکەن تا ئێستا هیچ فلیمێکی بەرهەم هێنـراوی بێگانـە هێنـدەی ئەو دوو فلیمـەی (یەڵـماز) لە ئەوروپـادا رەواجیان بووبێت . شار نەماوە سەریان پێدا نەکردبێت و لەماوەی چەند هەفتەی پیشان دانیان دا هۆڵەکان هەمیشە جمەیان هاتووە . هەر بەو بۆنەیەوە گەلێ لە رۆژنامەکانی ئەوروپا دەربارەیـان نووسی ، بەڵام زۆربەیان تـەقریـری و کورت و سـەرپێیی و شێواو . چێترین سەرچاوە ئەو چاوپێکەوتنە بوو کە پەیامنێری گۆڤاری (دێر شپیگل) ی ئـاڵەمانی لەژمـارە (48) ی ساڵی (36) هەمی رۆژی (29) ی نۆڤەمبەری (1982) دا لەگەڵ خودی (یەڵماز) کردبووی ، کە پاشان دەقەکەی بە تەرجەمە کراوی پێش چاو دەخەم .

ئەوەی لێرەدا پێویست بە گوتن دەکات ئەوەیە کە ئەم فلیمانەی (یەڵماز) هێندە فریان بە سەر تورکی یەوە هەیە کە رێگـەی بە کوردی دەرهێنانیان پێ نەدراوە . بەهرەی (یەڵماز) نمـوونەی هـەزاران بـەهـرەی خنکێنـراوی لانـەوازی جـوامێـرانی نەتەوەکەمانە . فلیمەکانی (یەڵماز) هەموو بۆن و تام و چێژێکیان



کوردی‌یە ، جل و بەرگ و کەل و پەلەکان ، دیمەنەکان ، سەرپاکی گۆرانی یەکانیان ، هەتا کەڵێ جار مۆسیقای تە صویریش ئاوازی خۆماڵی کوردین ، ساز و ئاوازی شمشاڵی هەست هەژێنی کوردین . لە فلیمی (مێگەل) دا لە کاتی کە یشتنە (ئەنقەرە) و نیشان دانی پەیکەری (ئەتاتورك) مۆسیقای ( ئەي کوردینە ئەی مەردینە ) پەلکێشی دەریای هەزاران خەیالاتت دەکات . لە (مێگەل) دا تەنها تاقە گۆرانی یەکی

تورکی ی تێدایە کە گۆرانی یەکی ( زیولفیو لیڤانەلی ) یە و بەندکراوێك بە کەلەپچەی دەستی یەوە لەنێوان دوو ژەندرمەدا لە شەمەندەفەردا دانیشتووە و تێدەچرپێنێ : ( جەردەکان ناتوانن دونیا داگیرکەن ) . سەرەتای (مێگەل) شێخێکی نوشتە نووسی کورد پیشان دەدرێ کە چارەی نەخۆش دەکات و بەنزای کوردانەو بە کوردی‌یەکی رەوانی دۆبلاج نەکراو دەکرۆزێتە وە و نزا دەکات . لە فلیمی (رێگە) دا کاتێك بەندە پشوو پێ دراوەکان بەرە و ماڵ دەگەرێنەوە و نزدیکی هەوار و مەنزل دەبنەوە پڕ بە پڕی پەردەکە دەنووسرێ (کوردستان) .

وا دەقاو دەقی چاوپێکەوتنەکەی گۆڤاری (دێر شپیگل) ی ئاڵەمانی و ئەو پێشەکی‌یەی بۆیان نووسیوە دەکەمە کوردی ، هەرچەندە گەر بە دەست خۆم بایە رەنگە هەندێ پرسیار و وەرامم لەبەر زۆر هۆ پشتگوێ خستبا ، بەلام وەکی ئەمانەتێکی ئەدەبی و تا خوێنەرانی ئازیز لە نزدیکترەوە ئەم رێژیسێورە بناسن و شارەزای بۆ چوونە فیکری‌یەکانیشی بن ئەوا ناچارم سەرپاکی نووسینەکە بە ئەمانەتەوە پێش چاو بخەم .

### ( پاشای دزێو ، یاخی‌یەکی سەرکەوتوو ) .

(یەڵماز گیونی) ئێستا تەمەنی (45) ساڵە ، بە نێوبانگترین ئەکتەر و رێژیسێوری تورکیایە ، زیاد لە یازدە ساڵی تەمەنی لە گرتووخانەدا بە سەر بردووە ، ساڵێك زێدەترە ئاوارەی ئەورووپای رۆژئاوا بووە[1] . نوێترین فلیمی کە (یۆل) ە لەم هەفتەیەدا لە سینەماکانی ئاڵەمانیادا پیشان دەدرێ . مانگی مایسی ئەمساڵ لە فیستڤاڵی (کان) دا خەلاتی (دارخورمای زێرینی) پێدرا .

لە نێوەراستی ئۆکتۆ بەرەوە زیاد لە شەصت تورکی دانیشتووی ئاڵەمانیا ، لە نێویاندا هەندێ ساوا و مێرمنداڵیش دەدیترێن ، سەرگەرمی کارێکی نائاساییـن ، لەگەڵ دوو صەد تورکی دوورە وولاتدا فلیمێکی (یەڵماز گیونی) دەربارەی گیراوەکانی گرتووخانەی یەکێ لە پارێزگاکانی تورکیا دەردەهێنن ، ژێر تاقی کۆنە دێرێکیان دەست پێدا هێناوە و کردوویانەتە مەنزلگا و شوێنی کاریان .

(یەڵماز) لە (1972) ەوە ماوەیەکی کورت نەبێ ئێدی سەرپاکی ئەو ساڵانەی ژیانی لە بەندیخانەدا بە سەر بردووە . لە ئۆکتۆبەری (1981) ەوە هەڵهاتووە و لە ئەورووپای رۆژئاوا دەژی . لەو کاتەوە رژێمی تورکیا داوای تەسلیم کردنەوەی دەکات ، (گورگە بۆرەکان)[2] یش بە خوێنی سەری تینوون ووەك سێبەر وە دووی کەوتوون .
ئەم فلیمە لە بارو دوخێکی دژوار ، بێ رێگە پێدان بەرهەم دەهێنن ، بودجەکەی نزدیکەی (4 ملیۆن مارك)[3] ە ، نێوی فلیمەکە لە دێرە شیعرێکەوە وەر گیراوە و لە بەندیخانە دا نووسیویەتی : ( شووشەی پەنجەرەکان بشکێنن تا مەلەکان ئازاد بن ) .

لە تورکیادا (یەڵماز) لای زۆربەی خەڵکی ی نموونەی ،هونەرمەندێکی مولتەزیمە کە لە پەردەی سینەماوە هاتۆتە دەر . تەنها فلیمەکانی قەدەغە نەکراون بەڵکە وێنەکانی ، پۆستەری فلیمەکانی ، ئەو ساڵنامانەی وێنەی ئەمیان لە سەر بوو هەموو شاردراونەتەوە ، پێشان دیواری هەزاران چایخانە ، سەرتا

ـانه ، دوکـانی بۆیـاخچی یەکـانیـان(*) رازانـد بـووه . له
کوپەردا دەستەلات دارانی تورکیا جنسیەی تورکی‌یان له
ەلماز) ی هەڵهاتوو سەندەوه . ئەم فلیمەی دوایی پاش کودەتا
ەسکەری‌یەکەی (12) ی سێپتەمبەری (1980) له تورکیا بەرهەم
ێنراوه . (یوڵ) به سەرهاتی پێنج بەندی گرتووخانەی دوورگەی
ـیمرالی) یه کـەیەکی هـەفتەیـەك پشوویـان پێ دەدرێ بۆ
ـرانەوه بۆ نێو خانەوادەکانیان ، هەریەکه دەگەڕێتەوه بۆ شار
وگوندی خۆی ، پێنج چیرۆکی پڕ له ناسۆر ، پڕ له بێ ئارامی ،
ـەنامی ، خوێن رشتن .

ـیوڵ) به و هەڵچوون و هونەره بـەرزەوه شەخسیـەتێکی بێ
ـێنەی بۆ سینەمای درامی خۆ وولاتی‌ی تورکیا خوڵقاند ، که
پاشان که سایەتی ریژیسیۆرێکی پیشان دا که ئازایانه لەگەڵ
ەموو دژواری‌یەکدا خۆی ناساندووه .
ـه شەصتەکاندا لەڕێگەی کۆمپانیاکانی سینەمای تورکی‌یەوه
ـه ساڵانه نزدیکەی (250) فلیمیان دەخستـه بازارەوه (یـەلماز
گیونی) کورد که کوڕی فەرمانبـەرێکی دەست رۆیشتووه و له
(195‍) دا له خوارووی ئەنادۆل له دایك بووه ، له ماوەیەکی کورت
ـدا بووه یەکه هونەرمەندی به نێوبانگ . ئەو کاته زانستەکانی
ئابووری دەخوێند و هۆنراوه و پەخشانی دە نووسی . تەجرەبەی
ـالی لەگەڵ پۆلیس دا هەبـوو چونکـه گەلێ جـار شالاویـان بۆ
دەهێنا . له سەر هۆنراوەیەك به تاوانی چەپ ڕەوی دووساڵ
بەندی‌ی کێشا .

ـەرەتا وەکی سیناریۆ نووسێك و پـاشان وەك ئـەکتەرێـك له
جیهانی سینەمادا ناسرا . له سەردەمی خوێندنی‌دا ئـاشنای
ئەو جیهانه پان و بەرینەی سینەما بوو .
پێشان هونەرمەندانی وەك (بۆرت لانگستەر) و (جاك بلانس) و
(مارلن براندۆ) و هەندێ هونەرمەندی دیکەی سەرپەردە کاریان
تێ کردووه و لاسایی ئەوانی کردۆته وه ، پاشان ڕێچکەیەکی
تایبەتی گرت که له هونەرمەنده تورکەکانی پێش خۆی جودایان
دەکـردەوه و تۆ وی نـوێ خـوازی لەم هـونـەرەدا چـانـد .
دەورەکانی هەندێ جار وەکو که سێکی تـەڕپۆش و نـاسك له
میلۆدرامادا ، گەلێ جاریش وەکو سمێڵ بابڕێکی سەرسەختی
دەمـانچه بـه قەد هـەمیشه چـوون یەك بـوون . نـەتـرس ،
یاخی‌یەکی سەرکەوتوو ، تۆڵەسـێن ، جەرده و سـالوکێك کـه
هـەمیشـه پشتی هـەژارانی دەگـرت دژی گـەوره و دەست
رۆیشتووەکان . ئەم (بیملۆندۆ) یا (جێمس دیان) یا (بروس لی) ،
(رۆبن هود) یا (زۆرۆ) و (زاپاتا) ی تورکیا بوو . دەموو چاوێکی
رۆمانتیکی عەنتیکەی شیاوی بۆ ئەم دەورانه هەبوو که تازه له
سینەمای تورکی‌ی دا چەکەرەی کردبوو و جێ‌ی خۆی له دڵی
لاوان دا کردبۆوه .
له (1965) دا له تـرۆپکی بـه نێـوبـانگی‌دا کـاتێـك
موعجبەکانی نێوی (پاشای دزێو) یان لێ نابوو له بیست و حەوت
فلیمـدا دەوری بینی ، بێ‌گومـان هەمیشـه دەوری پاڵەوان ،
بەلای کەمیشەوه خۆی سیناریۆی چوار فلیمیانی نووسیبوو .
ئێستاکه دەڵێ : (( ئەو کاته خەڵکێکی زۆر له سەر حسابی من
دەوڵەمەند بوون ، هەر ناسیاوێك به پاره بۆ دەرهێنانی فلیمێك
بەشداری بکردایه پەلپی دەور بینینی پاڵەوانی دەگرت . ))
رۆژ بووه به ئۆتۆمبێـل لەم شوێنـەوه بۆ ئـەو شوێن سێ جـار
مـاکیاجی گـۆڕیوه ، چـونکـه دەوری پـاڵەوانی له سێ فلیمی
جـوداوازدا دیتووه ، ( هـەر فلیمەی نـزدیکـەی 5000 هـەزار
مارك ) ی لێ دەمسکەوتوه . سا بۆیه خۆی لەم کۆت و پێوەندانه





رزگار دەکات و لەیەك کاتدا وەکو نووسەر و ریژیسیور و ئەکتەر دەست پێ دەکات . فلیمەکانی وەکو (پاسکیل دز) ی دی ساکاو (ڤیڤا زاپاتا) ی ـ ئیلیا کازان ـ سەرمەشقی بوون .
(پاشای دزیو) ، یاخی سەرکێش بە ئاشکرا لە سەر پەردەوە بانگی شۆڕشێکی کۆمەلایەتی هەلدەدا ، هەمیشە مەرگە ساتی واقعی تال و تفت و دلتەزێنی کۆمەلگاکەی هەلدەبژارد . لە سالی 1971 دا (یەلماز) جەماوەرێکی زۆری پەیدا کردبوو ، چەپڕەوەکان وەکو هونەرمەندێکی هەوەس و سێکس و رادیکالێکی دوودل حسێبیان بۆ دەکرد ، راست رەوەکان وەکی بەکرێ گیراوێکی مل هوڕی کۆمۆنیست . لەم سالەدا هەشت فلیمی خستە بازاڕاوە ، کاربەدەستانی رژێمی ئەوکاتەش (کەوەك ئێستا عەسکەری بوو) ، کەوتنە دلە ڕاوکە ، چونکە فلیمە (گێرە شێوێنەکانی) چ لە ووڕت و چ لە ڤیستڤالەکانی دەرەوەدا سەرنجی خەلکیان رادەکێشا .
1971 لە ڤیستڤالی فلیمە تورکی یەکاندا لیژنەکە بە تێکڕایی دەنگ (یەلماز) یان بە چیترین ریژیسیور و ئەکتەری سینەمای تورکیا هەلبژارد ، (( ئەم هەواله گۆڤاری (ڤاریاتی) ئەمریکی رایگەیاند )) ، بەلام بە فەرمانێکی لە دەستەلاتی ئەو لیژنە دادوەرە بالاتر ئەو بڕیارە هەلوەشایەوەو جارێکی دیکە خرایەوە دەنگ دان و یەکێکی دی هەلبژێردرا .
1972 (یەلماز) بە حەوت سال و نیو بەندی ی حوکمدرا ، بە تۆمەتی وەی گوایە پشتگیری یاخی بوونی قوتابیانی کردووە . تا لە مانگی مایسی 1974 دا باری تورکیا کەمێك هێور بوّ وە و کۆمەك و پرۆتێستی* بێگانەکان و رێکخراوە خێرخواکانی وەکی (ئەمنستی)* کاریان کردوو بە هۆی لێ خۆش بوونێکەوە ئازاد کرا .
ئەوجا فلیمی (هەڤال) ی دەرهێنا ، ئەم فلیمە درامای پێك گەیشتنەوەی دوو هاوڕێ ی سەردەمی قوتابخانەیە ، یەکێکیان لە رێگەی قۆنتەراتەوە دەلەمەند بووە و ئەوی دیکەیان ( کە یەلماز خۆی دەورەکەی دەبینی ) بێ سەرەنجام و دل پڕ لە هیوا لە زۆرانبازی ژیاندایە و بڕوای تەواوی بە هاتنەکایەی رژێمێکی سۆسیالیستی یە .
لە سێپتەمبەری 1974 دا لە شارۆچکەی (یۆمۆر تالیك) لە خوارووی ئەنادۆل فلیمی (بێ ئارامی ی ) دەرهێنا ، بەسەرهاتی جوتکارێکی لۆکە نیشان دەدات کە دووچاری دوژمنایەتی بووە و هەمان کات بۆبەربەرەکانی ی چەوساندنەوەی چینایەتی بانگی مانگرتن هەلدەدات ، بەو جۆرە لە نێوان دوو بەرداشی کۆنەپەرستی و پێشکەوتنخوازیدا گێژ دەخوات .
(یەلماز) ئێواران پاش کارکردن لە یەکێ لە لۆقنتەکانی ئەو شارەدا لە گەل دۆست و خوێشانیدا پێکەوە دادەنیشتن ، ئێوارەیەك پارێزەرێکی راستڕەوی رادیکالی سەرخۆش شالاوی بۆ دێنێ و تانە و تەشەری پێ دەکات ، پێکدا هەلپژانێك روودەدا و پاشان دەبێتە شەڕە گوللە وپارێزەر تێدا دەکوژرێ .
خوشکە زایەکی هەژدەسالانی (یەلماز) کە نێوی (عەبدوللا پیوتیون) دەبێ بە خۆی و دەمانچەکەیەوە خۆی تە سلیمی پۆلیس دەکات و دان بەوەدا دەنێ کە کابرای پارێزەری کوشتووە . (یەلماز) بە تۆمەتی هاوکاری کوژەر دەگیرێ و بە هەژدە سال بەندی ی حوکم دەدرێ .
خوشکەزاش بە تۆمەتی فریودانی یاسا بە سی ی مانگ حوکم دەدرێ ، بە ئاشکرا مە سەلەکە دەکەنە مە سەلەیەکی سیاسی و بە جۆرێك ئالۆزی دەکەن کە سەر و بنی راستی ی تێدا بچێت ، مە بە ستیش تاوانبارکردنی (یەلماز) ە .[٣]
سەرەتای 1981 چەند مانگێك پاش کودەتا عەسکەری یەکە (عەبدوللا) دەمرێ ، لە راستی دا بە گوللەیەك کوژرابوو ، گوایە خۆی خۆی کوشتووە تا کێشەکە وون بکاو دادگا لە خشتە بەرێت ، بەلام (یەلماز) دلنیایە لەوەی کە کوشتویانە و بۆ بە ئاگا هێنانەوەی ئەمیش بووە .
1975 لە ڤیستڤالی فلیمە تورکی یەکاندا سێ خەلات بۆ سێ فلیم لە چاکترین فلیمەکانی سینەمای تورکیا تەرخان کرا ، هەر سێ خەلاتەکە بەر سێ فلیمی (یەلماز گیونی) کەوت .



لە گرتووخانەدا چیرۆك و رۆمانی زۆری نووسی ، لە زیندانەوە فلیمی بەبەرهەم دەهێنا ، بێ گومان بە یارمـەتی و كۆمـەكی ئەكتەرە هونەرمەندەكانی دۆستی كە لە دەرەوەی گرتووخانە بوون ، ئەمانە سیناریۆكانیان بۆ دەكردە فلیم .
سیان لە دواترین فلیمەكانی كە (یەڵماز) خۆی بە دراما نێویان دەبات ، (مێگەل) ، (دوژمن) ، (رێگە) نێوبانگی (یەڵماز) یان لە سنـووری توركیـا بەزانـد ، ئەمـانەن فلیمـەكانی (یـەڵماز) ، هەرچەندە خۆی دەری نە هێناون ، (( یەكەم و دووەم (زەكی ئۆكتان) دەری هێناون و (رێگە) ش (شـەریف گۆیـرن) . )) بەلام بە توانای بێ پایانی خۆی بە بەرهەم هێنراون .
ئەمانە درامان ، هونەرن ، هـاوارن ، ژیانی میللەتێكن كـە لە گێـژەنی ئەم سـەدەیەدا لە گێـژاوی فیوداڵەكـانی سـەدەی نێوەراستو زیاد رەوی لە نوێ خوازی دا دەهاڕدرێن ، وێنەی خاكێكن كە ترس ، كینە ، هێز تێیدا فەرمانڕەوان .

(( ئازادی دێت و وەكی بوومەلەرزە دەبێت ))

دەقی چاوپێكەوتنەكە

**رۆژنامە نووس** : بەرێز كاك یەڵماز . كاتێك پیاو دەبیستێت لە ژووری گـرتووخـانەوە فلیمتـان بـەرهـەم هێناوەو سەر پەرشتیتان كردووە پرسیـك خـۆی دەسـەپێنێ : ئـایـا لە پشـتی شیشەكانەوە هەستان بەوە نە كردووە كە ئـەستێرەیـەكی درەوشـاوەی جیهـانی سینەمان ؟

**یەڵماز** : بە هیچ جۆرێك . من تەنها لە هەموو بار و دۆخێكدا بەو پەری تواناوە هەڵم قۆزتۆتەوە .

**رۆژنامە نووس** : كە واتە بە نهێنیش ؟

**یەڵماز** : بڕوانە ، لە هەر گرتووخانەیەك دا میوان بوویم دوای ماوەیەكی كەم صەدی نەوەد و پێنجی بەندەكانم بە لای خۆمدا راكێشاوە ، جارجارەش بە تەنها بەندەكان نا .

**رۆژنامە نووس** : چۆن ئەم سەر پەرشتی‌یە دوور بە دوورە بۆ بەرهەم هێنان بە ئەنجام دەگەیەنرا ؟

**یەڵماز** : خۆشم دەبوو فێربم ، تا ئەوكاتەی خۆم دەوری پاڵەوانم دەدیت و سەرپەرشتی دەرهێنـانم دەكرد سینـاریۆی زیادم لەبەر دەستدا بوون ، لە هەموو هەلوبوارێكدا خۆم بریاردەرو سەر پەرشتی كەر بووم ، ئیدی ئـەوە دەستی نەدەدا . دوو فلیمی یەكەم كە لە گرتووخانەوە هاتنە بەرهەم سیناریۆكانیان زۆر رێك و پێك نە بوون ، زۆر گوێم بە دەرهێنانیان نەدا ، بڕوایەكی تەواوم بـە دەرهێنانی هونەری پێكڕایی نەبوو ـ ئەمە تێڕوانینێكی لنگەوقووچ بوو .

**رۆژنامە نووس** : دوایی ؟

**یەڵماز** : سیناریۆی (مێگەل)* ، (دوژمن) ، (رێگە) ووردوو رێك وپێك بوون ، هەنگاو بە هەنگاو هەتـا جۆری هـەڵسو كـەوتو ڕووناكیشم لە كـاتی دەوربینینـدا دیـاری كردبوو ، خۆم كەسـەكانم هـەڵبژاردو مـەرجم لەگەڵ بەستن لە رێ نوێنیم دەرنەچن ، هەندێ جار لەگەڵ ئەو ئـەكتەرانـەی لە گرتـووخانـە دیدەنیـان دەكـردم لە ژوورەكەمدا پرۆڤەی مەشهەدەكانمان دەكرد ، هەموو هـەوڵێكمدا تـا لە دووریشـەوە بێت سـەرپـەرشتی دەرهێنانیان بكەم ـ لەو بارەدا پیاو لەوە زێدەتریشی لە دەست نا یەت .

**رۆژنـامە نـووس** : لە (یۆل) دا دوای دە رۆژ كـاركـردن لە رێژیسیۆری یەكەمتان سەندووەوە داتانە رێژیسیۆرێكی دی ، چۆن ئەو بریارەتان دا ؟

**یەڵماز** : بەردەوام هەواڵ و وێنەی مە شهەدەكانم پێ دەگەیشت ، هێندە قاڵ بوو بووم بتوانم بریارێكی بەو جۆرە بدەم . راستە بریارەكە ئا سان نە بوو ، بەلام پێویست بوو . رێژیسیۆری یەكەم تواناو لێهـاتوویـیـەكی وای نەبـوو خواستەكانی من رەنگ پێ بداتەوە .

**روژنامه نووس** : چۆن توانرا فلیمێکی وەکی (یۆل) لە پێش چاوی زەقی رژێمدا بەرهەم بهێنرێ ؟

**یەڵماز** : توانرا چونکە رێگەم بە نووچ دان نەدا ، لەبارودۆخێکدا هەتا رێژێسیۆرە ئازادەکان کۆلیان دا و لەبەردەم کۆسپ دا بە چۆکدا هاتن ، بەلای منەوە مەسەلەی ژیان بوو ، پێویستی‌یەکی مانەوە بوو تا بە ئیسپاتی بگەیەنم پیاو هەر دەتوانێ کاربکا ، خەبات بکا و سەریش بکەوێ .

**روژنامه نووس** : (یۆل) شتێکی کەم نە بـوو ، بەرهـەمێکی هێژایە ناچێتە عەقڵەوە رژێم نەیزانیبێ چ روو دەدات .

**یەڵماز** : لە تورکیادا سیناریۆی هەموو فلیمێك پێویستە پیشانی رەقابە بدرێ تا رێی دەرهێنانی بدرێ ، کـە رەقابـە رێی دا ئیدی تەگەرە نامێنێ هەتا فلیمە تەواو بووەکە پیشانیان دەدرێتەوە . تێپەڕینی سیناریۆی (یـۆل) بە رەقابەدا شتێکی ئەوتۆ نەبوو . تێپەڕینی فلیمەکـەش لای هەمووەمان ئاشکرا بوو . هەوڵ درا کۆسپی لە رێ‌دا قوت کرێتەوە بەلام سەری نەگرت . بابەتی فلیمەکـە بـزوتنی زۆری گـەرەك بـوو ، مـەشهـەدەکـان لە شەمەندەفەردا ، لە ئـۆتۆبـوس‌دا ، لەم سەر تـا ئەو سەری وولات دەگەڕا . لە رنووی بەفری چیای (بنگول) ەوە تا دەگاتە سنووری سـووریا . چـاودێری کـردنی جاسوو سانە شتێکی ئاسان نەبوو .

مـەشهەدی ژەنـدرمەکـان لەو لەقتە خـوێناوی‌یـەی گوندەکەدا رووداوێکی راستی‌یە ، فەرماندەکەیان گەلێ بەخۆ دەنازی لەو تاوانکاری‌یەیان‌دا وێنەی خـۆی و پیاوەکانی بکرێتە فلیم .

**روژنامه نووس** : ئەو قاوە راستە گوایە بە دزی‌یەوە رێگەدراوە ماتریالی فلیمەکەت بە قاچاغ بـۆ بگەیـەننە گرتووخانە ؟

**یەڵماز** : نەخێر ، بەلام بۆ (میگەل) و (دوژمن) بوارم درا فلیمە نەبردراوەکە ببینم و تا رادەیەك سەرپەرشتی مۆنتاژ و شتنەوە و دەنگی بکەم . لە کاتی (یۆل) دا بارودۆخێکی دیکەبوو . کاتێك وێنە گیرانی فلیم تەواو بوو و دڵنیا بووم لەوەی گەیشتوتە دەرەوەی وولات ئەوجا تورکیام جێ هێشت . ئیدی توانیم خـۆم سەرپـەرشتی‌ی مونتـاژو شتنەوەی بکەم ، بـەشێکی لە پاریس و بـە شێکی لە سویسرا و رەنجێکی زۆرم لەگەڵ دا . بەلام پێـویستە ئەوە بڵێم کە زۆرم هەوڵ دا و هەموو رێگەیەکم گرتەبەر تا ئەو فلیمە بە بەرهەم بێت ، خۆشم رێژێسیۆری نەبووم . ئاشکراشە گەر وەفاو هیمەتی مەردانەی هـەڤالانی گرتووخانەم و بەشدارانی فلیمەکە نەبایە ئەو فلیمە ئەوە نە دەبوو کە ئێستا هەیە .

**روژنامه نووس** : ئەوەی دەربارەی هەڵوێستت لە گرتووخانەدا دەگێـڕرێتەوە وا پیشـان دەدات کە لەوێش هەر (پاشای دزێو) بوویت .

**یەڵماز** : بێ گـومان هـەڤـاڵە گیـراوەکـانم بێ دەستـەلات ، چەوساوە ، یاخی و سەرکێش بوون ، منیش لە پێش چاویاندا نیشانەی یاخیگەری بووم . توانیم لە رێگەی زانیاری سیاسیم و بۆچوونە تایبەتی‌یەکانمەوە تێیان بگـەیەنم گـەر پیاو سـەرکەوتنی بـوێت دەبێت بـە هاوکاری و یەك دڵ و یەك را رەفتار بکات . لێمـەوە فێربوون پێکرا دژی بێ دادی ، دادۆشین ، رەفتاری بەد ، وەکو شوورە رابوەستن ــ ئەوە کارمـان بوو ، خەبات‌مان‌بوو ، ماکی سەرکەوتنمان بوو .

**روژنامه نووس** : کەواتە لە گرتووخانەش دا بەهێز بوویت ، وەك ئازیز بوویت ترسناکیش بوویت ؟

**یەڵماز** : راستە ، بەرێوەبەرایەتی گرتووخانەکان لێم دەترسان ، چونکە هەمیشە قاوی هەڵهاتن دادەکەوت . بۆیە 1978 بە ئاشکرا گوتم گەربمەوێ هەموکات بێ دەردی سەری توانای هەڵهاتنم هەیە لە هەر گرتووخانەیەکی تورکیا دابم ، بەلام بیر لەو کارانە ناکەمەوە .

**روژنامه نووس** : **ئەمە بلۆف بوو ؟**

**یەڵماز** : بۆچی ؟ لە 1979 دا وەزارەتی داد بریاری گواستنەوەمی لە ئەستەمبووڵەوە بۆ یەکێ لە شارە دوورەکرن دەرکرد ، سەیر ئەوە بوو هیچ گرتووخانەیەك رازی نە دەبوو ئەم (یەڵماز گیونی) یە ترسناکە بگرێتـەخۆ . سـاڵی پێشوو بـەراستی زۆر نـاسـاغ بـووم ، لە تـرسی هـەڵهـاتن نـەیانـدەوێرا بمبـەنە هیـچ نەخـۆشخانـەیەك ، کـە بردیشیانم نـاچار بـوون شەش حـەوتـووی رەبـەق بمهێڵنەوە تا گرتووخانەیەك پەیدا کەن بمگرێتە خـۆ . ئـەوەبوو لە ئـەستەمـووڵەوە گوێـزرامـەوە دۆرگـەی

(ئیمرالی) .

ڕۆژنامەنووس : بەخێر گەڕا ، ئەوە بوو ڕۆژنامەکان نووسیبویان گوایە گرتووخانەت گۆڕیوەتە (کۆماری گەلی ئیمرالی) .

یەڵماز : بەڵێ . لە (ئیمرالی) دا خۆمان ڕێکخستبوو گەر بمانویستبا حەوت سەد بەند هەموو پێکرا دەمانتوانی هەڵبێین ، کە هەستیان کرد هێزی تایبەتی دەریاییان هێنا ، هەشت کە شتی جەنگی و دووهەزار سەرباز ئەڵقاو ئەڵقی دوورگەکەیان دا . ئێمە وەزعمان بەد نەبوو ، بە هیچ جۆرێکیش بیرمان لە هەڵهاتن نە دەکردەوە . ناچار جارێکی دی منیان گواستەوە .

ڕۆژنامەنووس : وا پێ دەچێ هەر سەرکردە بوو بیت .

یەڵماز : من سەرکردایەتی هەڤاڵانی گرتووخانەمم نە کردووە ، بەڵکە کۆمەکم پێ کردوون ، ڕێکم خستوون ، هەوڵم داوە باری ناهەمواری خۆیانیان پێ بناسێنم و دژی بوەستنەوە ، لە وانیشەوە فێر بووم گەر گەل بە ئاگاو هوشیارانە رەفتار بکات هێزێکی هێند لەبن نە هاتووە کە هەرگیز تێشکاندنی بۆ نی‌یە .

ڕۆژنامەنووس : دەتەوێ دەربارەی هەڵهاتنەکەت بدوێی ؟

یەڵماز : ووشەی (هەڵهاتن) م بەدڵ نی‌یە ، من وام پێ خۆشە بڵێم بۆ ماوەیەکی کورت و تا بارو دۆخێکی دیکە زۆر نا بە دڵ لە ووڵاتەکەم دوورکەوتوومەتەوە ، جگە لەوە من لە گرتووخانە هەڵنە هاتووم ، بەڵکە لە کاتی پشوویەکی گرتووخانەدا کە پێم درابوو ئێدی نەگەڕامەوە ، چیدی لە ژیانی خۆم دڵنیا نەبووم ، هەتا لە زیندانەکەمدا . ئیتر بواری ئەوەم نەما بوو لە سەر کارەکەم بەردەوام بم ، بۆیە ناچاری ڕۆیشتن بووم . لەگەڵ ژنەکەم و دوو منداڵەکەمدا ـ بۆیەکەم جاری ژیانم ـ تورکیام بەجێ هێشت ، بە ڕاستی ئازارم چەشت چونکە ووڵاتەکەمم لە هەموو شت خۆشتر دەوێت .

ڕۆژنامەنووس : هەر بەڕاستی هیچ کات لە دەرەوەی ووڵات نە بووی ؟

یەڵماز : لە ژیانمدا .

ڕۆژنامەنووس : ڕاستە بە کە شتی‌یەکی چکۆلە هەڵهاتوون ؟

یەڵماز : ئەو پرسیارە مەکەن بییر لەو هەڤاڵانەم بکەنەوە کە کۆمەکیان پێ کردووم .

ڕۆژنامەنووس : کاتێ سیاسەت دێتە پێش بە ووشەی ـ ئێمە ـ دەدوێیت ، ئێمە مەبەستت کێ‌یە ؟

یەڵماز : خۆم و هەڤاڵەکانم .

ڕۆژنامەنووس : دەتانەوێ لە دەرەوەی ووڵات تەنها خەریکی فلیم دەرکردن بن یا ڕۆڵی سیاسیش دەبینن ؟

یەڵماز : ئەو دوانە لەیەکدی هەڵنابوێردرێن . ئامانجم هەموو ژیانم تەنها بۆ هونەر نی‌یە ، بەڵکە بۆ ئازادی گەلە . بۆ ئەو ئامانجە بە هەموو جۆرێك کاردەکەم و تێدەکۆشم .

ڕۆژنامەنووس : فلیمەکانت دەربارەی زەبرو زەندن ، پاشان ئەوە پیشان دەدەن کە زەبرو زەند تێکدەرەو ماڵ وێرانکەرە . ئایا دەتوانن خەباتی سیاسی بێ زەبرو زەند بەرپا بکەن ؟

یەڵماز : زەبروزەند گەر دەمامك و چارشێوی پێشکەوتنخوازانەو شۆڕشگێرانەش بپۆشێ هەر تاوانەو ماڵ وێرانکەر .

ڕۆژنامەنووس : کەواتە تیرۆریستی‌یە ؟

یەڵماز : بەڵێ تیرۆریستی‌یە . تەنها یەك زەبرو زەند ڕەوایە ، ئەوەی دژی زەبروزەندو چەوساندنەوەیە ، بەومەرجەی زۆربەی گەل پێ‌ی ڕازی بێت .

ڕۆژنامەنووس : ویست و تواناو کەسایەتی سەرکردەیەکتان تێدایە ـ ناتانەوێ ببنە سەرکردەو ڕابەری ئەو بزووتنەوەیەی خەریکی هێنانەکایەیین ؟

یەڵماز : ئەوە ئامانجی من نی‌یە .

ڕۆژنامەنووس : بەلام گەر پێویستی کرد سینەما بۆ سیاسەت بەجێ دەهێڵن ؟

یەڵماز : یەکسەر . کە هەلی لەبار هاتە پێش ناتوانم بڵێم : بە یارمەتی ، دەبێ جاری فلیمێك دەربکەم . دوای ئازادی صەدان (یەڵماز گیونی)دێنە کایەوە کە گوڵی نوێی کولتورەکەمان شکۆفە پێ دەدەن .

ڕۆژنامەنووس : بە هۆی هەڵهاتنتەوە هەست ناکەیت لە جۆرە بەندیخانەیەکی دیکەدابیت ؟ چۆن بەبێ ئیقامە ، جێگەیەکی تا ڕادەیەك هەمیشەیی ، یا بێ جنسیە هەڵدەکەیت ؟

یەڵماز : بەو جۆرە دەژیم کە دەیبینی . لە مانگی مایس دا داوەت

کـرام بۆ بـەشداری لە فیستڤـاڵی (کان) دا ، ڤیـزەی سەفەرێکی فەرەنسام پێ درا ، سێ هـەم رۆژ لە سەر داوای رژێمی تـورکیـا لە فـەرەنسـا دەرکـرام . بـۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە جارێکی دی ڤیزەی بیست و چوار کاژێریان پێ دام .

**رۆژنــامە نــووس** : خەڵاتی دارخـورما زێـرەکەتـان بە دوو پەنجەی نیشـانەی سـەرکەوتنی شـۆڕ شگێـرانەوە بـەرزکردەوە و ئیـدی وون بوون .

**یــەڵمــاز** : ئـەو داوەتـەی (کـان) م (مـیـوانی شـەرەفی) سۆسیالیستەکانی فەرەنسا بووم ، ئیدی نەمویست تەنگوچەڵەمەیان بۆ بسازێنم .

**رۆژنامە نووس** : هیچ کات لە ئەڵەمانیای رۆژئاوا بوویت ؟

**یەڵماز** : نەخێر . پێش چەند مـانگێك وەزارەتی داد لە (بـۆن) ئاگاداریان کردم هیچیان دژی من نی یە ، یانی فەرمانی گـرتن و شتی وا ، بەڵام کـاتێ لە زیـوریـخ چـوومـە باڵوێزخانە و داوای ڤیزەی سەردانم کرد ، بە ئاشکراو بە ئاگاداری (بۆن) داواکەم درایە دواوە . وا پێدەچێ لەم کاتەدا هیچ یەکێك لە وولاتەکانی ئەندامی (ناتۆ) نە ڤیزە و نە ئیقامەم پێ نەدەن .

**رۆژنامە نووس** : دەی سا چۆن دەبێ ، چۆن دەتوانی بەبێ جێ و رێگەیەکی ئـەوتۆ بمێنیتـەوە و فلیم دەربکەی ؟

**یەڵماز** : ئەوەی دەیکەم ئیسپاتی دەکات کە دەتوانم . من لە بارو دۆخی زۆر لەمە نا لەبارتردا کارم کردووە .

**رۆژنامە نووس** : ئەم چـاو پێکەوتنـەمان لە رێگـەی خەڵکی دی‌یـەوە سـازکـرا و ئـاسـان نـەبـوو ، پـاسەوانـەکانت هـەنگاو بـە هەنگـاو بـە دووتـەوەن و وا لەو دیـوەوە بـە وووریـایی دانیشتوون[9] . ناوەکـەت (یەڵـماز) ە یانی (نەترس) ، ئایا هەست بەوە دەکەن کە لە خەتەردان ؟

**یەڵماز** : بێ گومان دەبێ حسێب بۆ فراندن یا خـود هەوڵێکی کوشتن بکەم . لە خەتەردام بەڵام ترسم نی یە .

**پەراوێزەکان** :

(1) نۆ مانگ لە مەوبەر ئەم گوتارە بڵاوکراوەتەوە ، کەواتە ئێستاکە نزیکەی دوو ساڵە (یەڵماز) تورکیای بەجێ هێشتووە .

(2) ناوی ئەو حیزبە فاشستە رەگەزپەرستە تورکەیە کـە تا ئێستـا لە ناوەوەو دەرەوەی تورکیادا هەزاران تێکۆشەری پێشکەوتووخوازیان تیرۆر کردوە .

(3) دەکاتە نزیکەی هەشت‌صەد هەزار دینار .

(4) مەبەست دوکانەکانی پێڵاو بۆیاخ کردنە کە لە تورکیادا هیجگار زۆرن .

(5) احتجاج

(6) رێکخراوی پارێزکاری بۆ لێ خۆش بوون لە گیراوە سیاسی یەکانی جیهان .

(7) رۆژنامە نووسی ئەڵەمانی (یۆرگن رۆث) لە پێشەکی کتێبی سیناریۆ تەرجەمە کراوەکەی (مێکەل) دا بۆ ئەڵەمانی دەگێڕێتەوە کە (پارێزەری گشتی‌ی) رێگەی ئەوەی نەداوە تاقە یەکێك لە شاهیدەکانی (یەڵماز) بێنە هۆڵی دادگاوە ، دادگا بە هەموو جۆرێك هەڵپەی ئەوەی بووە هەرچۆنێك بێت (یەڵماز) تاوانبار بکەن ، هەموو گوتەیەکی پێچەوانەی ئەم خواستە بە فریودانی دادگا تاوانبارکراوە .

(8) سیناریۆی (مێکەل) کاتی خۆی بە تورکی نوسراوە ، لە نۆڤەمبەری (1980) وە کـراوەتە ئـەڵەمانی و لە بـەرگێکی زۆر جوان و قـەشـەنگ دا بـە وێنـەی رەنگاورەنگەوە لە شاری هامبورگ لە ئەڵەمانیای رۆژئاوا پێنج هەزاردانەی لێ چاپ کراوە . منیش لە مێژە بە کوردی تەرجەمەم کردووە و بێ نازکەوتووە ، جا گەر دەزگایەکی وەکو کۆمەڵی هـونەرو وێـژەی کوردی ، یـا یەکێ لە دەزگـا هونەری‌یەکانی دیکە ، یاخود خاوەنی کتێبخانەیەکی تایبەتی بتوانێت ئەرکی چاپ کردنی لە ئەستۆ بگرێ ئامادەم بیخەمە بەر دەست . (وەرگێڕ)

(9) ئەو کاتەی لە سویسرا بوو پۆلیسی سویسری پاسیان دەکرد .

تێبینی :

1 — ئەگەرچی برای وەرگێڕ کاك کوردۆ لە پێشەکی‌یەکەی خۆیدا نووسیویە کە ئەگەر بە دەستی بوایە هەندێ لە پرسیارو وەرامەکانی پشت‌گوێ دەخست و نەی‌کردوە ، بەڵام ئێمە بە ناچاری ئەوەمان کردو ئەو هەندە پرسیارو وەرامەمان لادا . داوای لێبوردن دەکەین .

2 — ئەوەی شایانی باسە کاك کوردۆ ئەم نووسینەی لە نەمساوە ناردووە ..

• کاروان •

سەرچاوەکان :

1 Der Spiegel Nr : 48 36 . Jahrgang

29 November 1982

S . 196 — 205

2 Die Herde ( Yilmaz Guney )

Buntbuch verlag

Hamburg 1980

3 — هەندێ رۆژنامەی نەمساوی و ئەڵەمانی و ، دیعایەی هەندێ سینەماو یانەکان کە ئەم فلیمەیان پیشان داوە ..

# كاروان
## المسيرة

مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب
باللغتين الكردية والعربية

العدد 15
كانون الاول 1983




في هذا العدد




العنوان أربيل - الأمانة العامة للثقافة والشباب - مجلة (كاروان) - ت 20862

# شموخ العراق شموخ الجبل الاشم

في مقالنا الأفتتاحي السابق والمنشور في العدد 14 من مجلة «كاروان» تناولنا العدوان الأيراني الغاشم على منطقة «بنجوين» بمحافظة السليمانية وفي ذلك المقال سلطنا الأضواء على العدوان وابعاده والأسباب التي حدت بالرجعية الأيرانية وحكام طهران المشبوهين إلى تكثيف هجومهم العدواني المسلح على المدن والقرى والقصبات الكردستانية وسكانها الأبرياء، بعد أن منوا بهزائم منكرة عندما جربوا حظهم العاثر ولمدة ثلاث سنوات تقريباً في الأعتداء على مدننا وقرانا الجنوبية، وفي ذلك المقال ايضاً تنبأنا بالنصر المؤزر على العدو وتشتيت شمله وسحق جحافله الغازية المعتدية في منطقة بنجوين، وكان توقعنا مبنياً على تدقيق وتحر علميين، وفيما بعد جاءت نتيجة المعركة لتظهر صدق ماقلناه وما تنبأنا به وتوقعناه فلقد انجلا غبار المعركة فوق سماء منطقة پێنجوين، وكانت الحصيلة سحق الهجوم ورد كيد العدو إلى نحره، وتحول حدودنا الشرقية في محافظة السليمانية إلى مقابر جماعية للغزاة الطامعين، اذ خرّت صرعى على صخورها عشرات الالوف من افراد القوات المسلحة الايرانية من الذين دفعهم حكام قم وطهران لغزو بلادنا ناهيكم عن الخسائر الجسيمة في العدد والمعدات.

وفي محافظة السليمانية وفوق تراب «پێنجوين» المقدس، امتزجت دماء ابناء شعبنا الكردي بدماء اخوتهم الشجعان من ابطال الفيلق الأول ورجال الحرس الجمهوري الاشداء.

لقد كان لمشاركة رجال الحرس الجمهوري وابطال الفيلق الأول جنباً الى جنب مع أبناء شعبنا الكردي في محافظة السليمانية في الدفاع عن أرض العراق وارض كردستان أثر كبير ومدلولات لا تعد، هذه المدلولات التي عكست قبل كل شئ التلاحم الكفاحي بين الجيش الباسل والشعب الأبي من جهة وبين العرب والأكراد من جهة ثانية وبين القائد وشعبنا الكردي من جهة ثالثة.

وكان لابد ان يكون النصر حليف شعبنا الكردي وابطال الفيلق الأول ورجال الحرس الجمهوري في منطقة السليمانية وپێنجوين، فشعب السليمانية، شعب واع وشجاع وهو لأسباب عدة أدرى من غيره بخطورة العدوان الايراني على العراقيين عامة والاكراد خاصة، فلقد خبر هذا الشعب وعلى مدى عشرات من السنين وحشية حكام ايران الجهلة وغدر قواتهم المسلحة وذلك لقربه من الحدود، وأية ضربة توجه إلى قطرنا من القاطع الشمالي فأن شذاياها تصيب أول ما تصيب شعب السليمانية وجماهيرها، وشعب هذه المنطقة العزيزة من بلادنا وقف بصورة مباشرة على ظلم الفرس وغدرهم وبصورة غير مباشرة ايضاً من خلال تتبعه وعلى مر الزمن للاضطهادات المتلاحقة التي يتعرض لها اكراد ايران والذين يجاورون منطقة السليمانية. ومثل هكذا واقع جعل من الأكراد مناضلين صلبين ضد حكام إيران ولهم سجل حافل بالأمجاد والبطولات في مقارعة ظلم واعتداء الفرس، وهم من القوى الرئيسة المناهضة للنظام الايراني المشبوه داخل ايران بشكل خاص وخارجها بشكل عام.

وكان طبيعياً أن تحل الاحتفالات والاعياد بعد انتصار الجيش والشعب على جحافل العدو الغازي، وعمت الافراح كل مكان في السليمانية وانحائها وسارت مواكب النور والفرح في الشوارع والقصبات وامتدت الافراح ابتهاجاً بالنصر فغطت الطريق الرئيس والممتد بين السليمانية وكركوك وبغداد فلقد رافقت عودة المنتصرين من رجال الحرس الجمهوري الأغاني والتصفيق والهتاف وقبلات الأحبة.

ومن خلال عرض الحقائق عن تفاصيل المعارك التي دارت في منطقة «پێنجوين» وقف العالم والعراقيون باسرهم على البطولة المتفانية لأبناء السليمانية وافراد الجيش، وامتدت الافراح وتواصلت وبلغ سيلها القصر الجمهوري حين التقى القائد بشعبه والتقى الشعب بقائده تحت رايات النصر الخفاقة، وعبر الهتاف والاغاني المنطلقة من حناجر اطفال السليمانية ودبكات فتياتها وكلمات رجالاتها، وقف العالم برمته على متانة الصلة بين الشعب ونظامه وبين الجماهير وقائدها وبين الجيش والشعب.

**هيئة التحرير**

بمناسبة يوم الشهيد

# الشهداء اكرم منّا جميعاً

مما لا يختلف فيه إثنان، ان الأستشهاد والتضحية بالروح سواء من أجل الوطن أو الشعب أو العقيدة قديم قدم التأريخ. والأستشهاد بحق هو ذروة التضحية. ومنذ ظهور الأستغلال والطغيان في المجتمع البشري إلى جانب طغيان الطبيعة وصراع الأنسان الدائم معها، فأن الأستشهاد برز للوجود، ولقد كان الشهداء منذ فجر الخليقة اصحاب حق يناضلون من أجل نصرة الحقيقة والعدالة ومستقبل أفضل للبشرية.

ولقد اضفى الفكر الانساني على مر العصور صفاتاً سامية شتى على الشهداء رفعتهم ولا تزال إلى مصاف القديسين والشهداء من أجل حرية الأنسان وكرامته واستقلال الأوطان وشرف الشعوب كانوا ولا زالوا اكثر عدداً من الشهداء الذين يستشهدون جراء الصراع مع الطبيعة أو انتصاراً من اجل تثبيت حقيقة علمية أو لرغبة ذاتية معينة تهدف إلى نصرة حقيقة ما. فالشهداء من أجل حرية الأوطان وكرامة الشعوب يعدون بالآلاف في الشعوب التواقة إلى الحرية والعدالة والديمقراطية، والأمم التي قدمت طوال تأريخها اكبر عدد من الشهداء غالباً ما تكون أمماً عظيمة حية تستحق الحياة والبقاء، ولها مكانة مرموقة بين سائر الأمم والشعوب. ولا غرابة أن تمجد الشعوب شهداءها وان تحتفظ بذكراهم في القلوب ويمجدهم التأريخ إلى الأبد، فهم خالدون في ضمير الشعوب واحياء في نبضات القلوب وابطال في صفحات التأريخ، وهم اكرم الناس وافضل البشر.

وفي تأريخ العراق القديم والحديث أمثلة لا تعد ولا تحصى على الأستشهاد، فلقد قاوم شعبنا العراقي في الماضي الموغل في القدم غزوات الفرس والمغول والتتار وحكم السلاطين العثمانيين وقدم قرابين لا تعد ولا تحصى، وفي الماضي القريب هب كالأسد الهصور في ثورة العشرين يقاوم المحتل الجديد اي الاستعمار البريطاني كما وأن نضال هذا الشعب ظل مستمراً ومتواصلاً ضد الحكام العملاء للانكليز والذي تجسد في ثورة مايس ووثبة كانون والتضامن مع الشعب المصري الشقيق عام 1956 ضد العدوان الثلاثي. وبعد انهيار الملكية في صبيحة يوم 14 تموز من عام 1958 فأنه لم يكل عن مقاومة الدكتاتوريات العسكرية

القاسمية والعارفية إلى أن تكلل نضاله بالنصر في صبيحة يوم 17 تموز الخالد في عام 1968.

وفي كل هذه الثورات والانتفاضات والوثبات فأن الجماهير العراقية الباسلة قدمت المئات من الشهداء خيرة ابنائها وبناتها من مختلف الفئات والشرائح الأجتماعية.

وبسبب من محاولات السلطات الرجعية في العهود الماضية للحد من انتشار الأفكار الثورية والديمقراطية الوطنية، فأن شرف الأستشهاد غالباً ماكان من نصيب فئة قليلة واعية للغاية يذكرهم تأريخ العراق الحديث بكل فخر واعتزاز. وبعد انتصار ثورة 17 — 30 من تموز المجيدة وانتشار الأفكار الأشتراكية والتقدمية على أوسع نطاق بين الجماهير الشعبية وظهور المناضل صدام حسين كقوة فاعلة ثورية على الصعيدين الداخلي والخارجي، فأن الأستعداد للأستشهاد اتخذ طابعاً جماهيرياً كبيراً وراح يقيم تقييماً أدبياً وقانونياً في آن واحد باعتبار ان التهيؤ للأستشهاد ينمي القيم الروحية ويثريها في الفرد والمجتمع وبالتالي فأن الأنسان يسترخص في النهاية التطلعات المادية الدنيا والصغار مقابل اعتناق المزيد من المثل الرفيعة والسمو بالأخلاق الفاضلة. وهذا الانسان هو إنسان ثورة 17 — 30 من تموز المجيدة، الانسان الجديد المنشود الذي تعمل الثورة ليل نهار من أجل خلقه وبنائه. وحين يبدي الانسان الجديد في مجتمعنا الأستعداد من اجل الاستشهاد ويتوجه دون تردد إلى ساحات القتال لمقاتلة المتربصين بالوطن من صهاينة وخمينيين وغيرهم من اعداء الانسانية والمثل الرفيعة، يكون انساننا العراقي آنذاك انساناً جديداً قولاً وعملاً، الأنسان المؤمن بالمبادئ السامية والمثل الرفيعة، الأنسان الكامل والمتكامل والمتناسق جسداً وروحاً.

إن أحد أسباب تخلف الفرد العراقي والمجتمع العراقي في ظل العهود البائدة يكمن في عدم تشجيع حكام العراق آنذاك المواطنين النضال ضد الاستعمار وركائزه ضد التخلف والأقطاع، وبالتالي في عدم تدريبهم لأبناء وبنات الشعب على الاستشهاد وبذل الروح رخيصة من أجل اعلاء شأن الوطن والشعب. لذا فلقد ظل الوطن محتلاً وظل الانسان العراقي مقيداً بالأغلال ولم يكن شعبنا يومذاك حراً.

وبعد انتصار ثورة 17 — 30 من تموز المجيدة في عام 1968 فأن القائد المناضل صدام حسين والقيادة السياسية راحا يوليان الاستشهاد والشهداء اهمية كبيرة وعناية خاصة اذ كرم الشهداء من شعبنا واعطيت امتيازات مستحقة شتى لاسرهم ، ويقوم السيد رئيس الجمهورية بنفسه على رعايتهم وزيارتهم بين حين وآخر ، وهذه الرعاية وهذا الاهتمام هما جزء من مخطط شامل نحو خلق الانسان الجديد في العراق الأنسان العقائدي والمبدئي ونتيجة لذلك فأن العراقيين وبمرور الأيام توصلوا الى قناعة راسخة بأن الأستعداد الدائم للأستشهاد هو السبيل الوحيد لمنع عودة الحكم الأستعماري والعبودية الى العراق وهما الحسم الذي يراود مخلية حكام قم وطهران المريضة . لهذا فأن شعبنا قام ، عندما شعر بأن الوطن في خطر والمكاسب التي حققتها له الثورة في خطر والاستقلال في خطر والكرامة في خطر ،

قام الى حمل السلاح لمقاومة الغزو الايراني الهمجي في اوائل ايلول من عام 1980 . ومنذ ذلك التأريخ والى يومنا هذا صار الأستشهاد يتخذ طابعاً جماعياً ، واقبالاً على الموت من اجل العزة والكرامة ، ليس له مثيل . وبعد أن كان شرف الاستشهاد ، كما اسلفنا ، من نصيب نفر خير من أبناء شعبنا في ظل العهود السابقة ، فأن هذا الشرف اخترق ذلك الحاجز وصار من نصيب جماهير غفيرة من ابناء هذا الشعب ، واصبح كل عراقي في النهاية وبحق مشروعاً للأستشهاد ومثل هذا الواقع اربك الاستعماريين والصهاينة وعملائهما وأدخل الرعب في قلوبهم .

وبلغ الأهتمام ذروته بالشهيد والأستشهاد عندما كرست حكومتنا الوطنية اليوم الأول من شهر كانون الأول من كل عام يوماً للشهيد في عموم القطر ، وفي هذا اليوم الخالد الذي تذكره الأجيال بكل فخر واعتزاز ويسجلهالتأريخ بمداد من ذهب كبر الشهيد لدى الجامع والكنيسة في أن واحد ببلادنا . وجرى الأحتفال بهذا اليوم على المستويين الرسمي والشعبي في البلاد وهنا ايضاً تجلى اهتمام السيد الرئيس القائد بالشهيد والاستشهاد وكان في طليعة الأهتمامات ، حيث استقبل عوائل الشهداء وكرم افراد أسرهم ، ولا ريب ان هكذا موقف من سيادته سيجعل اندفاع العراقيين إلى الاستشهاد اكثر اتساعاً

وجـراة وسيسمو بـالقيم الروحية ويعجـل من صنع الانسـان الجديد العراقي الجديد ، عراقي الاستشهاد والبسالة والاخلاق الثورية والمبادئ السامية .

وفي غمرة الاحتفال بيوم الشهيد وتجمع الجماهير العراقية في الساحات والشوارع في اليوم الأول من كانون الأول للاحتفال بيوم اكرم النـاس واعظمهم ، فـأن شعبنا الكـردي في الجبال والسهـول في المدن والقـرى والقصبات ينـظر بعـين التقـديـر والاعجاب والاحترام الى بطولة شهدائه الميامـين الأبرار وكـل الشهداء العراقيين الذين دافعوا ببَسالة ونكران ذات وضحوا بأرواحهم من أجل عز العراق واستقلاله ومن اجل تمتع شعبنا الكردي بحقوقه القومية المشروعة بما فيها الحكم الذاتي .

ويشهد تأريخ العراق السياسي الحديث ابتداءً من ثورة العشـرين ومروراً بمختلف الثـورات والانتفـاضـات الوطنيـة والقـومية بمسـاهمة الشعب الكـردي بقسط كبـير في النضال المعادي للأستعمار والرجعية وفي تقديمه الشهداء تلو الشهداء على مذبح الحرية والدفاع عن الوطن واستقلال البلاد . فدفاعاً عن استقلال العراق وحـرية شعبـه سقط العـديد من شبـاب السليمانية صرعى برصـاص عملاء الاستعمـار أمام سـراي السليمانية في العهد الملكي المباد . ومن أجل رفع راية العراق

خفاقة استشهد الكثيرون في ثورة الشيخ محمود الحفيد ويذكر التأريخ بفخر واعتزاز أسماء الشهداء الضباط الأكراد الأربعة والآف آخرين غيرهم . وعندما فرضت الرجعية الايرانية الحرب على بلادنا قبل اكثر من ثلاثة أعوام فأن شعبنا الكردي شارك ولايزال بقسط هام في معركة «قادسيـة صدام» المجيـدة حيث ضحت مدنه وقصباته ولا تـزال بالشهـداء من ابنائهـا البررة الميامين . وقد قيم السيد رئيس الجمهورية عالياً اكثر من مرة البطولة الشجاعة النادرة وروح التضحية لدى المقاتلين الأكراد في خنادق المواجهـة مع العـدو الخميني المجرم . والآن هنـاك عشرات الألوف يقاتلون من اجل الوطن والشعب . وعندما نقلت الرجعية الايرانية في الشهور الاخيـرة بالحـرب الى كردستـان للانتقام من سكانها ، وهاجم بـدرجة رئيسـة منطقتي «حـاج عمران» و «بنجوين» فأن الأكراد ومن خلال توجههم بالآلاف إلى ساحـات القتـال وتـظاهـراتهم وارسـال الوفـود الى القصر الجمهـوري ، أبـدوا استعـداداً لا محـدوداً للذود عن الوطن ومقاومة العدوان الأيراني الغاشم .

إن تـأريخ العـراق الحديث يشهـد وبانصـاف على دور الشعب الكردي في كافة المعارك المصيرية لشعبنا العراقي ، فهذا الشعب الأبي لم يتخلف في اي يوم من الأيام عن تلبية نداء الوطن وواجب الدفاع عنه والمـوت من أجله ، وكان سبـاقاً دومـاً الى الاستشهاد . وما قاله الرئيس القائد عن بطولة المقاتلين الأكراد أوسمة في صدور ابناء شعبنا الكردي . وفي القادسية الثانية ، قادسية العرب والأكراد ، استشهد العديد من الأكراد سواء من افراد الجيش أو الجيش الشعبي أو القوات الخاصة ، ولازال ابناء شعبنا الكـردي يقاومـون الغزو الايـراني ببسالة نـادرة ويقدمون الشهداء تلو الشهداء من ضبـاط وجنود ومتـطوعين وشعـارهم الدفاع عن الوطن العـراقي حتى النصر التام عـلى المعتدي اللئيم .

ان هيئة تحرير مجلة «كاروان» اذ تقف اجـلالاً واكباراً امام أرواح شهداء «قـادسية صـدام» وكل الحـركة الوطنيـة التحررية لشعبنا في يوم الشهيد ، فأنها تتقدم في الوقت ذاتـه بأحر التحيات النضالية الى عوائل الشهداء وتعاهدها بأن تكون عند حسن ظنها في اداء الرسالة التي استشهد من اجل تحقيقها ابناؤها الميامين .

وفي الختام :

الف الف تحية إلى ارواح شهداء قادسية صدام المجيدة وكل شهداء الحركة الوطنية والقومية لشعبنا .

الف الف تحية إلى ارواح الشهداء الأكراد الذين سقطوا صرعى برصاص العدو الايراني الجبان في قواطع «حاج عمران» و «بنجوين» وغيرها من القواطع في الوسط والجنوب من قطرنا العزيز .

الف الف تحيـة إلى مقاتلينـا الابطال في خنـادق المجـد والبطولة ، الساهرين على أمن وسلامة حـدودنا النصر المـؤزر لشعبنا والأندحار لأعدائه .

**هيئة التحرير**

عبد الغني علي يحيىٰ

من التراث الشعبي الكردي

# نازلي خان

### ١– الدرويش

في قديم الزمان وسالف العصر والأوان، كانت هنالك مملكة صغيرة، تقع بعيداً وراء الجبال والوديان الخضراء في كردستان، وكان يحكمها ملك طيب وعادل، بنىٰ له قصراً فوق قمة جبل عالٍ، وحوله في السفوح والوديان، عاش الناس حياةً بسيطة سعيدة. كان للملك العادل هذا ابنة جميلة تتمتع بجمال ساحر أخاذ تدعىٰ «نازلي خان» تسكن مع والدها الملك في القصر يحيط بهما في الخارج عدد من الحراس. وكانت أم «نازلي خان» قد توفيت، وهي صغيرة فعاشت مع والدها الملك حياتها بين جدران القصر، وقد سعىٰ والدها مراراً، لأيجاد صديقة لأبنته ونديما له ايضاً. وفي ذات يوم من الأيام دق باب القصر درويش متسول، لاح من زيه، انه مقبل من مكان بعيد خارج حدود المملكة. ففتح الحراس له الباب، ولما رآه الملك وتجاذب الحديث معه، أخذ يميل إليه والى احاديثه ورواياته الشيقة، فأقترح عليه ان يسكن معهما في القصر، ويكف عن حياة الترحال والتجول والأستجداء، بل وينعم بالأستقرار والعيش الرغيد. كانت زوجة الملك قد توفيت كما اسلفنا، ووفاءً لها اعتزم الملك ان لا يتزوج من بعدها، وكانت زوجة الدرويش قد وافتها المنية ايضاً، لكن الدرويش كان علىٰ النقيض من الملك ينتظر السانحة ليتزوج.

### 2– الحج.

وهكذا صار الدرويش مع الملك، يرافقه أينما ذهب، واصبح كظل الملك لا يفارقه، وحين اقبل موسم الحج الىٰ «مكة المكرمة» اقترح الملك علىٰ الدرويش، أن يحجا سوياً. فلبىٰ الدرويش دعوة الملك بفرح، وبعد أيام من اعتزامهما اداء فريضة الحج، تهيأت قافلة الحجاج وانضم اليها خلق كثيرون من الرجال الصالحين والنسوة الصالحات. وفي بكور أحد الأيام انطلقت القافلة يتقدمها الملك ومن ورائه الدرويش، وما ان سارت قليلاً وعبرت حدود المملكة واذا بالدرويش يتوقف عن السير ويسقط فوق الأرض. فتوقفت القافلة وترجل الملك عن صهوة جواد كان يمتطيه وهرع إلىٰ الدرويش ليستجلي الأمر، ورأىٰ الدرويش وقد وضع كلتا يديه علىٰ بطنه وتظاهر بالمرض وبتفاقم آلام حادة في بطنه، الام تحيل بينه وبين مواصلة السفر إلىٰ الديار المقدسة ولما كانت للدرويش مكانته ومنزلته لدىٰ الملك، فأن الأخر لبىٰ طلبه واعاده إلىٰ القصر في المملكة ناصحاً إياه، بلزوم الحذر والركون إلىٰ الراحة وتجنب كل ما يسيّ الى صحته. بعد ذلك قفل الملك راجعاً واستأنف رحلته إلىٰ الحج.

### 3– الخيانة

لم يكن الدرويش مريضاً، ولم تكن هنالك اية آلام في بطنه أو أي عضو من اعضاء جسمه، كما ادعى، ولم يكن اختلاق للمرض ووجود آلام في بطنه، إلا لكي يعود إلىٰ القصر ومن ثم السعي للأنفراد بابنة الملك والايقاع بها بأي ثمن كان. وهكذا انطلت الحيلة علىٰ الملك الذي أحسن الىٰ الدرويش فأكرمه واطعمه. ولما وصل الدرويش إلىٰ القصر، استمر يومين علىٰ تظاهره بالمرض ومعاناته لآلام موهومة في بطنه. وكانت ابنة الملك تسهر بنفسها وعن قرب علىٰ الدرويش. ولما تظاهر الدرويش بعد أيام بالامتثال

.و الشفاء شرع يخطو خطواته الأولى للظفر بابنة الملك، فأمرها .ص كل شئ ان تنقل سريرها الى اقرب غرفة إليه مدعياً بأن والدها ـك أمر بذلك عندما اعاده إلى القصر، وانه جعل منه مقيماً .وصياً عليها لحين عودته من الحج، لكن «نازلي خان» أبت لرضوخ لارادة الدرويش، واكتفت بالقول، بأنها مرتاحة في مكانها، لا يقلقها شئ ولا تخاف من شئ. وحنق الدرويش في سره عن هذا الموقف الصلب من «نازلي خان» تجاهه، وزاده الحنق صراراً على تنفيذ مهمته الجهنمية، وراح يدبر مكائد اخرى .تنيل منها، وجرب مختلف الوسائل لاقناعها، طوراً يهددها وطوراً يعمل برفق ولين لاستمالتها، وخلال محاولاته هذه، فأنه كشف لابنة الملك عن رغباته الحقيقية، وذهب أبعد من ذلك عندما طلب منها الزواج، ولما ادركت ابنة الملك، بأن الدرويش مصمم على تنفيذ ارادته ومهما كان الثمن. شرعت بدورها تفكر بخطة توقف الدرويش عند حده نهائياً. وفي احدى الليالي وتحت ضغط وتهديد من الدرويش تظاهرت «نازلي خان» باستعدادها لتلبية رغبة الدرويش وتسليم نفسها إليه، فسر لذلك الدرويش، وظن انه بلغ المرام في نهاية المطاف، قالت نازلي خان : ـ

ـ ان سريري في الغرفة ضيق، وكذلك سريرك.. ها.. عندي فكرة، لقد تذكرت، هنالك فوق السطح سرير واسع يسع شخصين، هلم لنجئ به...

## ٤ ـ طرد الدرويش من القصر

ومضت «نازلي خان» ومن ورائها الدرويش ليلاً، إلى سطح القصر، وكان الدرويش مسروراً يكاد يطير من الفرح، [..الخطوة الأولى.. نازلي خان ] لقد كانت للدرويش مطامع أخرى كثيرة ليست لها حدود وعلى رأسها ازاحة الملك في النهاية. ولما بلغا السطح، ذهبا باتجاه سرير واسع يسع شخصين، رجلاً وامرأة، كان السرير الذي ضم في الماضي البعيد الملك والملكة أم «نازلي خان» ! أراد الدرويش ان يظهر بقايا قوة فيه، فاندفع إلى السرير ليرفعه بمفرده، بيد ان «نازلي خان» اعترضت لأن من شأن ذلك ان يفشل خطتها في معاقبة الدرويش،

قالت :

ـ لن ادعك ترفعه بمفردك، سنرفعه سوياً، تمسك بطرف وامسك أنا بالطرف الآخر، ثم ننزله..

كان أحد طرفي السرير عند حافة السطح، فاقترحت «نازلي خان» على الدرويش ان يمسك بذلك الطرف عند الحافة، وذهب الدرويش ليمسك بالسرير من طرف الحافة ولما بلغ، ورفع طرف السرير، راحت «نازلي خان» تدفع بكل ما لديها من قوة السرير باتجاه الحافة، وبسرعة سقط الدرويش الى خارج القصر، فوق الارض، وأحس بآلام شديدة في انحاء جسده. وظل ساعات طريح الأرض يئن عند اسفل جدار القصر وينوح من شدة اوجاعه. أما «نازلي خان»، فأنها ما أن قذفت بالدرويش إلى الخارج، حتى هرعت إلى الاسفل، وسدت أبواب ونوافذ القصر كلها خشية من ان يتسلسل الدرويش بعد نهوضه، إليها.

في الصباح خفت آلام الدرويش، ورويداً رويداً، استطاع ان يقف على قدميه، بل والسير خطوات ولكن ببطء فكان اول ما فعله هو ان طرق باب القصر الرئيسي على «نازلي خان» لكن طرقاته ذهبت سدى، ولم تكن ذات جدوى توسلاته وبكاؤه بل وممارسته لأفانين الحيل في اقناع «نازلي خان» كي تفتح له الباب. وهكذا فشل، ولم ينفعه القسم ولا النواح والبكاء والتوسل، فلقد طبقت «نازلي خان» بحقه المثل الكردي القائل «الموت هو توبة الذئب» !

## ٥ ـ عودة الحجاج

وهكذا طرد الدرويش من القصر شر طردة، فولى وجهه شطر مساجد المدينة ودروبها يتعيش عند المحسن الفلاني، وينام في المسجد الفلاني، وفي اكثر الاوقات كان يصر بأسنانه. ويفكر بالانتقام من «نازلي خان» وانتظر على أحر من الجمر عودة الملك من الحج. واخيراً عاد الملك وعاد بقية الحجاج إلى المملكة، وهرع الناس لاستقبالهم والتبرك بمقدمهم ولما التقى الجمع كان المستقبلون يشدون بحرارة على اكف الحجاج ثم يقبلونها، وكان الحجاج يقبلونهم من جبينهم ورؤوسهم ويوزعون الهدايا التي جلبوها معهم من الديار المقدسة فكانوا يعطون «السبحة» للرجال واقمشة تستعمل غطاءً للراس الى النسوة وغيرها من الهدايا. وكان الملك، قد جاء بهدية ثمينة للدرويش هي من اغلى الهدايا التي جلبها معه، فلقد كان يفكر طوال السفر بالدرويش وبمرضه، وفي مكة، صلى من اجل الدرويش وابتهل إلى الله تعالى أن

يصونه من كل مكروه، وان يبقيه ويمد من حياته ويشفيه من المرض.

## 6 – المؤامرة

وعلىٰ بعد فراسخ من المدينة كان الدرويش علىٰ رأس جمهرة من المستقبلين ولما التقىٰ بالملك اندفع نحوه باكياً، يذرف الدموع بسخاء، وقد ارتدىٰ ملابس رثة ويمشي حافي القدمين، فلما رآه الملك على تلك الحالة، تأثر عميق التأثر وراح يرثي لحاله، واغتم كثيراً. ولما قال للدرويش :

– لماذا انت في هكذا حالة رثة ؟.

واخذ الدرويش آنذاك يطلق العنان لأكاذيبه وأراجيفه المقيته ومما قاله للملك: بأنه حال سفره لأداء فريضة الحج واذا بابنته تطرده من القصر، اثر كشف لعلاقاتها الغرامية مع العديد من الشبان الذين كانوا يترددون عليها في الليالي، يشربون الخمر، ويقضون معها لياليهم، على حد زعمه. ومما قاله ايضاً، بأنه لم يبخل بتوجيه النصائح والارشادات إليها، لكنها بدلاً من أن تنصاع إلىٰ نصائحه وارشاداته، فأنها اتبعت ما زين الشيطان لها، وانغمست في الفسق والفجور، وفي احدىٰ الليالي، القته بمساعدة اصدقاء السوء من على سطح القصر الى الأرض وهو نائم، ولولا العناية الألهية لكان الآن في اعداد الأموات، وقال ايضاً، بانه آثر مغادرة المملكة والعودة الى حياة الترحال والتسول الهادئة البريئة لولا خوفه علىٰ الملك من دسائس ابنته الشريرة وعشاقها الفاسدين. وانه بعد أن اوضح لملك ما رآه بأم عينيه وما سمعه بأذنيه على حد زعمه اعتزم ان يودع الملك ويذهب في شأنه يجوب أرض الله الواسعة. غير ان الملك وقد تأثر بما حل بالدرويش واصابت كلمات الاخير اعماق نفسه قرر ساعتئذ ان ينفذ حكم الموت دون ابطاء أو تردد أو محاكمة في «نازلي خان». ليس هذا فحسب، بل انه أمر افراد حاشيته بأن يلقوا «بنازلي خان» الى خارج القصر قبل ان تقع عليها عيناه ثم نادىٰ علىٰ واحد من اتباعه المخلصين وهو شيخ طاعن في السن، بأن يغتال «نازلي خان» في مكان ناء ويأتي بثوبها بعد أن يلطخها بدم القتيلة، ليتأكد تماماً من موتها.

## 7 – ماذا جرىٰ لـ «نازلي خان» ؟

سبق الملك إلىٰ القصر عدد من افراد حاشيته ومعهم الشيخ الطاعن في السن، فهجموا جميعاً إلا الشيخ المسن، على «نازلي خان» التي ذهلت وكادت ان تفقد صوابها، وهم يجرونها من شعرها بعنف إلىٰ خارج القصر وسط السباب واللعنات، وهناك شدوها إلىٰ فرس وتوجه بها الشيخ المسن إلىٰ العراء، بعيداً عن اعين الناس، وحين صارا بمنأىٰ عن البشر، وكانت «نازلي خان» مذهولة لعنف المعاملة التي جوبهت بها كما ذكرنا، شرح لها الرجل العجوز الحكاية من اولها إلىٰ آخرها وجاء دور «نازلي خان» فروت بدورها حكايتها مع الدرويش من اولها إلىٰ آخرها أيضاً ولما كان الشيخ المسن رجلاً كبيراً طاعناً في السن، وذو خبرة وتجربة في الحياة، ويعرف حق المعرفة بترفع «نازلي خان» عن الاتيان بالأفعال البذيئة المنافية للشرف والكرامة وذلك نتيجة لطول مكوثه في القصر ومعرفة الدقيقة وعن كثب لـ «نازلي خان» فأنه صدق روايتها في اعماقه وكذب اختلاقات الدرويش، لكنه لم يكن سوىٰ فرداً في حاشية الملك، لا حول له ولا قوة. وقد وضع نفسه دوماً تحت أمرته، غير أنه عزف عن قتل «نازلي خان» واكتفىٰ بأن يأخذ ثوباً من ثيابها، ولطخه بدم ارنب قتله في تلك الأنحاء، ثم عاد أدراجه الى الملك في القصر حاملاً معه الثوب المدىٰ، بعد أن اشترط على الفتاة بأن تبتعد عن المملكة وتذهب الى ممالك بعيدة أخرىٰ.

## 8 – الأمير جمشيد

وهكذا ودع الشيخ المسن الفتاة الحسناء «نازلي خان» وحيدة في العراء مثقلة بالهموم والأحزان، تبكي وتذرف الدموع، هائمه، لا تلوي علىٰ شئ إلىٰ أن بلغت عين ماء. وكانت تعبة مكدودة، فتهالكت علىٰ الأرض، وارتوت

